کۆماری
وەزارەتی راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی

# دیوانی نالی
# و
# فەرهەنگی نالی

لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوە

نووسینی
دوکتۆر مارف خەزنەدار
یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە کۆلیجی ئەدەبیات
زانکۆی بەغدا

بەغدا

کۆماری عێراق
وەزارەتی ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکرنەوەی کوردی

# دیوانی نالی
# و
# فەرهەنگی نالی

## لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوە

نووسینی
**دوکتۆر مارف خەزنەدار**
یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە کۆلێجی ئەدەبیات
زانستگای بەغدا

بەغـدا ١٩٧٧

دار الحرية للطباعة

« دەسکردی هونەروەری کورد قەرەنی جەمیل ، بەتایبەتی بـۆ ئەم چاپەی دیوانی ( نالی ) کێشراوە » .

# نـــالی

## ۱۸۰۰ – ۱۸۵٦

* خدری کوڕی ئەحمەد شاوەیسی ئالی بەگی مکایێلی شارەزووری‌یە .

* لە گوندی خاکو خۆڵ ، لە ناوچەی شارەزووری وولاتی سلێمانی لە دایك بووە .

* لە قەرەداخو سلێمانی خوێندوویەتی ، لە گەڵی جێگەی تری کوردستانیش‌دا ژیانی خوێندنی بردۆتە سەر .

* لە پێش ڕووخاندنی میرنشینی سلێمانی وولاتی بە جێ هێشتووەو چووە بۆ حەج .

* لە مەڵبەندی ئاوارەیی لە ئەستەموول کۆچی دوایی کردووە .

* پێوەندی لەگەڵ مەستوورەی کوردستانی‌دا بووە .

* هۆش‌و بیرو خەیاڵو ژیری‌و بلیمەتی‌و حەکیمی‌ی خۆی بۆ زمانی کوردی تەرخان کردووە ، بەرزترین شیعری ئەو سەردەمەی هێناوەتە ناو زمانی کوردی‌یەوە .

# مێژووی
# بڵاوکردنەوەی شیعری نالی


مێژووی بڵاوکردنەوەی شیعری نالی .

نالیو شیعری لە لای خۆمانو لە ڕۆژهەڵاتدا .

نالیو شیعری لە ڕۆژئاوادا .

دیوانی دەسنووسو بەیازو دەفتەری شیعری کۆنو دیوانی چاپکراوی نالی بنجی ئەم چاپەن .

ئەو شیعرانەی هی نالی نین .

شیعرێکی تورکی بە ناوی نالیەوە تۆمار کراوە .

بەرنامە بۆ تێگەیشتنی نالی .

فەرهەنگی دیوانی نالی .

دووا ووشە .

بلاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبیو لێکۆڵینەوە لە ژیانو شیعری نالی نەگەیشتۆتە پلەی شاعیریەتیو ڕادەی بەرزیو حەکیمیو ژیریو بلیمەتیەتیو ئەو ناوبانگەی کە لە کوردەواریدا دەری کردووە . لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بێتو لەم لایەنەوە لەگەڵ شاعیرانی تردا بەراووردی بکەین دەبینین لە ڕیزی پێشەوە دەوەستێ .

هێشتا شاعیر لە ژیاندا بووە کە ناوو ناوبانگی گەیشتۆتە ئەوروپا ، بە ئینگلیزیو ڕووسی باس لە خۆیو شیعری کراوە ، بە فەرەنسیو ئەڵمانی ناوی هاتووە ، ڕۆژنامەو کۆواری کوردی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تا ئێستا شیعریان بلاوکردۆتەوە ، بە عەرەبی باس لە شاعیرو بەرهەمی کراوە ، تا پێش ئەم چاپە چووار جاری تریش دیوانی لە چاپ دراوە .

## مێژووی بلاوکردنەوەی شیعری نالی

ئەوەی ئێمە لەم بابەتەوە دەیزانین ئەوەیە کە لە پێش چاپکردنی دیوانی بۆ یەکەمین جار کۆواری « ڕۆژی کورد » لە سالی ١٩١٣دا « دە » پارچە غەزەلی نالی لە ژێر ناوی « دیوان شاعر شهیر حضرت نالی »(١) بلاوکردەوە بە بێ ئەوەی هیچ جۆرە لێکۆڵینەوەیێکی تێدا بکرێ ، یا ووشە قورسەکانی لێك بدرێنەوە ، یا مانا داخراوەکانی شی بکرێنەوە ، جگە لەوەش ئەوەندە هەڵەی چاپی تێدایە یەکێکی یەکجار شارەزای ژیانی ناوەوەی شیعرەکانی نالی نەبێ هەر تێی ناگا .

میر ئالای موتەقاعید ئەمین فەیزی لە سالی ١٩٢٠دا چەند پارچە شیعرێکی نالی بە ئیملای کۆن بلاو کردەوە(٢) ، ئەم بلاو کردنەوەیە بۆ سەردەمی خۆی نرخێکی تایبەتیی بووە ، لەگەڵ ئەوەی شیعرەکان لە بلاو کردنەوەدا شێواوونو هەڵەیێکی زۆری چاپیشیان تێکەوتووە .

لە سالی ١٩٣١دا بۆ یەکەمین جار دیوانی نالی لە لایەن ( کوردیو

---

(١) کۆواری « روژ کرد » ، استمول ، ١٩١٣ ، ژمارە ( ١ ) ، ل٢٩ــ٣١ .

(٢) امین فیضی ، انجمن أدیبان کورد ، استەمول ، ١٩٢٠ ، ل١٧ ، ١٨ ، ٢٠ ، ٣٢ــ٣٦ ، ٤٨ــ٥٠ ، ٥٣ ، ٥٤ ، ٦٥ــ٦٩ ، ٨٩ــ٩٦ ، ١١٣ــ١١٨ ، ١٢٢ .

مەریوانی )یەوە بلاو کرایـەوە(٣) ، ئنجا لە سالی ١٩٤٨دا عـەلی‌ی موقبیلی سەنەندەجی بـۆ جاری دووەم لە چـاپی دایەوە(٤) ، لە پاشـاندا چاپخانەی کوردستان لە سالی ١٩٦٢ بۆ جاری سێیەم چاپی کردەوە(٥) ، ئنجا لەدووای ماوەیێك و لە سالی ١٩٧٤ جارێکی تر چاپەکەی سالی ١٩٦٢ی دووبارە کردەوە وەکو خۆی(٦) ؛ لە پاش ماوەیێك دەسگای « کتێب فرۆشی سەییدیان » لە مەهابادی کوردستانی ئێران بە رێگەی ئۆفسێت چاپی هەولێری دیوانی نالی لە چاپ دایەوە بە بێ ئەوەی مێژووی لە چاپ دانەوەی دیاری بکا .

لەم ماوەیەدا وەسفێکی کورتی هەموو چاپەکانی دیوانی نالی دەکەین :

( ١ ) ــ چاپی بەغدا بریتی‌یە لە (٦٩) لاپەڕە کە بۆ غەزەل وقەسیدەکان تەرخان کراوە، جگە لە دوو لاپەڕە بۆ بەسەرهاتی نالی‌یە ، بلاو کەرەوەکان ، کوردی‌و مەریوانی ، لە هەندێ لایەنی ژیانی نالی دوواوون بە بێ دەست نیشان کردنی سەرچاوە لە چاپ کراو یا دەسنووس یا دەمی شارەزایانی ئەو ڕۆژگارە . بەلام دیارە بـلاو کەرەوەکان ئەم زانیـاری‌یانەیان لە ئـەدەب دۆست‌و نالی پەروەرانی ئەو کاتە وەرگرتووە ، وە ئـەوەی پێویستە لەم لایەنەوە بووترێ ئەوەیە کە بلاو کەرەوەکانی ئەم چاپـە دەسکاری‌ی شیعرەکانیان نەکردووە ، تەنیا ئەوە نەبێ ئەداتی فرمانی ئێستا « دە = دەکەم »یان کردووە بە « ئە = ئەکەم » ، وە ئەوەی لـەم لایەنەشەوە پێویستە بزانرێ ئەوەیـە کە لە هەموو دەسنووسەکاندا ئەم ئەداتە هەر بەشێوەی « دە » نووسراوە نەوەکو « ئە » .

ئەوەی نرخی ئـەم بلاوکەرەوەی نزم کردووە ئەوەیە کە هەلـەی چاپی یەکجار زۆری تێدایـە ، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەگەر خوێنـەری دیوانەکە شارەزایی‌یێکی تەواوی لە شیعری کلاسیکی‌ی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست‌و ئیسلامی نەبێ لە مەبەستی شاعیر ناگا .

( ٢ ) ــ چاپی سـنە ، بریتی‌یە لە (٧٣) لاپەڕە ، لەمـەدا دوو لاپەڕە بۆ بەسەرهاتی نالی دانراوە ، بەلام بە فارسی نووسراوە ، بلاو کەرەوەی دیوان

---

(٣) دیوانی نالی ، ( کوردی‌و مەریوانی ) ، ژمارە ( ١ ) بغداد ، ١٩٣١ .

(٤) دیوان نالی شاعر شهیر کرد ، ناشر آقای علی مقبل سنندجی ، چاپخانه بهرامی ، ١٣٢٧ [ ١٩٤٨ ] .

(٥) دیوانی نالی یادگاری مەلا خضری شارەزووری‌یە ، چاپخانەی کوردستان ، هەولێر ، ١٩٦٢ .

(٦) دیوانی نـالی ، یادگاری مـەلا خضری شـارەزووری‌یە ، چاپخـانەی کوردستان ، هەولێر ، ١٩٧٤ .

زانیاری‌ی تـازەی لە بابـەت نالی‌یەوە نەخسـتۆتە ڕوو ، بەڵکو هـەر ئەو بەسەرهاتەیە کە لە چاپی یەکەم‌دا بە کوردی نووسراوەو کراوە بە فارسی . ئەم بڵاوکـراوەیە لە چاکترین چاپـەکانی دیوانی نالی‌یە لـە ڕووی ئەوەوە کە دەسکاری نەکـراوەو هەڵـەی چاپیشی کەمـەو هەندێ لە ووشـە قورسـە کوردی‌یەکان ، یا ئەو ووشە کوردی پەتی‌یانەی کە لە زمانە ئێرانی‌یەکانی تردا نین بە فارسی لێك دراوەتەوەو لە پەراوێزی لاپەڕەکان‌دا تۆمار کراوون . ئەگەر تاکو تەراش هەڵە لە گۆڕینی ووشـەکان‌دا ببینرێ ئەمە لە نرخی کارەکە زۆر کەم ناکاتەوە .

کەمو کووڕی ئەم چاپە ، بەتایبەتی بۆ نەوەی خوێندەواری تازەی کورد لەوەدایە کە پێڕەوی ئیملای کوردی‌ی نەکردبووە ، بەڵکو بە ئیملایێکی فارسی ئامێز نووسـراوە . هەروەها چەنـد پارچە شیعرێکی بێگانـەش ، واتە هی شاعیرانی تر کەوتۆتە ناو چاپەکەوە ، لە جێگەیێکی تری ئەم پێشـەکی‌یەدا ئەو شیعرە نزم‌و بێ‌کەڵـکانەی کە لەگەڵ پلەی شاعیری‌یەتی نالی ڕێـك ناکەوون دەست نیشان کراوون ، ئەم شیعرانە لە چاو نالی نزم‌و بێ‌کەڵکن وە گەر نە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی قوتابی‌یان‌و قوتابخانەی ئەدەبی نالی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەم‌دا دەست دەدەن .

( ٣ ) ــ چاپی هەولێر ، بریتی‌یە لـە (٩٦) لاپەڕە لەگەڵ پێشـەکی‌یێك ، ئەگەر بڵاو کەرەوە وەکو ئەوانەی پێش خـۆی تەنیا بە زانیاری‌یەکانی چاپی یەکەمی بەغدا بوەستایە گارێکی خراپ نەدەبوو ، بەڵام ئەو هاتووە بە بێ بەڵگە هەر لە خۆیەوە بیروڕای سەیری خستۆتە ڕوو کە بە هیچ جۆرێ لەگەڵ مەقامی شیعری نالی ناگونجێ ، وە ئەم ڕایانەی لە جیهانی ئەدەب‌و هونەردا جێگەیان نابێتەوە ، لە قسەی سەر پێ‌پی بازاڕی دەکەن جێ‌یان لە مەملەکەتی تۆمار کردن‌دا نی‌یە ، جـگە لەمە بڵاوکەرەوە لە هەندێ شوێن بە ئـارەزووی خۆی دەسکاری شیعرەکانیشی کردووە وەکو هەموو ئەو دیوان‌و شیعرە کلاسیکی‌یانەی کە تا ئێستاکە بە چاپی گەیاندوون ، ئەوەنـدەش دەبێ بۆ ڕاستی بووترێ کە دەسکاری کردنی لە دیوانی نالی لە ئەوانیتر کەمترە .

لە بەر ئەوەیە هەر لێکۆڵینەوەیێك لە بابەت نالی‌و شیعرەکانی‌یەوە دەبێ لە ڕووی هەموو چاپەکانی دیوانی‌یەوە بێ ، ئەگەر هەمووشیان لە ژێر دەست‌دا نەبن تەنیا نابێ بـاوەڕ بە چاپی هەولێر بکرێ ، دیارە لێرەدا ئەگـەر بڵێین ئەم چاپەی دیوانی نالی هەموو گیرو گرفت‌و تەنگو چەڵەمەیێکمان بۆ لە ناو دەبا لە ڕاستی دوور ناکەوینەوە .

ئەو چاپانەی لـە ناوەوەن هیچ یەکێکیان چاپی زانستی نی‌یـە ، چونکە تێ‌یان‌دا نی‌یە بڵاوکەرەوەکەی هەوڵی ئەوەی دابێ دیوانەکە لەسەر بنچینەی

چەند دەست نووسێك چاپ بکا ، وە ووشە قورسەکانو ڕستە سەختەکانی لێك بداتەوە ، دیـوانی نالی بەو شێوانەی کە چاپ کراوە ســوودێکی ئەوتۆ ناگەیێنێتە خوێندەوارێکی ناوەنجی .

لە پاش جەنگی جیهانیی یەکەمو دابەش کردنی کوردستان جارێکی تر تا سەردەمی ئێســتامان بە دەگمەن ڕێك کەوتووە ڕۆژنامە یــا گۆوار بووبێو شیعری نالی بلاو نەکردبێتەوە ، بەتایبەتی ئەو چاپەمەنییانەی لە کوردستانی خووارووودا بلاو دەکرانەوە بە شێوەی کرمانجیی خووارووی زمانی کوردی .

لەم ماوەیەدا دەبێ ئەوەش لەبیر نــەکەین کە هەموو ئەو شیعرانەی بە ناوی نالییەوە تۆمار کراوونو لە چاپەکانی دیوانی خۆیو ڕۆژنامەو گۆوارەکاندا چاپ کراوون وەنەبێ هەموویان هی ئەو بن ، دیارە ئێرە جێگەی ئەوە نییە بە لێکۆلینەوەو بەلگە پیشاندان ئەو شیعرانە دەست نیشـان بکرێن چونکە ئەمە زۆر دەکێشێ ، تەنیا ئەوەندە هەیە لە پاش لێکۆلینەوەیێکی قوولو هەولدانێکی دوورو درێژ هەموو ئەو شیعرانەمان لەو دیوانە دوور خستەوە کە بە باوەڕی ئێمە هیچ پێوەندییێکیان بەسەر نالییەوە نییە . تەنیا لێرەدا دەبێ هەلەیێکی بلاوکەرەوەی ئەم دیوانە ڕاست بکرێتەوە ، پێش ئەوەی ببێتە هۆی برس لە لایەن خوێندەوارانەوە .

لە ســالی ١٩٧١دا مارف خەزنــەدار لە ووتاری « سێ غــەزەلی بلاو نەکراوەی نالیو سالم »[٧] غەزەلێکی پێنج دێــڕی نالی بۆ یەکەمین جار بلاو کردەوە ، ئەو بۆچوونەی ئەو کاتە هەلە بوو ، ئێستا ئەو غەزەلە پێنج دێڕییە بە شیعری نالی نازانێ ، لە بەر ئەوەیە جێگەی لەم دیوانەدا نەبووەوە .

لە ڕووی بلاوکردنەوەی بەرهەمی شیعرەوە ، وەکو دەردەکەوێ نالی لە شاعیرانی تر بەختیار تر بووە ، دەبێ هۆی ئەمە ئەوە بووبێ کە شاعیرێکی بە دەسەلاتو گەورەو بە ناو بووە ، شاعیران پێڕەوی شیعری ئەویان کردووە چونکە شیعرەکانی نیشانەو ڕەمزی شیعری هەرە بەرزی سەردەمی خۆی بووە ، بۆیە بووە بــە مامۆستای شیعر . بێجگە لە نالی ئێمە کەسی ترمــان بەرچاو نەکەوتووە لە ناو شاعیرانی کورددا « حەزرەت = حضرت »یان پێ ووتبێ ، ئەمە بووە بە هۆی ئەوەی ئەم هەموو چاپەی دیوانی نالی بکەوێتە ناو نامەخانەی نەتەوەی کوردەوە .

---

(٧) مارف خەزنەدار ، سێ غەزەلی بلاونــەکراوەی نالیو سالم ، گۆواری « نووسەری کــورد » ، ژمارە ( ١ ) ، سال ( ١ ) ، بەغــدا ، ١٩٧١ ، ل٣٥ــ٣٧ .

## نالیو شیعری لە لای خۆمانو لە ڕۆژهەڵاتدا

ئەوەی ئێمە دەیزانین ئەوەیە کە لە ساڵی ١٩٢٠ ئەمین فەیزی لە بابەت نالی‌یەوە نووسیویەتی : « نالی خەڵقی دێیێکە لە شارەزوور کە واقیع بووە لە تەرەف شەرقی سلێمانی ، ئیسمی خاکوخۆڵە . مەرحووم تەحسیلی لە قەرەداغو لە سلێمانی‌دا ئیکمال کردووە ، قەرەداغ شەش سعات دوورە لە سلێمانی‌یەوە . نالی بۆ ئیفای حەج چووەتە حیجاز . لەوێ دەرحەق حەزرەتی فەخری رەسوول قەسیدەیێکی موکەممەلو موتەووەلی نەزم کردووە . چووەتە ئەستەموولّ لە ئەسنای سوحبەتدا لەگەڵ ئودەباو فوزەلای ئەوێ گەلێ ئاساری فیکرو فەتانەتی نواندوە ، وە زۆر مەزهەری تەوەججوه بووە ، تا نیهایەتی عومری لە ئەستەموولّدا ماوەتەوە ، مەدفەنی موبارەکی ئەوەتە لە ئەسکودار . زەکای نالی ئینکار ناکرێ ، لاکین ئەوەندەی سەنایعی لەفزی‌یە ئیستیعمال کردووە ڕەنگە بڵێی شیعری ئەو نەتیجەی عیلمو ئیشتیغالە »(٨) .

لە ساڵی ١٩٢٥دا گۆواری « دیاریی کوردستان » هەندێ زانیاری تری خستۆتە ڕوو لە بابەت نالی‌یەوە ، دیارە سوودیشی لە بیرو ڕاکانی ئەمین فەیزی وەرگرتووە ، پاش ئەوەی ئەو زانیاری‌یانە دووبارە دەکاتەوە دەڵێ : « .. شیعری نالی زۆر خۆشو ئابدارە ، گەلێ سەنعەتکارانەیە ، لە شامەوە قەسیدەیێکی (٣٣)(٩) بەیتی ناردووە بۆ سلێمانی ، سالم بە (٢٩)(١٠) بەیت جوابی داوەتەوە ، ئەم دوو قەسیدەیە ئەحواڵو وەزعی‌یەتی ئەو زەمانە دەنوێنن ، گەلێ بە قیمەتن »(١١) .

گرنگترینو کۆنترین سەرچاوە لە بارەی ژیانی نالی‌یەوە پێشەکی‌ی چاپی یەکەمی دیوانەکەیەتی(١٢) ، بڵاوکەرەوەکانی تری نالی هەموو زانیاری‌یەکانیان لەو وەرگرتووەو شتێکی تازەی ئەوتۆی بەڵگەداریان نەهێناوەتە ناوەوە .

لە ساڵی ١٩٣١ پیرەمێردی شاعیر بە هۆی دەرچوونی چاپی یەکەمی دیوانی نالی‌یەوە ووتارێکی لە ڕۆژنامەی « ژیان »دا بڵاوکردەوە بە ناوی

---

(٨) امین فیضی ، انجمن ادیبان کورد ، استمول ، ١٩٢٠ ، ل٥ ، ٦ .

(٩) ئەم قەسیدەیە لەم دیوانەدا (٤٣) دێڕە شیعرە .

(١٠) وەڵامەکەی سالم (٣٦) دێڕە شیعرە .

(١١) گۆواری « دیاری کوردستان » ، ژمارە ( ٤ ) ، ساڵ ( ١ ) ، بەغدا ، ١٩٢٥ ، ل٩ .

(١٢) دیوانی نالی ، بەغدا ، ١٩٣١ ، ل ( ج ، د ) .

« خدمتێكی بێ هەمتا بە موناسەبەتی تەبعی دیوانی نالی‌یەوە »(١٢) . ووتارەكە زیاتر سۆزێكی ڕۆمانتیكی‌یە خراوەتە قالبی وەسعێكی خەیاڵاوی لە بابەت دەرچوونی نالی لە سلێمانی‌یەوە بۆ وولاتی ئاوارە ، ئنجا شیعرەكانی هەڵدەسەنگێنێ‌و بە شاعیری گەورەی لە قەلەم دەدا . لەو كاتەی كە سوپاسی كوردی‌و مەریوانی دەكا بۆ لە چاپ دانی دیوانی نالی ، دەبوو كەموكووڕی‌ی چاپەكەش دەست نیشان بكا ، هیچ نەبێ لە ڕووی هەڵەی چاپی‌ی زۆرەوە ، ئەوەی گەیشتۆتە ڕادەیێك ئەگەر خوێنەر شارەزایی لە جیهانی نالی‌دا نەبێ كەڵكی لێ وەرناگرێ .

محەمەد ئەمین زەكی لە چاپی كوردی « خلاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان » كە لە ساڵی ١٩٣١ لە بەغدا دەرچووە ، نەوەكو تەنیا ناوی نالی نەبردووە بەڵكو باسی ئەدەبی كوردی‌و ناوی ئەو (٢٨) شاعیرو نووسەرە كوردەشی نەبردووە كە لە چاپی عەرەبی كتێبەكەدا باسیان لێوە كراوە ، كەچی محەمەد عەلی عەونی لە كتێبی « خلاصة تاریخ الكرد وكردستان » كە تەرجەمەی كتێبەكەی محەمەد ئەمین زەكی‌یەو لە ساڵی ١٩٣٦ تەرجەمەی تەواو كردووەو لە ساڵی ١٩٣٩ لە قاهیرە چاپی كردووە ، لە خۆیەوە فەسڵێكی تازەی خستۆتە ناو كتێبەكەو باس لە ژیانی نالی دەكا(١٤) .

لە ساڵی ١٩٣٩ محەمەد ئەمین زەكی لە كتێبی « مێژووی سلێمانی‌و وولاتی »دا هەندێ زانیاری لە بابەت نالی‌یەوە بە دەستەوە دەدا(١٥) .

لە ساڵی ١٩٤١ هەرەكۆڵ ئازیزان ( جەلادەت بەدرخان ) لە نالی دوواوە ، بەلاَم وەكو دەردەكەوێ هەموو زانیاری‌یەكانی دووبارە كردنەوەی ئەوانەن كە

---

(١٣) ڕۆژنامەی « ژیان » ، ژمارە (٢٩٣)ی ١٤ی ئەیلوولی ١٩٣١ ( ئەم ووتارە لە لایەن محەمەدی مەلاكەریمەوە بە ناوی «پیرەمێرد نالی هەڵدەسەنگێنێ» دووبارە بلاَوكراوەتەوە ) . « بڕوانە : كۆواری ( بەیان ) ، ژمارە (٣٥) ، بەغدا ، نیسانی ١٩٧٦ ، ل١ـ٣ » .

(١٤) محمد امین زكی ، خلاصة تاریخ الكرد وكردستان ، ط١ ، القاهرة ١٩٣٩ ، ص٣٥٨ ، ٣٥٩ ؛ ط٢ ، بغداد ، ١٩٦١ ، ص٣٤٠ـ٣٤١ ( ترجمة من الكردیة الی العربیة محمد علی عونی ) .

(١٥) محمد امین زكی ، تاریخ سلێمانی‌و وولاتی ، بەغدا ، ١٩٣٩ ، ل٢٤٥ ، ٢٤٦ (.ئەم كتێبە لە لایەن مەلا جەمیلی بەندی ڕۆژبەیانی‌یەوە تەرجەمەی عەرەبی كراوەو لە ساڵی ١٩٥١ لە بەغدا چاپ كراوە ) .

لە پێشەکی‌ی چاپی یەکەمی بەغدای دیوانی نالی هاتووە ، هەرەکۆل ئازیزان ناوی ئەو چاپە دەبا بەبێ ئەوەی هەڵی بسەنگێنێ(١٦) .

لە ساڵی ١٩٥١ لە پەخشانێکدا کە مەرسی‌یە بووە بە هۆی مردنی حاجی تۆفیقی پیرەمێردەوە عەبدوڵڵا گۆران نووسی‌بوویەوە لە بابەت نالی‌یەوە دەڵێ : « قەڵەمێك بە دەست پیری یەکەمی شێوەی سلێمانی نالی‌یەوە بوو ، شیعری کلاسیکی بێ ئەنووسی بە پێچەوانەی ئەو هەستی پەسەندو حورمەتەوە بەرامبەر بە نالی لە دڵتا بوو دەستت بۆ قەڵەمی ئەو نەبرد ، چونکە ئەو وەستایێکی بەهرەدار بوو ، بەڵام لەسەر تانوپۆی ئەدەبو عەرووزی بێگانە نەخشی ئەچنی ، تەنیا چینی بەرزی خوێندەواری سەردەمی دەرەبەگی ئەیتووانی تێ‌ی بگا . . . »(١٧) .

عەلائەددین سەجادی لە ساڵی ١٩٥٢ ، لە مێژووی ئەدەبی کوردی لە چواردە لاپەڕەدا لە نالی دەدوێ(١٨) . ئەو زانیاری‌یانەی لە چاپی یەکەمی دیوانەکەی بڵاوکراوون بوون بە سەرچاوە بۆی ، وە ئەگەر شتێکی تازەی نووسیبێ ئەو زانیاری‌یە گشتی‌یانەن کە دەتووانرێ بۆ هەموو شاعیرێکی کلاسیکی بووترێ ، جگە لەوەش دەست بۆ هیچ سەرچاوەیێك درێژ ناکا . سەجادی هەندێ پارچە شیعری جوانی بە بەڵگەو نموونە هێناوە ، دەبێ ئەوەش بزانین کە نالی شیعری ناشیرینی نی‌یە ، بەڵام بەبێ ئەوەی باس لە شیعری نالی بکا لە ڕووی ڕوخسارو ناوەرۆکەوە ، لەگەڵ ئەوەش‌دا ئەم کارە وەکو هەوڵێکی سەرەتایی بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی بێ کەڵك نی‌یە ، بەڵام دەبێ هوشیارانەو ژیرانە سوودی لێ وەربگیرێ بەوەی باوەڕ بە هەموو گەورەو بچووکێکی بیروڕاکانی نەکرێ وەکو چۆن سەجادی خۆی باوەڕی بە هەموو شتێکی نووسراو یا باس‌کراو یا بیستراو کردووە بەبێ ئەوەی زانایانەو وشیارانە لێ‌یان وورد ببێتەوە بۆیە « چونکە حەجی نالی لەگەڵ سوڵتان عەبدولعەزیزی سایەی خودا لەسەر ڕووی زەوی‌و خەلیفەی

(١٦) هەرەکۆل ئازیزان ، کلاسیکێن مە ـ ئان شاعیرو ئەدیبێن مەیێن کەڤن ( ل٦ـ١٤) ، کۆواری « هاوار = Hawar » ، ژمارە (٣٣) ، ساڵ ( ٩ ) ، ئوکتۆبەری ١٩٤١ ، ل١٢ .

(١٧) گۆران ، « ووتاری مامۆستا گۆران » ، بڵاوکراوەی « یادی پیرەمێرد » ، بەغدا ، ١٩٥١ ، ل ٧٥ . ( ئەم تێبینی‌یانەی گۆران وەکو شتێکی بەجێ‌و پەسند خۆیان دەنوێنن ، بەلای ئێمەوە وێنەیێکی زیاتر هونەری‌یە بۆ بەراوورد کردن لە نێوان نالی‌و پیرەمێردو هەڵسەنگاندنی شیعری نالی لەوەی زانستی بێ ، لەبەر ئەوەیە ئێمە بیروڕای ترمان هەیە لەم بابەتەوە لە لێکۆڵینەوەی تایبەتیمان‌دا لە بارەی نالی‌یەوە دەری‌دەبڕین ) .

موسو ڵمانو ئیمپراتۆری عالەم !! » ئـەوەی سەجادی بۆمانی دەگێڕێتەوە لە ئەفسانەی دێـوی ڕەشو سپیو کلاوی سەخری جینی بـەر گۆی ئاگردانی کوردەواری نەبێ لە هیچی تر ناکا نازانم ئەم کوردە کەڵاش خوارەی کە پاشاکەی دیلی دەستی تـورکە عوسمانی‌یەکان بوو چۆن گەیشتە ناو کـەژاوەی چوونە حەجی سایەی خودا لەسەر ڕووی زەوی ؟!! .

هەروەها لە کتێبی « ئەدەبی کوردیو لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی‌دا » سەجادی غەزەلێکی نالی شی دەکاتەوە لە ڕووی ڕەخنەی زانستی‌یەوە ، لێرەدا ڕێچکەی بەلاغـەی عەرەبی بۆ ئەم مەبەسە وەرگرتووە(١٩) ، ئەمـەش وەنەبێ کارێکی زۆر بەجێ بێ بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی .

لەوانەیە سـەجادی لە تۆمارکـردنو شی کردنـەوەی دوو قەسـیدە بەناوبانگەکەی نالیو سالم تا پلەیێك سەرکەوتوو بێ(٢٠) ، بەتایبەتی لە ڕووی کردنەوەی جێگەو شوێنەکانی کە پێوەندی‌یان بە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەوە هەیە کە ئەم دوو نامە شیعری‌یەیان تێدا نووسراوەتەوە . بەڵام وا چاوەڕووان دەکرا کە لە شی‌کردنەوەی ئەو تەعبیرو زاراوانەی کە پێوەندیان بە مەلایەتی‌یەوە هەیە سەرکەوتوو تر بێ .

لە ساڵی ١٩٥٦ خاوەنی ئەم پێشەکی‌یە دوو غەزەلی نالی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیو بە کورتی باسی لە ژیـانی نالی کردووە(٢١) ، بەڵام لەبەر ئەوەی لەکاتی خـۆی‌دا ساڵی لەدایك بوونو مردنی نالی لە مێـژووی ئەدەبی کوردی وەرگرتبوو ، هەندێ هەڵە کەوتبووە باسەکەیەوە .

لە سـاڵی ١٩٦٦ د. عیزەدین مسـتەفا ڕەسووڵ لە ڕوویێـکی ترەوە تەماشای نالی دەکا ، کاتێ قەسیدەکەی نالی دەبینێ ، ئەوەی لە وڵاتی شامەوە بۆ سلێمانی‌ی ناردبـوو بۆ سالمی شاعیرو ئەویش بە قەسـیدەیێکی تر وەڵامی دابووەوە ، دێتە سەر ئەو باوەڕە کە نالی وڵاتی سلێمانی‌ی لە کاتێك‌دا بەجێ هێشت ئەو ناوچەیە سەربەخۆ بوو ، بەڵام کە لە حەج گەڕایەوە بۆ شام بیری لەو نیشتمانە سەربەستە کردەوە کە چـۆن داگیرکراوەو لە بەدبەختی‌و ئازار

---

(١٨) علاءالدين سـجادي ، مێژووی ئـەدەبی کوردی ، بەغـدا ، ١٩٥٢ ، ل٢١٤ــ٢٢٧ ؛ چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل.٢٤٠ــ٢٥٥ .

(١٩) علاءالدين سجادي ، ئەدەبی کـوردیو لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٦٨ ، ل٢٦٨ــ٢٧٤ .

(٢٠) علاءالدين سجادي ، دوو چامەکەی نالی‌و سالم ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

(٢١) معروف خزنەدار ، اغاني کردستان ، بغداد ، ١٩٥٦ ، ص٥٢ ، ٥٣ .

زیاتر شـــتی تری تێدا نی‌یه ، سالم ئـــەو ڕاستی‌یەی بۆ ئاشـــکرا دەکاو نالی ناگەڕێتەوە(٢٢) .

کۆمەڵێك بـــیروڕای بەجێ لە ووتـــاری « هەندێ یـــادگاری ئەدەبی » بلاوکراوەتەوە ، ئەم بۆچوونانە هی کەریم بەگی حەمە بەگن‌و د. ئیحسان فوئاد بە زمانی ئەوەوە دەیانگێڕێتەوە ، ئەم ڕایانە هەندێ سەرنجی شارەزایانەیان تێدایە لە بابەت بەشێ لە شیعرەکانی نالی‌یەوە(٢٣) .

لە ووتارێکی (١٩٥) لاپەڕەیی‌دا بە ناوی « چەپکێك لە گوڵزاری نالی »(٢٤) مەسعوود محـــەمەد کۆمەڵێك دێـــڕە شیعری لـــەملاو ئەولای دیـــوانی نالی هەڵبژاردووەو ڕوونیـــان دەکاتەوە . لەگەڵ هەموو قـــووڵی‌و ووردەکاری‌و وەستایەتی نالی نەوەکو تەنیا لەم شیعرانەدا بەڵکو لە سەرانسەری دیوانەکەی ، هێشتا بە لای ئێمەوە (١٩٥) لاپەڕە گەلێك زۆرە بۆ لێکدانەوەی کەمتر لە (٦٠) دێڕە شیعر . دانەر دەیتووانی جێی هەندێ لە تێبینی‌یە بەجێ‌یەکانی لە لاپەڕەی کەمتردا بکاتەوە ، بەلام دیارە زۆربەی قسەکانی لە دوورو نزیکەوەو بە هیچ

---

(٢٢) عزالدين مصطفى رسول ، الواقعية فى الادب الكردى، بيروت، [١٩٦٦]، ص٧٨ ، ٧٩ .

(٢٣) ئیحسان فوئاد ، هەندێ یادگاری ئەدەبی ، « دەفتەری کوردەواری » ، ژمارە ( ٢ ) ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل١١٧–١٢٣ .

(٢٤) مەسعوود محـــەمەد ، چەپکێك لە گوڵزاری نالی ، گـــۆواری « کۆڕی زانیاری کـــورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، بەغـــدا ، ١٩٧٤ ، ل١١–٧٠ ؛ بەرگی سێ‌یەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل١١–٧٩ ؛ بەرگی سێ‌یەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل٨–٧٢ . « لە پاشانا نووسەر بۆ جاری دووەم ئەو (١٩٥) لاپەڕەی لە کتێبێکدا بلاوکردەوە ، پاش ئەوەی پێشەکی‌یێکی (٦٨) لاپەڕەیی‌و بەشێکی تری (٨٧) لاپەڕەیی خستە سەر . لە پێشەکی‌یەکەدا خۆی بە کوردناسی سەدەی نۆزدەم ( خۆدزکۆ )وە هەڵواسیوە ، وەکو کەسی تر ناوی نالی نەهێنابێ‌و شیعری بلاو نەکردبێتەوەو لەسەری نەنووسیبێ ، دەبێ لەبەر ئەوە نەبێ کە ناوێکی زل‌و بێگانەیە ؟! خۆ ئەگەر ئەمە بێ دیارە نووسەر بە هەڵە چووە چونکە بێگانەی لە خۆدزکۆش بەهێز تری وەکو مینۆرسکی‌و سۆن باسی نالی‌یان کردووە ! هەرچی فەسڵە تازەکەشە جوینەوەی ئەو زانیاری‌یانەیە کە نووسەری ئـــەم کتێبە لەو دووایی‌یەدا بلاوی کردۆتـــەوە » ( بڕوانە : گۆواری ڕۆژی کوردستان ، بەغدا ، ژمارە (٣٢)و (٣٣) ، ١٩٧٥ ، ژمارە (٣٤)و (٣٥)و (٣٦) ، ١٩٧٦ ؛ وە گـــۆواری ڕۆشنبیری نوێ ، بەغدا ، ژمارە (٤٥) ، ١٩٧٥ ) .

جۆرێ هەر پێوەندی‌یان بە نالی‌یەوە نی‌یە ، هەرچی ئوسلووبیشە ، مەبەس ئوسلووبی خاوەن ووتارە ، بە لای ئێمەوە شیعری نالی چەند قورسە لە پێش تێ‌گەیشتن دەبێ ئەوەندە ئاسان بێ بە ڕوون کردنەوە ، کەچی لە زۆر جێگەدا شێوەی نووسینی خاوەن ووتار وای کردووە کە لێکۆڵینەوەو ڕوون کردنەوەکانی پێویستی‌یان بە لێکۆڵینەوەو ڕوون کردنـەوە بێ . ئەوەی ئێمە دەیزانین لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی‌دا بەتایبەتی شیعر ئەوەیە کە داخراو بکرێتەوەو قورس ئاسان بکرێ . ئەمەو پرسیارێکی تریش سـەرهەڵدێنێ ئەویش ئەوەیە ئایا ڕستەی « چەپکێك لە گوڵزاری نالی » کـە ڕستەیێکی هونەری‌و ئەدەبی‌یە ، لەوانەیە ڕۆمانتیکیش بێ بۆ لێکۆڵینەوەیێکی زانستی دەست دەدا ؟ ئێمە زۆر باش دەزانین کە لە جیهانی ئەدەبدا « زانستی‌و لێکۆڵینەوە » شتێکەو « هونەرو داهێنان » شتێکی ترە .

هەرە تازەترین زانیاری لە بابەت نالی‌و شیعرەکانی‌یەوە بە زمانی کوردی ئەو زنجیرە ووتارو بڵاوکردنەوانەیە کە لـە کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ و سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ لە کۆوارە کوردی‌یەکان‌دا لە لایەن نووسەری ئەم کتێبەوە بەم ناوانە بڵاوکراونەتەوە : « چەند دانەگەوهەرێکی تری نالی‌و کەیفی »و (٢٥) « لە جێگەر گۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خەراپ »(٢٦) « لە دەفتەری نەمری‌دا لەگەڵ نالی »(٢٧) « چەند پەراوێزێکی دیوانی نالی »و(٢٨) « نالی‌و حاجی‌و کەیفی چەوساوەو قوربانی‌ی بیری ڕۆشن‌و چاکەی چینی دەرەبەگ بوون »(٢٩) .

---

(٢٥) کۆواری « ڕۆژی کوردستان » ، بەغـدا ، ژمارە (٣٢) تشرینی یەکەم ، ١٩٧٥ ، ل٣٥ـ٣٦ .

(٢٦) کۆواری « ڕۆژی کوردستان » ، بەغدا ، ژمارە (٣٣) تشرینی دووەم ، ١٩٧٥ ، ل٥٨ـ٦١ .

(٢٧) کۆواری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەغدا ، ژمارە (٤٥) تشرینی دووەم ، ١٩٧٥ ، ل٦ـ٧ .

(٢٨) کۆواری « ڕۆژی کوردستان » ، بەغدا ، ژمارە (٣٤) کانوونی یەکەم ، ١٩٧٥ ، کانوونی دووەم ، ١٩٧٦ ، ل٤١ـ٤٤ .

(٢٩) کۆواری « ڕۆژی کوردستان » ، بەغدا ، ژمارە (٣٥) ، شوبات ١٩٧٦ ، ل٤٥ـ٥٥ ( بەشی یەکەم ) ؛ ژمارە (٣٦) مارت ١٩٧٦ ، ل٤١ـ٤٤ ( بەشی دووەم ) .

## ناڵی‌و شیعری لە ڕۆژئاوادا

ئەدەبی کوردی بە گشتی ، وە ئەدەبی تازەو ئەدەبی کوردستانی خوارووبەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتناسی ئەورووپادا جێگەیێکی دیاری نی‌یە . لە لایەن ناڵی‌و شاعیرەکانی دەورو بەری ئەوەوە وێنەیێکی تایبەتی دەبینین ، لەوانەیە ناڵی لەم لایەنەشەوە بەختەوەرترین کەس بێ ، بەوەی هیچ نەبێ بە تیپی لاتینی لە پێش هەموویاندا ناوی نووسراوە .

ناڵی هێشتا لە ژیاندا بووە کە ناوی گەیشتۆتە ئەورووپا ، کە دەڵێین ناومەبەسمان لەوەدا ئەوەیە کە تەنیا باسی ئەوەیان کردووە کە شاعیرێك لە کوردستاندا بووە ، ناوی ناڵی بووە .

ڕۆژهەڵاتناس‌و کونسوڵی ڕووس لە پاریس خۆدزکۆ لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمدا لە ساڵی ۱۸۵۳ چاوی بە ئەحمەد خان ناوێك کەوتووە ، خەڵکی سلێمانی بووەو لە ئەستەموولەوە چووە بۆ ئەورووپا ، خۆدزکۆ هەواڵی شاعیریەتی ناڵی لەو ئەحمەد خانە بیستووەو گۆیا دۆستیشی بووە(۳۰) .

لە پاش زیاتر لە نیو سەدە ، کوردناسی ئینگلیز ئی. بی. سۆن لە ساڵی ۱۹۱۳دا ناڵی بە شاعیری بەناوبانگی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم لە قەڵەم دەداو لە باسی کێش‌و قافیەی شیعری کلاسیکی کوردی هەندێ بەڵگە لە شیعری ناڵی دێنێتەوە(۳۱) ، دێڕە شیعرەکان ئەمانەن :

۱ ـ بۆ هەرکەسێ مەبزوولە تەریقێکی ئەمانەت
هەر عاشقی بێ چارە لە ڕێی خەوف‌و خەتەرما

دیدەم هەموو شۆڕاوە بە شۆڕاوی سریشکم
لەم لەوحە نیگارینە نە عەین‌و نە ئەسەر ما(۳۲)

۲ ـ ئەگەر دڵ غەیری حوببی تۆی تیابێ
بە دەستی خۆت دڵم دەربێنە قوربان

لە بۆ خەڵقی خەڵات بەخشانی ماچە
خەڵاتی من هەموو خۆ جوێنە قوربان

(30) A. Chodskó, Études philologiques sur la langue kurde (dialecte de Suléimanié), Jornal Asiatique, 1857, 5sér, t. IX, pp. 297-356.

(31) E.B. Soan, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913, p. 168.

(۳۲) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٦٨ .

**فوتـــــووری چـــــاوەکانت نانـــــوێنێ**
**بە ( نـالی ) فیتنـــە بـەس بنوێنـــە قوربان(٣٣)**

٣ ـ شەش دێڕ لە غەزەلی :

**کە تـۆ هاتی لـە نەومێـدی نەمـا باس**
**لە هیجـرو ئینتیزار ئیـدی نەما باس(٣٤)**

ئنجا هەر لەو سەردەمەدا مینۆرسکی لە بابەت نالی‌یەوە دەڵێ : « بەڵام ئەوەی پێوەندی بـە سـەردەمی تازەوە هەبێ ئەوەیە کە مەڵبـەندی شاعیرانی کورد گۆزرایـەوە شاری سلێمانی ئـەوەی کە نالی تێیدا ژیـاوەو گەلێکیش بەناوبانگ بووە(٣٥) .

لە پاش ئەمە مینۆرسکی تەرجەمەی ڕووسی سێ دێڕە شیعری کوردی بڵاو دەکاتەوە بەبێ تێکستە کوردی‌یەکانی ، دوو دێڕە شیعر بە تەنیا :

**زولفت‌ڕەـە قـەدتدا کـە پەرێشـانو بـڵاوە**
**ئەمـڕۆ لـە مـنی شـیفتە ئاڵـۆزو بـە داوە**

**بۆچی نەگـریم سـەد کـەرەتم دڵ دەشـکێنی**
**مەی بۆ نەڕژێ شووشە لە سەد جێوە شکاوە(٣٦)**

ئینجا دێڕەکەی تریش بە جودا :

**هەرچەنـدە کـە ڕووتم بە خـودا مایلی ڕووتم**
**بێ بەرگی‌یە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە(٣٧)**

---

(٣٣) سەرچاوەی پێشوو ، ل١٦٩ .

(٣٤) سەرچاوەی پێشوو .

(٣٥) ڤ . ف . مینۆرسکی ، کورد . تێبینی ، پیترۆگراد ، ١٩١٥ ، ل ١٧ . « بە زمانی ڕووسی »
( ئەم کتێبە لە ڕووسی‌یەوە لە لایەن مارف خەزنەدارەوە تەرجەمەی عەرەبی کراوەو لە ساڵی ١٩٦٨ لە بەغدا بڵاوکراوە ، بروانە ، ل٤٠ــ٤١ ).

(٣٦) سەرچاوەی پێشوو .

(٣٧) سەرچاوەی پێشوو .

له پەراوێزی ئەو لاپەڕەیەدا دەڵێ : ئەم دوو پارچە شیعرەم لە زمانی کوردێکی سابلاغی وەرگــرت ، وابزانـــم دانەریان نالی‌یـــە . بێ‌گومـــان ئێمە دەتووانین وەڵامی مینۆرسکی بدەینەوە کـە ئەم شیعرانە هی نالین ، وە هەر سێ دێرەکە لە غەزەلێکن ، دێری یەکەم‌و دووەم سەرەتای غەزەلەکەیە ، بەڵام دێری سێ‌یەم ئەوەی بە تەنیایە دێری چووارەمی غەزەلەکەیە ، غەزەلەکە هەمووی نۆ دێرە .

لە ساڵی ١٩٥٥دا تۆما بووا بە زمانی فەرەنسی لە ووتارێکی‌دا ناوی نالی دەباو دەڵێ گۆیا لە ساڵی ١٩٣١ دیوانەکەی لە بەغدا لە چاپ دراوە(٣٨) . بەڵام ڤاسیلی نیکیتین هوشیارانە لە ساڵی ١٩٥٦دا لە بابەت نالی‌یەوە دەڵێ : « بە بەهرە ترین شاعیرانی کوردی سەردەمی تازە ، لە ڕیزی پێشەوە دەبێ ناوی شاعیرانی سەدەی نۆزدەم ببەین ، نالی ، کوردی ، سالم‌و حاجی قادری خەڵکی کۆیە »(٣٩) .

ئنجا لە ساڵی ١٩٦٣دا جۆیس بلوو لە نالی دەدوێ‌و دەڵێ : نالی دەرگای تازەی لە ڕووی ئەدەبی کوردی کردەوە(٤٠) . ئەمە ڕاستە ، بەڵام هەر دووا بە دووای ئەم ڕستەیە دەڵێ : شاعیرانی ئەو سەردەمە هەوڵیان داوە لە ڕوخساری شیعری کۆن لابدەن‌و لە ڕوخساری شێوەی میللی نزیك ببنەوە . شیعر لە پێناوی خەباتی نەتەوەی کورد دادەنرێ ئـەو خەباتەی لە دژی زوڵم‌و زۆری عوسمانی دەکرێ .

لامان وایە ئـەم تێبینی‌یە سەرپێ‌یی‌و نازانستی‌یانە بۆ نـالی‌و شاعیرانی سەردەمی نالی دەست نادەن ، بەڵکو ئەمە دەتووانرێ بۆ ئەو « شیعری تازە »یە بووترێ کە نووری شـێخ ساڵح‌و ڕەشید نەجیب‌و عەبدوڵلا گـۆران‌و هی تر دەستیان پێ‌کرد ، ئەوانەی نەوەی سێ‌یەمی قوتابخانەی نالی بوون .

لە مارتی ١٩٦٦دا نووسەری ئەم کتێبە لە « دەورەی زانستی‌ی ساڵانەی دووەمی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی‌ی ئەکادیمیەی زانستی‌ی سۆڤیەت » باسێکی بە ناوی « دامەزرێنەرانی شیعری تازەی کوردی لە کوردستانی خووارووا » بە زمانی ڕووسی پێشـکەش کرد ، لە ووتارەکەدا نالی وەکـو دامەزرێنەری

---

(38) Th. O. P. Bois, Coup d'Œil sur la littérature Kurde. — "Al-Machriq", [Beyrouth], 1955, mars-avril, p. 210.

(39) B. Nikitine, Les Kurdes, Etude Sociologique, Paris, 1956.
بڕوانە چاپی ڕووسی ئەم کتێبە ( مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ، ل ٣٩٠ )

(40) J. Blau, Le problém Kurdé, Essai sociologique et historique Bruxelles, 1963, p. 16-17.

بنچینەیی ئەم بزووتنەوەیە پیشان دەدا ، نوێشکی ووتارەکە لە کتێبی دەورەکەدا بە زمانی ڕووسی بلاوکرایەوە(٤١) .

ئەوەی پێویستە لەم ڕووەوە بووترێ ئەوەیە کە بەشێك لە ناوەرۆکی ئەم ووتارە لە سالی ١٩٧١ بە زمانی عەرەبی بلاو کراوەتەوە(٤٢) .

هەروەها نووسەری ئەم پێشەکییە لە کتێبی « لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی تازە »دا هەندێ زانیاری بە زمانی ڕووسی لە بابەت نالییەوە دەدا بە دەستەوە(٤٣) . لێرەدا نەوەکو تەنیا لە هەندێ لایەنی ژیانی نالی دەدوێ ، بەلکو باس لە ڕەنگدانەوەی ژیانی کومەلایەتیش دەکا لە شیعری نالی ، وە هەندێ نموونەی شیعریشی گوڕیوەتە سەر زمانی ڕووسی .

ئەمە بە کورتی پیشاندانی ئەو هەولو تەقەلایانە بوو کە لە ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوادا درابوون بۆ ناسینی نالی ، دیارە ئەمە ئەوەیە کە ئێمە ئاگامان لێی هەیە . ئەمە تیشکێکی « چرای دزان »ە لە چراخانی ژیانو بەرهەمی نالیی بێ پایانو سنوور .

---

(٤١) مارف خەزنەدار ، دامەزرێنەرانی شیعری کوردی تازە لە کوردستانی خواروو ، « سامانی نووسراو و هەندێ مەسەلەی مێژووی خوێندەواریی نەتەوەکانی ڕۆژهەلات » ، نویشکی ووتارەکانی کونفرانسی دووەمی سالانەی ئاموزگای ڕۆژهەلاتناسیی ئەکادیمیەی زانستیی سوڤیەت ، لینینگراد ، ١٩٦٦ ، ل ٥٠ ــ ٥١ . « بە زمانی ڕووسی »

(٤٢) معروف خزنەدار ، مؤسس الادب الكردي الحديث في كردستان الجنوبية نالي ١٨٠٠ــ١٨٥٦ ، مجلة « شمس كردستان ــ ڕۆژی کوردستان » العدد ٥ و ٦ ، ايلول ــ تشرين الاول ١٩٧١ ، بغداد ، ص١٣ــ١٧ .

(٤٣) مارف خەزنەدار ، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی تازە ، موسکو ، ١٩٦٧ ، ل ٣٦ ــ ٣٧ . « بە زمانی ڕووسی » .

## دیوانی دەسنووس‌و بەیاز‌و دەفتەری شیعری کۆن‌و دیوانی چاپ کراوی نالی بنچی ئەم چاپەن

شیعری نالی‌و شاعیرانی کلاسیکی‌ی کۆن لە دەسنووس‌و دەفتەر‌و بەیازدا پارێزرابوون ، وە بە هەموو ناوچەکانی کوردستانی خوارووددا بلاو بووبوونەوە ، ئەم دەسنووسانە لە حوجرەو مەدرەسەو دیوەخان‌و مالی خوێندەوار‌و دەولەمەندانی کورددا دەست دەکەوتن . شیعری نالی لەسەر زاری مەلاو فەقێیانا بوو ، خوێندەوارانی ئەو ڕۆژگارە ، لە دووا سالانی سەدەی نۆزدەم بەملاوە ڕۆشنبیر‌و خوێندەوارانی کوردی تازە بابەتیش بایەخی بە شیعری نالی‌و شاعیرانی تر دەدا . وا بوو کە چاپ‌و چاپخانە کەوتە کوردستان ، یا ڕاستتر خوێندەوار‌و ڕۆشنبیری کورد فێری چاپ‌و چاپکاری بوون لە ڕیزی پێشەوە بایەخیان بە بەرهەمی نالی دا .

بۆ ئامادە کردنی ئەم چاپەی دیوانی نالی هەموو ئەو سەرچاوەو کەرەستانەی لای خوارەوە بە ووردی‌و قوولی لێیان کۆلراوەتەوەو ساغ کراونەتەوە ئنجا هوشیارانە وەرگیراوون‌و لەم چاپەدا خۆیان نواندووە :

١ ــ دیوانی نالی چاپی بەغدا .

٢ ــ دیوانی نالی چاپی سنە .

٣ ــ دیوانی نالی چاپی هەولێر .

٤ ــ دیوانی نالی چاپی هەولێر ( ئۆفسێتی مەهابادی کوردستانی ئێران ) .

٥ ــ دەسنووسی دیوانی نالی کە لە لایەن مەلا عەبدوللا لە سالی ١٢١٦ھ/ ١٨٩٨مدا ڕوونووس‌کراوە .

٦ ــ دەسنووسی دیوانی نالی بە دەستی جەمالی مەلا ئەحمەد لە ئاغستۆسی سالی ١٩١٣ ڕوونووس کراوە .

٧ ــ دەسنووسی دیوانی نالی کە لە لایەن محەمەد حوسێنی قەرەداخی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ڕوونووس کراوە .

٨ ــ دەسنووسی دیوانی نالی لە دەفتەرێکی بچووکی گیرفاندا لە سالی ( ١٣٢١ھ/١٩٠٣ز ) لە لایەن محەمەد ئەمین زەکی‌ی مێژوو نووسی کورد ڕوونووس کراوە .

٩ ــ دەسنووسی دیوانی نالی لە (٥٩) لاپەڕەدایە لە دووا سالانی سەدەی نۆزدەم یا سەرەتای سەدەی بیستەم نووسراوەتەوە .

١٠ ــ دەسنووسی دیوانی نالی لە (٩٣) لاپەڕەدایە لە سالی (١٣٢١ھ/ ١٩٠٣ز ) نووسراوەتەوە ، تێکستەکانی سەرو ژێریان بۆ کراوە .

١١ ــ دەســـــــــنووسی Ms. or. oct. 1209. SB Marburg Berlin لە ئەڵەمانیا (٤٤) ، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی کـە تا ئێستاکە لە دیوانی نالیدا بڵاو نەکراونەتەوە ، بـە پێی قسـەی ئۆسکارمان ئەم دەســـنووسە لە ساڵی ١٨٨٠دا نووسراوەتەوە .

١٢ ــ بەیازێکی گـەورەی (٥٠٠) لاپـەڕەیی ، لە لاپەڕەیێـکیدا ساڵی ١٣٣٨ھ/١٩١٩ــ١٩٢٠ی لەسەر دانراوە .

١٣ ــ دەسنووسی « سۆزی نیشـــتمان » ، (٥٧٤) لاپەڕەیە ، لە لایەن نەجمەددین مەلاوە لە ساڵی ١٩٤٥ نووسراوەتەوە .

١٤ ــ دەسنووسی مینۆرسکی لە ساڵی ١٣٣١ھ/١٩١٣ز نووسراوەتەوەو لە ساڵی ١٩١٤ لە ناوچەی زەهاو دەستی کەوتووە ، ئەم دەسنووسە ئێستا لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیەت پارێزراوە .

١٥ ــ دەسنووسێکی تر لە ساڵی ١٣١٧ھ/١٨٩٩ز نووسراوەتەوە .

١٦ ــ کۆمەڵە دەفتەرو بەیازو پەڕەکاغەزی کۆن کە لەملاولەولا بەرچاومان کەوتووە بەتایبەتی لە حوجرەی مزگەوتو نامەخانە تایبەتییەکانی هەندێ لە خوێندەوارانی کورد لە وولاتی سلێمانی .

١٧ ــ وەرگرتن لە زاری ئەو کەسانەی شیعری نالییان لە بەرە ، لەمەدا هەندێ شـــیعری تازەو ڕاست کردنـەوەی هەڵـەکانی دیوانی چـاپ کراوو دەسنووسەکان هاتۆتە دەست .

١٨ ــ کۆمەڵە دەفتەرو بەیازو پەڕە کاغەزی کۆنی ئەرشیفی نامەخانەی تایبەتیی خۆمان(٤٥) .

لە پاش لێکۆڵینـــەوە لە هەموو ئـــەم سەرچاوانە ، بەتایبـــەتی دیوانە دەسنووسو چاپکراوەکان ڕاستیێکمان بۆ دەرکەوت ئەویش ئەوەبوو کە لە ڕووی زانستییەوە دەبوو چاپی سنەی دیوانی نالی بکرێ بە بنچو بناوان بۆ ساغ کردنەوەی شیعرەکان ، بۆیە هەر پارچە شیعرێك لەسەر کاغەزێکی

---

(44) Kamal Fuad, Kurdische Handschriften, Wiesbaden, 1970, S. 98-100.

(٤٥) ئەمە بەشێك بوو لەو سەرچاوانەی کـە کەڵکیان لێ وەرگیراوە بەوەی شتی تازەیان تێدا بووە ، یا هەڵەی سەرچاوەی تریان ڕاست کردۆتەوە ، لە ڕاستیدا زیاتر لە بیست نوســـخە دیوانی دەست نووسی نالی بەکار هێنراوە بۆ ئامادە کردنی ئەم چاپە .

تایبەتی نووسرایەوە ، ئنجـا بەرامبەرو بەراوورد کرا لەگەڵ هەمـوو چاپو دەسنووســەکانی تر ، لەمەدا هەڵــەی چاپیو هەڵەی لەبـەر نووسینەوەو ڕوونووس کردنو دەسکاری کردنی شیعرەکان ئاشکرا بوون . لە ئەنجامدا ئەو تێکستەمان هەڵبـژارد کە لە گیانی نالیو ئوسلووبی نالیو دنیـای نالییەوە نزیکە ، خۆ ئەگەر بکەوتینایەتە بەرامبەر دوو تێکست یا زیاتر کە هەموویان لە نالی دەوەشێنەوە نزیکترینیان لە نالی لە ناو شیعرەکەدا تۆمار کراوونو ئەویتریان لە پەراوێزی لاپەڕەکەدا نووسراوەتەوە .

بێ گومان ئاگاداری ئەوەشین کە شاعیر یا نووسەر یا هەر هونەروەرێکی تر هەموو بیرو دەهێنانێکی دەخاتە ناو قاڵبی تاقە تێکستێکەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی وەکو ووتمـان دوو تەعبیر یا زیاتر هەموویان نالییانە بـوونو لە نالی دەوەشانەوە هەموومان تۆمار کردن ، لەمەدا ئەگەر قازانج نەبێ زیانیش هەر نییە .

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ڕاستییێکی تریشمان بۆ ئاشکرا بوو ، ئەویش ئەوەیە وەنەبێ هەموو دەسنووسو دیوانە چاپکراوەکانی نالی لە شیعری بێگانە بە دوور بن ، واتە هەندێ شیعر کە هی نالی نییە پەڕیوەتە ناو دیوانییەوە ، ئێمە لەم ڕووەوە لە شیعری زیادەی دەسنووسو بەیازەکان نادوێین ، بەڵکو لەم لایەنەوە تەنیا دیوانی چاپکراوی نالی بژار دەکەین هەموو شتێکی بێگانەی لێدەردێنین .

## ئەو شیعرانەی هی نالی نین

لە چاپی بەغدای دیوانی نالی شیعری وامان بەرچاو نەکەوت کە گومان لە نالییەتی بکرێ ، بەڵام چاپی سنە پێنج غەزەلی بێگانەی تێکەوتووەو ئاشکرایە هی نالی نین ، چاپی هەولێریش بەبێ ووردبوونەوە غەزەلەکانی بە ناوی نالی تۆمار کردووە ، لە لای خوارەوە ئەو غەزەلانە دەست نیشان دەکەین :

**١ ــ ڕوخم ڕەنگینی ڕەنگی ڕوومەتی ڕەنگینتە بازا**

شەش دێرە شیعرە ، چاپی سنە ( ل٦ ) ، چاپی هەولێر ( ل٨ ) .

**٢ ــ عەزیزم ڕووحی شیرینم دوو چاووم**

هەشت دێرە شیعرە ، چاپی سنە (ل٢٤) ، چاپی هەولێر (ل٢٧) .

**٣ ــ ماچی دەمەکەی دامێ کە دامێ سەرو ماڵم**

شەش دێرە شیعرە ، چاپی سنە (ل٢٣ ، ٢٤) ، چاپی هەولێر (ل٢٨) .

**٤ ــ هێندە بێزاری کە زانیومە بە زاری نایەوە**

حەوت دێرە شیعرە ، چاپی سنە (ل٣٨) ، چاپی هەولێر (ل٧٢ ، ٧٣) .

**٥ ــ با ڕەفیقانم بکەن شینم کە وەقتی زاری‌یە**

هەشت دێرە شیعرە ، چاپی سنە (ل٣٧) ، چاپی هەولێر (ل٤٤) .

جگە لەمانە چاپی هەولێر ( هەردوو چاپی ساڵی ١٩٦٢و ساڵی ١٩٧٤ ) سێ غەزەڵو قەسیدەیێکی تریشی بە ناوی نالی‌یەوە تۆمار کردووە ، بەلای ئێمەوە ئەمە هی قوتابی‌ی نازیرەکی نالین :

**١ ــ سەیری هیجرت بەردی بنچینەی لە ڕەگ هێنامە دەر**

نۆ دێرە شیعرە (ل٢٠) .

**٢ ــ شەوی یەلدایە یا دەیجوورە ئەمشەو**

**پێنج دێرە شیعرە (ل٣٩) .**

ئەم غەزەلــە یەکێکە لە بەرهەمــەکانی مستەفا بــەگی کوردی لە بنجیشدا نۆ دێرە شیعرە نەک پێنج(٤٦) .

**٣ ــ ئەمڕۆ عاشوورایە دونیا بۆیە تارو پڕ تەمە**

حەڤدە دێرە شیعرە (ل٧٥) .

**٤ ــ دەروێش نیەم کەوتوومە ئێل بە حەی حەی**

دووازدە دێرە شیعرە (ل٨٥) .

لە دەســنووسەکاندا شیعری وامــان بەرچاو نەکەوت کــە گومان لە نالی‌یەتی‌یان بکرێ تەنیا دوو سێ پارچە غەزەل نەبێ ، بەلام لە بەیازو دەفتەری شیعرەکاندا هەنــدێ شیعری وا بە ناوی نالی‌یەوە تۆمــار کراوون نابێ هی ئەوبن .

## شــیعرێکی تورکی بــە ناوی نالی‌یەوە تۆمار کراوە

ئەم ماوەیە جێگەی وەلام دانەوەی ئەو پرسیارە نی‌یە کە ئایا نالی زمانی تورکی‌ی زانیوە یا نا ؟ یا ڕاستتر شیعری بە زمانی تورکی عوسمانی ووتووە یا نا ؟

---

(٤٦) دیوانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٣١ ، ل٢٢ ، ٢٣ .

ئەوەی گرنگ بێ ئەوەیە لە کۆمەڵە دەسنووسێکو بەیازو دەفتەری شیعردا پارچە شیعرێکی شەش دێڕی تورکی بە ناوی نالی‌یەوە نووسراوە، لە لای خووارەوە بۆ یەکەمین جار بڵاوی دەکەینەوە :*

**تیر ناز نگهك هر دلی گچسه یری وار**
**عاشقك پاینه زلفك گبی یوز بیك سری وار**

**اول مه زهره جبین در بناگوشنه چوق**
**نامور سبعهٔ سیاره گبی مشتری وار**

**بزم می در ندما جمع قدح گرده شده**
**سوفی کمین ورد دعای سحر ایله یری وار**

**عکس زلفك قدح دیدهٔ گریا نمده**
**نشای سنبل تر شیوهٔ نیلوفری وار**

**ناودان قلم ( نالی ) فصاحتده همان**
**نشای آب بقا زمزمهٔ کوثری وار**

**نفس ساعت گبی ایشلرسه‌گر یادایله طاعتدر**
**بر آنك قورمەسه پیر یولنه احیای ساعتدر**

بە ڕاستی جێی شانازیو گوشادی دەبوو کە ئەم غەزەلە تورکی‌یەش جێگەی خۆی لە دیوانی نالی‌دا بکردایەوە، وەکو غەزەلە تاقانە فارسی‌یەکەی کە لەم دیوانەدا بەرچاوی خوێندەوار دەکەوێ . ئەوەی ئاشکرایە ئەوەندەی شیعرە فارسی‌یە کە بەدەم هاوار دەکاو دەڵێ : من نالیم ! ئەوەندە شیعرە تورکی‌یەکە دەڵێ : من نالی نیم !

من باوەڕم بەهێزە کە ئەم شیعرە تورکی‌یە لە ڕووی داڕشتنەوە لە جیهانی خەیاڵی نالی‌یەوە دوورە، ئەگەر چی لە مانادا ئەوەی دروستی کردووە شارەزای نالی بووە . من لەسەر ئەو باوەڕەم کە یەکێکی شارەزای نالی ئەم شیعرەی داناوە بۆ ئەوەی نەڵێن نالی شیعری تورکی نەبووە، بۆیە جارێ ئەم غەزەلەمان لەم دیوانە دوور خستەوە .

---

(*) لە پاش لێکۆڵینەوەیێکی باشو پرسیار کردن لە شارەزایانی ئەدەبی کلاسیکی‌ی فارسی‌و عوسمانی‌و هەموو زمانە تورکی‌یەکان گەیشتمە ئەو ڕایەی کە ئەم پارچەیە بە جۆرێك لە « موسەممەت = مسمّط » یا « موەششەح = موشّح »دا بنێم .

## بەرنامە بۆ تێگەیشتنی نالی

بۆ کردنەوەی دەرگای ئەو جیهانە نهێنی‌یەی کە نالی پێ دەڵێن پێویست بە بەرنامەیێکی ڕێکوپێك هەیە . هەرچەندە ئێمە لە دەمێکەوە خەریکی هێنانەدی ئەم بەرنامەیەین ، بەڵام ئەمە ڕێگە لە کەس ناگرێ کە خەریکی نالی بن ، چونکە جیهانی نالی ئەوەندە فراوانە ، ئەوەندە تەنگوچەڵەمەی تێدایە هەوڵ‌و کۆشش‌و شەونخوونی زۆری دەوێ .

بە لای ئێمەوە تێگەیشتن لە شیعری نالی‌و خۆشەویست کردنی لە لای نەوەی خوێندەواری تازە پێ‌گەیشتووی نەتەوەی کورد بە ساغ کردنەوەی بەرهەمی شیعریەتی ئەمەش بە سێ قۆناغ دێتە دی ، ئەم قۆناغانە هەر یەکەیان پێوەندی‌ی بە ئەویترەوە هەیە ، هەموویان بە تێکڕایی وێنەی ڕاستەقینەی نالی دەدەن بە دەستەوە :

١ ــ بڵاو کردنەوەی دیوانی نالی بە بێ هەڵەو ساغ کردنەوەی هەموو تەنگو چەڵەمەیێکی کە لە دەسنووس‌و دیوانە چاپ کراوەکان‌دا هەیە . ( ئێمە هەوڵمان داوە لەم چاپەدا ئەم مەبەسە بهێنینە دی ) .

٢ ــ فەرهەنگی نالی . ( لەم چاپەدا ئەمەش بەرچاو دەکەوێ ) .

٣ ــ لێکۆڵینەوە لە ژیان‌و بەرهەمی نالی ( ئەم کارە بە دەستەوەیە ) .

هێنانە دی ئەم بەرنامەیە نالی دەخاتە جێ‌ی ڕاستەقینەی خۆی لە ئەدەبی کوردی‌دا ، هەروەها لە دڵی خوێندەواران‌دا جێ‌ی خۆی دەگرێ .

ئێمە کە گلەیی لەخوێندەوارانی نەوەی تازە دەکەین لەبابەت ئەوەوە کە نالی‌و شاعیرانی کلاسیکی‌ی تر ناچنە ناو دڵیانەوە ، نابێ تەنیا بیر لەوە بکەینەوە کە ئەمانە هوشیارانەو لە ڕووی تێگەیشتنەوە ئەدەبی نالی بە ئەدەبێکی بێ بایەخ‌و بە سەرچوو دادەنێن . ڕاستە لەوانەیە هەندێ کەسی وا هەبێ ، بەڵام ئەمە تەنیا ئەدگاری کۆمەڵی کوردەواری نی‌یە ، بەڵکو شەپۆلێکی بەرەڵلایی‌یە لە هەندەرانەوە ڕووی لە ئێمە کردووە .

هۆی ئەوەی کە نالی نەچۆتە ناو دڵی نەوەی خوێندەواری تازەی کوردەوە ئەوەیە کە بە تەواوی تێ‌ی نەگەیشتووە ، ئەمە نەوەکو لەبەر ئەوەی خۆی هیچ نازانێ ، بە پێچەوانەوە دەتوانین بڵێین هوشیارو شارەزایە ؛ هەروەها تەنیا لەبەر ئەوەش نی‌یە کە شیعرەکانی نالی « قورس‌و داخراوون » بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە شیعری نالی بەڕاستی‌و پوختەیی‌و بێ هەڵە نەکەوتۆتە ناوەوەو لە ژێر دەستی‌دا نی‌یە .

لەوانەیە بووترێ سێ چووار جار دیوانی نالی لە چاپ دراوە ، ئەمە

ڕاستە ، بەڵام چاپی یەکەمی بەغدای لەگەڵ ئەوەی هەڵەی چاپیشی زۆر تێدایە بەڵام بە دەگمەن چنگ دەکەوێ ، هەروەها چاپی سنە لەگەڵ ئەوەی چاکترین چاپە با بە ئیملای کۆنی کوردی فارسی ئامێزیش چاپ کرابێ ، لای چەند کەس دەست دەکەوێ ؟ هەرچی چاپی هەولێرو ئۆفسێتەکەی مەهابادیشی‌یەتی ئەوەندە نالەبارو پڕ هەڵەو ناعیلمی‌یانەیە مێشکێکی تەلیسماوی دەوێ کە تێ‌ی بگا . ئیتر ئێمە بۆچی دەبێ گلەیی لە نەوەی خوێندەواری تازە بکەین ؟

من پێم‌وایە بیروڕا نەوەکو بەرامبەر نالی بەڵکو بەرامبەر بە هەموو داهێنانێکی هونەری پێوەندی‌ی بەتێگەیشتنی بەرهەمەکەوە هەیە ، پیاو لە شتێك نەگا بێ گومان ناچێتە دڵی‌یەوە ، من لەوە دڵنیام ئەگەر بێت‌و ئێمە شیعرەکانی نالی بەبێ هەڵەو وەکو خۆی چۆن بووە بخەینە بەر دەستی خوێندەوارانەوە دەبێ چاوەڕووانی ئەوە بین کە زەوقی لێ وەردەگرن‌و تا ڕادەیێکیش تێ‌ی دەگەن ، ئنجا ئەگەر بێت‌و ووشە قورسەکان‌و تەعبیرە داخراوەکان بە جۆرێك ڕوون بکرێنەوە کە ئاسان بین ــ نەك قورستر بکرێن ــ لەو کاتەدا بە تەواوی نالی دەچێتە ناو دڵی خوێندەوارانی کوردەوە ، نەوەکو تەنیا وەکو شاعیرێکی غەزەل ، بەڵکو وەکو حەکیمێکی یەکجار بلیمەت‌و خوێندەوارێکی بێ هاوتاو شارەزاییێکی کە لە کەمال نزیك بۆتەوە .

## فەرهەنگی دیوانی نالی

ڕێکخستن‌و دانانی ئەم فەرهەنگە بۆ شاعیرێکی کوردی وەکو نالی یەکەمین هەوڵ‌و تەقەلایە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی‌دا . سوودی فەرهەنگی نالی تەنیا لەوەدا نی‌یە کە تا ڕادەیێك مانای شیعری شاعیر ڕوون دەکاتەوە ، بەڵکو دەتوانین ئەم فەرهەنگە بە کلیلی قفڵی شیعری کلاسیکی کوردی دابنێین لە کوردستانی خوارووەدا کە نالی دامەزرێنەریەتی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە تا ماوەی نێوان هەردوو جەنگ ، جەنگی جیهانی‌ی یەکەم‌و دووەم ، چونکە ئەو کۆمەڵە ووشەو تەعبیرانەی کە نالی بەکاری هێناوون(٤٧) زوربەی هەرە زۆریان بەردی بناغەو بنچینەی زمانی شیعری ئەدەبی کوردستانی

(٤٧) دەبێ لێرەدا ئەوەش بووترێ کە گەلێك لەم ووشەو تەعبیرانە ، نەژادیان هەرچی‌یێکی هەیە با ببێ ، لە شیعری کلاسیکی‌ی هەموو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و قەفقاس‌و ئاسیای ناوەڕاست‌و هیندستان‌و جێگەی تر بەکار دەهێنرێن .

خوواروو بوون ، دیاره هەر شاعیرەو کۆمەڵە ووشەو تەعبیرێکی تایبەتیی خۆشی هەیە .

بۆ دانانی ئەم فەرهەنگە ڕەچاوی ئەم شتانەی خووارەوە کراوە :

١ ــ ووشەو ڕستەکان بە ئیملاو دەستووری نووسینی کوردی نووسراوون وەکو ئیملای ناو تێکستەکان ، ئەگەر ووشە یا ڕستەکە بێگانە بێ بەتایبەتی عەرەبیو فارسی ، بە ئیملای عەرەبیو فارسی بە سەرو ژێرەوە تۆمار کراوە .

٢ ــ سەرو ژێری هەندێ تیپی ووشەی عەرەبی لە فارسیو تورکی عوسمانیدا وەکو یەك نین ، ئێمە لێرەدا تەماشای لایەنی مۆسیقی بزوێنەکەمان کردووە ، ئەوەی بە جووانترمان زانیوە ئەومان نووسیوە .

٣ ــ هەوڵمان داوە لە فەرهەنگەکەدا هەموو ماناکانی ووشەو ڕستەکان بخەینە ڕوو ، لێرەدا دیارە خۆنەر کە بەرەوڕووی هەموو ماناکان دەبێ دەتووانێ ئەو مانایە یا ئەو مانایانەی کە شاعیر مەبەستیەتی جودایان بکاتەوە ، ئەمە لە لایێك لە لایێکی تریشەوە ووشەو تەعبیرو ڕستەی نالی ئەوەندە مانایان زۆرە ، نەوەکو لە هەندێ جێگە ئەم فەرهەنگە لە هەقی نەهاتووە بەڵکو گەلێ فەرهەنگی گەورە گەورەی تریش لە هەقی نایێن .

٤ ــ هەموو ووشەو تەعبیرو ڕستە عەرەبیەکان بە ئیملای کوردی نووسراوون ، بە پێی تیپی یەکەمی ووشەکە یا ڕستەکە لە فەرهەنگەکەدا دەدۆزینەوە . ئێمە ناچارین وەکو هەموو نەتەوەیێکیتر پێڕەوی ئیملای نووسینی کوردی خۆمان بکەین . نالی گەلێ ووشەی وەکو ئەمانەی لە شیعردا بەکار هێناوە : ( زات ) ، ( زاهیر ) ، ( زایع ) ، ( زەڕڕە ) ، بۆ ڕوون کردنەوەو نەهێشتنی سەر لێ تێك چوون لە فەرهەنگەکەدا لە بەرامبەری ئەم ووشانە شێوەی عەرەبیشیان نووسراوە : ( ذات ) ، ( ظاهر ) ، ( ضائع ) ( ذرّة ) .

٥ ــ ئەگەر دێڕە شیعرێك یا نیوە دێڕە شیعرێك هەمووی عەرەبی بێ بە بە ئیملای عەرەبی نووسراوە . ئەو ووشانەی لە شیعرە عەرەبیەکاندا بەکار هێنراوون و بەتایبەتی ئەو ووشانەی لە شیعری ڕۆژهەڵاتدا بەکار ناهێنرێن پشت گوێ خراوون .

٦ ــ ووشە و ڕستەی فەرهەنگەکە بە پێی ئەلفبای کوردی تیپی عەرەبی دانراوە ، دیارە بە پێی تیپە بێ دەنگەکان ، چونکە ووشەی کوردی هەمیشە بە تیپی بێ دەنگ دەست پێ دەکا ، وەکو لای خووارەوە :

ئـ ، ب ، پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ق ، ك ، گ ، ل ، م ، ن ، و ، ھ ، ی .

٧ ـ تیپی دووەمی بزوێـــن لە ووشـەدا بـــە پێی ڕیـــزی خوارەوە ڕێکخراوە .

ا = a ، ـە = e ، ـیـ = î ، ـێـ = ê

و = u ، وو = û ، ۆ = o ، ۆ̄ = ö ، ـ = i (٤٨) .

ئیتر هەمـــوو تیپەکانی تری ووشـــە ئەگەر بێ دەنگ بێ بـــە پێی بێ دەنگەکان ڕیز کراوە ، وە ئەگەر بزوێن بێ بە پێی بزوێنەکان ڕیزکراوە .

## دووا ووشە

من ناڵێم نـــالی گەورەترین و مەزنتـــرین شاعیری کـــوردە ، چونکە لە ئەدەبدا وە نەبێ ووشەی « گەورە» و « گەورەتر »و « گەورەترین » شتێکی بەجێ بێ ، بەڵام ئەوەندە دەڵێم ئەو پلەیەی کە نالی گەیشتوویەتێ لە شیعری کوردیدا پلەیێکە لە دووای ئەودا هیچ پلەیێکی تر نییە ، لە پێش نالیو لە پاش نالیو لەناو هەموو نەتەوەیێکو لە هەموو ڕۆژگارێکدا ، پلەی شیعری نالی لە جیهانی جووانیو هونەریدا بێ ناتەواوییە .

من ناڵێم کەس هێندەی من لەگەڵ نالیدا نەژیاوە ، بەڵام ئەوەندە دەڵێم کەم کەس دەتووانێ ئەوەندە لەگەڵ نـــالی بژی ئەوەندەی من لەگەڵی ژیاومو دەژیم .

## سوپاس

سوپاسی بێ سنوورم بۆ هەموو ئەو کەسانەی ، دەسنووسێکی نالییان بۆ هێناووم ، بەیازی شیعرێکی نالییان بۆ ناردووم ، ووشەیێکیان بۆ ڕوون کردوومەتەوە ، شیعرێکی لەنگیان ڕاست کردۆتەوە ، پێشنیارێکی بەجێیان بۆ کردووم ، یا هیـــچ نەبێ هانیان داووم ئـــەم کارە پیرۆزە ببەمـــە سەر ،

(٤٨) ئەم تیپە بزوێنە لە ئیملای کوردی بە ئەلفبای عەرەبی وێنەی نییە ، بەڵام بێ گومان خوێندەوار جێگەی لە ووشەدا دەدۆزێتەوە .

بەتایبەتی مامۆستایانو قوتابییانو هاورێیانو دۆستانی وەك : محەمەد صالح دیلان ، دوکتۆر کەمال فوئاد ، هێمن موکریـانی ، جەمال محەمەد ، شێخ محەمەدی خـاڵ ، مەلا رەووفی سەلیم ئاغـای حەوێزی ، مـەلا محەمەدی شەڵاشی ، محەمەد ئەمـین کاردۆخیو مامۆستایانی بەشی زمـانی کوردیو رۆژهەڵاتناسی لە کۆلێجی ئەدەبیاتی زانستگای بەغدا .

بەڵام ئەو کەسانەی تەگەرەیان دەخستە بەر ئەم کارە بەوەی کەرەستەو سەرچاوەو دەســنووسو بەیازیان لێ دەشاردمەوە لە نالی ناســانی هەندێ دەسگای زانستیی کوردیو ئەوانەی پێوەندییان بەوانەوە هەیە ، من لێیان دەبوورم ، ئەگـەر کەموکووڕی لەم کـارەدا هەبێ ــ بێ گومان هـەیە ــ لە هەندێکیدا ئەوان بەرپرسیارن .

بەغدا : ١ی نیسانی ١٩٧٥ — مارف خەزنەدار

**نموونەی هەندێ لەو دیوانی دەستنووس‌و بەیازو دەفتەری شیعرانەی کە بەرهەمی نالی‌یان تێدا تۆمار کراوە لە نیـوەی دووەمی سـەدەی نۆزدەم‌و سەرەتای سەدەی بیستەمدا**



# دیوان شاعر شهیر حضرت نالی

سودا زدکە زلفت ازهار لکن پشمە　　دورلو کە بخارە گلزار لکن پشمە
صوفی کە گران بارە بیغز وسبکبارە　　صوف پوش غم بارە اوبار لکن پشمە
دیوانە کە شیدانی توکی سری مودانی　　قط هیچ اسرنانی دستار لکن پشمە
سینە دل بیکمینە صافی و کون آینە　　مستورە بە پشمینە اسرار لکن پشمە
عاشق کە دکا راوی ظلمات شوە داوی　　مژکان تو چاوی بیدار لکن پشمە
صوفی جیە ایشی تو هرکایە حشیشی تو　　عاشق دکوریشی تو هوسار لکن پشمە
چند واسعە ام ذهنە افلاك بتار هنە　　اجبال لە لا عهنە ادوار لکن پشمە

نالی کە نمد پوشە مستانە وسرخوشە
خاموش نمد پوشە اشعار لکن پشمە

سرشك من کە سیلاوی غبار کوە هامونە　　فرە سر چاوەکم پروانە وك آونیە رونە
منجم کر کسو لاشە لکن شئیکە نازانی　　کەام افلاکە چند لا کە کەام گردونە چندونە
لەدوران طبیعتدا لەکل شو رفاك جوتە　　لە لیا چنبر دوران طوق جرخ گردونە
لەسایەشخصیکی سایەبلند آسو دیەشاری　　ولی خطە سلیمانی صواد ظل گدرونە

بودرە سیر خیابانی ریاض دفتر نالی
کەصف صف مصرع برجستەمردسرو موزونە

ساقی بمی کهنە لسر عادت توبە　　بشکینە بیك توبە دوصد ماتم توبە
فح قدح گردش گردون دشکینی　　باری کە دلی معتقد گردش ادبە
ای نفس مرائی چەگرانباء تکالیف　　بوجاق دکیشی کە هرورایش جدوبە
بغضت لە فقیران چیە قربان وکو قصاب　　بو خزدو نبرورشوتە ای هیزە قلوبە
اسب نفت دیت ودجید کرم عنان　　ای مست ریا ساهلسە هشیار لوبە
دلك داستارت کە هتەمل هلاتن　　سرکردە روزبە هر شو دهزن خوبە

نالی هبە ناجز کەادوورە سبحورە
• ساقی کرمی یك بیك توبە بنوبە

شکنج عرض طبرا یچ زلف بی سر استحامە　　مثال طول امل عمر خضر زنجیر سودامە
بشرهاتن رقیب ومدعی من خوشی خوشیمە　　کەدعوایە لەهر لای بکتری سو داسلامە
اشارەم کردە ابروی یعنی محراب کچە فرمونی　　امە قبلە تمام عالم وجه مود امامە
لەسایەروی تووەشام خلق ظلمت صبحە　　لەشام زلف تووە صبح امینە ظلمت شامە
لە آب وتاب اشك آە خومدامثل بریانی　　لەبانی بختکی سو تام وایستەش بیم دل خامە

لاپەڕەیێك لە گۆواری « ڕۆژی کورد » ئەستەموول ۱۹۱۳

( مکه اخلاف او وعده )

مکه اخلاف اووعدەی کە فرموت ؛
دخیلت بم کە خانەی صبرەکەم سوت .

لە روت وقوت وك من رومپوشە ؛
کەوصل تویە قوت عاشق روت .

اوە لبو اتوبو پر لە خندە
کەوا شکردە باری کل دە پشکوت .

دەکەی نخچیر صدل هر بەتیری ؛
الامی هربمینی دست وبازوت .

جە شیرینە خطوط دور لبوت .
بلی معلومە خوشە . خط یاقوت .

— نالی —

لاپەڕەیێك لە کتێبی « ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد »
ئەستەموول ١٩٢٠

## غەزەل

### ( أ )

( ١ )

ڕیشەکەی پان و درێژە بووریا خزمەت دەکا
زاهیرە هەر کەس لە تووڵ و عەرزی ڕیشیدا ڕیا

گوڵ بە دەم بادی سەباوە پێکەنی بلبل فری
یەعنی عاشق لازمە دوور بێ لە یاری بێ وەفا(١)

عاشقی سونعی حەقم قوربانی ڕەنگی قودرەتم
چاوی ئالوی ، خالی شین ، کولمی سپی ، زولفی سیا(٢)

سەرگرانە قافلەی سالاری ڕێی چین و خەتا
چونکە باری عەنبەر و موشکە کە زولفەینی دوو تا

حەلقە حەلقە زولفی سەر قوبەی هەیاسەی کەوتووە
مەحرەمی نسرره بەڵێ گەنجووری گەنجە ئەژدەها

سۆفییی مەستووری ڕووتی موفلیسی خستە تەمەع
سەیری خاڵی بێ حیساب و ماچی لەعلی بێ بەها

زاهیر و باتین لە سەر لەوحی حەقیقەت یا مەجاز
ئاشنای سرری قەلەم بێ غەیری ( نالی ) کەس نەما

---

(١) گوڵ بەدەم بادی سەباوە پێکەنی بلبل فری
یەعنی عاشق لازمە دووری لە یاری بێ وەفا

(٢) عاشقی سەبغی حەقم قوربانی دەستی قودرەتم
چاوی ماوی ، خالی شین ، کولمی سپی ، زولفی سیا

**ئەدەب** : (١) شەرم ، ئەخلاق ، خوو و ڕەووشت ــ ئەدەب کردن : شەرم کردن ، خۆ لادان لە کاری نابەجێ ، ڕەووشتی چاك . (٢) زانستی ، زانین ، زانستی ئەدەب ، بەرهەمی هونەری بە نووسین لە شیعرو پەخشان .

**ئەدیب** : زانا ، شاعیر ، نووسەر ، ئەو کەسەی شارەزایی لە زانستی ئەدەبدا هەیە .

**ئەدنا (أدنى)** : نزمتر ، زەبوونتر ، کەساستر ، بەستتر ، نزیکتر .

**ئەدوار ( ادوار )** : کۆی (دەور = دور )ە ، (١) گەڕان ، گەردش ، بزووتنەوەو گەڕانی شتێك لە دووای شتێکی تر . (٢) گەڕانی ساڵو ڕۆژگارو زەمانو سەردەم .

**ئەر** : کورتکراوەی (ئەگەر)ە .

**ئەراك** : درەختێکە لە دار هەنار دەکا ، گەڵای گەورەو هەمیشە سەوزە ، لقەکانی ناسكو دڕکدارە ، گوڵی ڕەنگ سوورە ، بەری سوور یا بنەوشەیی یە ، تامی هەندێ تاڵە ، بەڵام بۆ خوواردن بەکار دێ ، لە لقو ڕەگەکانی میسواك دروست دەکرێ ، لە ناوچەی گەرمدا دەبێ .

**ئەرباب** : (١) خاوەن. (٢) چاوتێر، جووامێر ، خاوەن پارەو دەوڵەمەند .

**ئەرجوو** : تکا ، تکاکردن ، ڕجاکردن .

**ئەرز ( ارض )** : زەوی ، ڕووی زەوی ، عەرز ، عەرد ، خاك ، خۆڵ .

**ئەرزی مەعلەکە** : جێگەی لە ناو چوون ، جێگەی مردن ، مەیدانی جەنگو شەڕو شۆڕ .

**ئەرقەم ( أرقم )** : ماری ڕەشو سپی ، ماری ڕەش کە خاڵی سپی تێدا بێ ، جۆرە مارێکە لە بەدترینو کوشندەترینی نەوەی مارە .

**ئەرکان ( ارکان )** : کۆی ( ڕوکن = رکــن )ە ، (١) گەورەترینو بەهێزترین پارچەو بەش لە هەموو شتێك ، ئەندامی بنچینەیی . (٢) کۆڵەکە ، ستوون ، پایە . (٣) شتی زۆر گەورە ، سەردارو سەرۆکی قەومو نەتەوە . (٤) جێگەی فەرماندەی لەشکر ، ئەو بارەگایەیە کە نەخشەو پرۆگرامو پیلانی جەنگی لێ دادەنرێ .

**ئەرواح ( ارواح )** : کۆی ( ڕووح = روح )ە ، بڕوانە ( ڕووح ) .

**ئەز** : من ، ئەمن ، مو .

**ئـەز ( از )** : ( ووشەیێکی فارسی )یە ، لە .

**ئەزەل ( ازل )** : هەمیشەیی ، ئەوەی سەرەتاو دووایی نی یە ، هەر بووەو هەر دەبێ .

**ئەزرەق ( ازرق )** : شین ، نیلی ، ئاوی ، ڕەنگی ئاو ، ماوی .

**ئەزفەر ( اذفر )** : بۆنی یەکجار تیژی خۆش یا ناخۆش .

**ئەزهار ( ازهار )** : کۆی ( زەهر = زهر )ە ، گوڵ .

**ئەزهەر مین شەمسی ( اظهر من شمس )** لە ڕۆژ دیارتر .

**ئەژدەر** : (١) لە ئەفسانەی کۆندا ناوی مارێکی یەکجار گەورەیە ئاگر لە دەمی دێتە دەرێ ، ( ئەژدەها )و ( ئەژدەرها )شیان پێ ووتووە . (٢) ناوی چەکێکی جەنگی‌یە بریتی‌یە لە بۆمبایێك بۆ شکاندن‌و نوقوم‌کردنی کەشتی لە زەریادا بەکار دەهێنرێ .

**ئەژدەها** : بڕوانە ( ئەژدەر ) .

**ئەسەر ( اثر )** : نیشان ، شۆن ، شۆنی پێ ، هەموو شتێکی کە وێنەی مابێتەوە ، گێڕانەوە .

**ئەسەف ( اسف )** : داخی گران ، پەژارە ، ئەفسووس ، درێغ .

**ئەسباب ( اسباب )** : کۆی (سەبەب = سبب)ە ، بڕوانە ( سەبەب ) .

**ئەسپ** : گیانداریکی چوار پێ‌یە، بۆ سوواری‌و هەندێ جاریش بۆ بار بە کار دەهێنرێ ، لەبەر خۆش ڕەوی بۆ گەشت‌و ئەراتێن‌و یاری‌ی پۆلۆ بە کار دەهێنرێ .

**ئەستێر** : گۆلی دەستکرد ، ئەو گۆماوەی کە ئادەمزاد دروستی دەکا ، ئەستێرگ ، ئەستێلك .

**ئەستێرە** : هەر یەك لەو نوختە درەوشەدارانەی کە شەو لە ئاسماندا دەبینرێن .

**ئەستوور** : (١) قەبە ، دژی درەوشەدارانەی کە شەو لە

**ئەستوون** : کۆلەکە ، دینکە ، دیرەگ، ئەو دارە درێژو ئەستوورەیە کە لە نێوان بن میچ‌و زەوی دادەنرێ بۆ ئەوەی بانی پێ ڕابگیرێ ، ئەمە لە بەرد یا خشت یا هەر کەرەبستەیێکی تریش دروست دەکرێ .

**ئەستوونە** : بڕوانە ( ئەستوون ).

**ئەستوونی حەننان** : کۆلەکەیێکی دار بووە پێغەمبەر لە کاتی خوتبەو وەعزداندا پالی لەسەر داوەتەوە .

**ئەستۆ** : مل .

**ئەسحاب (اصحاب)** : کۆی (ساحیب = صاحب)ە ، بڕوانە ( ساحیب ) ،

**ئەسحابی کەهف (اصحاب الکهف)** : حەوت کەسی بت‌پەرست بوون ، لە پاشانا باوەڕیان بە عیسا کردو هاتنە سەر ئایینی مەسیحی ، لە بەر زولم‌و زۆری داقیووسی ئیمپیراتۆری ڕۆمانی ( سەدەی سێ‌یەم ) لە ئەشکەوتێکدا خۆیان شاردەوەو نووستن‌و لە پاش سێ سەد سال لە خەو هەلسان ، سەگێکیان لەگەلدا بوو ناوی قیتمیر بوو ، ئەم ڕووداوە لە قورئاندا باس‌کراوە .

**ئەسداف ( اصداف )** : کۆی ( سەدەف = صدف )ە ، بڕوانە ( سەدەف ) .

**ئەسرار ( اسرار )** : کۆی ( سرر = سرّ )ە ، بڕوانە ( سرر ) .

**ئەسعار ( اسعار )** : کۆی ( سیعر = سعر )ە ، نرخ ، قیمەت .

**ئەسغەر ( اصغر )** : بچووکتر ، ووردتر .

**ئەسغەران ( اصغران )** : دل‌و زمان .

**ئەسفار ( اصفار )** : کۆی (سیفر چ صفر)ە ، (١) بەتال ، بێ ناووك ،

نووچ ، هیچ . (٢) لە زاراوەی ژمارەدا نیشانێکە لە شێوەی نوختەدایە « . » .

**ئەسکەندەر** : لە ووشەی ئەورووپایی ( ئەلێکساندر )ەوە وەرگیراوە ، کوڕی فیلیپۆسی ئیمپراتۆری مەکدۆنیا بووە ، بە لەشکرێکی چل هەزار کەسیەوە هێرشی بردە سەر دەوڵەتی دارا لە ٣٣١ی پێش زایین لە جەنگی گوگامیل لەنزیك هەولێر سەرکەوتو دەوڵەتی ئێرانی ڕووخاندو ئاگری لە ئەستەخر بەردا ، بەسەر هەموو ڕۆژهەڵاتی کۆندا زاڵ بوو تا گەیشتە ڕووباری سەند لە هیندستان ، ئەریستۆ مامۆستای بووە ، عالەمگیرو زولقەرنەینیشی پێ دەڵێن .

**ئەسل ( أثل )** : شۆڕەگەز ، ناوی درەختێکە لە دارگەز دەکاو بەڵام لەو گەورە ترە ، داری گەلێك ڕەقو سەختە .

**ئەسڵ ( اصل )** : ڕەگ ، ڕیشە ، نەژاد ، بنیاد ، بنج ، بنچینە .

**ئەسما ( أسماء )** : کۆی ( ئیسم = اسم )ە ، بڕوانە ( ئیسم ) .

**ئەسیر (اسیر)** : گرفتار ، بەندی ، ئەو کەسەیە کە لە ئەنجامی جەنگدا دەکەوێتە دەست دوژمن .

**ئەشخاس ( اشخاص )** : کۆی (شەخس = شخص)ە ، بڕوانە (شەخس) .

**ئەشرەف ( اشرف )** : گەورەتر ، مەزنتر ، شەریفتر .

**ئەشعار ( اشعار )** : کۆی (شیعر = شعر )ە ، بڕوانە ( شیعر ) .

**ئەشك** : بڕوانە ( فرمێسك ) .

**ئەشکەنجە** : ڕەنجو ئازار ، عەزاب .

**ئەشکەنجەیی غەم** : ئازاری غەم ، تەعبیرێکە لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هاتووە .

**ئەشکی ڕەوان** : فرمێسکی زۆر بە خوڕ .

**ئەشکی گەرم** : فرمێسکی گەرم ، کینایەتە بۆ دڵ سووتاویو گریانی بە کوڵ .

**ئەشکڕێژ** : ئەو کەسەیە کە دەگری ، ئەو کەسەیە کە فرمێسك دەڕێژێ .

**ئەشواق ( اشواق )** : کۆی (شەوق = شوق )ە ، بڕوانە ( شەوق ) .

**ئەعدا ( اعداء )** : کۆی (عەدوو = عدو)ە ، بڕوانە ( عەدوو ) .

**ئەعزا ( اعضاء)** : کۆی (عوزوو = عضو )ە ، (١) ئەندام ، پارچەیێك یا بەشێك لە لەش ، وەکو ، دەست ، پێ ، سەر ، (٢) تاکێك لە خەڵك ، یەکێك لە کۆمەڵ یا دەسگا یا ڕێکخراوێك.

**ئەعزەم ( اعظم )** : گەورەتر ، مەزنتر .

**ئەعلا ( اعلی )** : بڵندتر ، بەرزتر ، باڵاتر .

**ئەعمال ( أعمال )** : کۆی ( عەمەل

= عمل )ە ، بڕوانە ( عەمەل ) .

**ئەعوەر ( اعور ) :** یەك چاو ، ئەو کەسەیە کە تەنیا چاوێکی ساغ بێ .

**ئەغیار ( اغیار ) :** بێگانە ، خەڵکی دوور .

**ئەفراد ( افراد ) :** کۆی (فەرد= فرد)ە ، بڕوانە ( فەرد ) .

**ئەفرادی مورسەلین :** کەسانێ کە لە لایەن خوداوە نێرراوون بۆ چاك کردنی باری ژیانی ئادەمزاد ، پێغەمبەرانێ کە لە لایەن خوداوە نێرراوون .

**ئەفراح ( افراح ) :** کۆی (فەرەح = فرح)ە ، بڕوانە ( فەرەح ) .

**ئەفسەر :** (١) تاج ، تانج ، کڵاوی پادشا . (٢) هەموو تاکێکی سوپا کە پلەی تایبەتی هەبێ .

**ئەفشان :** ڕژاندن ، بڵاوکردنەوە ، پەراگەندە کردن ، ئاشکراکردن .

**ئەفغان :** فەریاد ، زاری ، ئاه ، ئاخ ، ناڵە ، بانگ .

**ئەفگار :** نەخۆش ، دەردەدار ، خاوەن ئازار ، ڕەنجوور ، بریندار .

**ئەفلاك ( افلاك ) :** کۆی (فەلەك فلك)ە ، بڕوانە ( فەلەك ) .

**ئەقداح (اقداح) :** کۆی (قەدەح = قدح)ە ، بڕوانە ( قەدەح ) .

**ئەکبەر ( اکبر ) :** گەورەتر ، گەورەترین ، زۆر گەورە ، مەزن .

**ئەکسەر ( اکثر ) :** زۆرتر ، زیاتر .

**ئەکسیر :** (١) زاراوەیێکی زانستیی کیمیایە ، بەتایبەتی لە لایەن کیمیاگەرانی کۆن بە کار دەهێنرا ، ئەو جەوهەرەیە کە بنیادو نەژادی شت دەگۆڕێ ، بۆ بەڵگە جیوە دەکا بە زیوو مسیش دەکا بە زێڕ ، بەڵام دیارە تا ئێستاش ئەو جەوهەرە نەدۆزراوەتەوە . (٢) شتی یەکجار بە کەڵك و سوود . (٣) بیری حەکیم و فەیلەسووفێکی گەورە یا زانایێکی مەزن ئەوەی بۆی هەیە بنچینەی بیری خەڵکی بگۆڕێ .

**ئەکفان (اکفان) :** کۆی (کەفەن = کَفَن )ە ، بڕوانە ( کەفەن ) .

**ئەگەر :** ووشەیێکە لە دەستووری زماندا بۆ مەرج بە کار دەهێنرێ ، بە شێوەی ( گەر )و ( ئەر )یش هاتووە .

**ئەگریجە :** زولف، بسك ، کەزی، مووی سەری ژن کە بەسەر و ڕوومەتیدا شۆڕدەبێتەوە لە نێوان چاوو گوێچکەی .

**ئەلا :** ووشەیێکە بۆ هوشیار کردنەوە بە کار دەهێنرێ ، هوشیار بەرەوە ! ئاگادار بە !

**ئەلات :** لات ، لای تۆ ، کن تۆ ، کنت .

**ئەلەم ( الم ) :** ئێش ، ئازار ، ژان ، دەرد ، ڕەنج .

**ئەلیف :** (١) مالی ، کەوی ، ئولفەتگرتوو، یارو دۆست، هاودەم (٢) بڕوانە ( ئەلف « ا » ) .

**ئەلبەت :** هەلبەت ، بێ گومان ، ووشەیێکە بۆ تەئکید بە کار دەهێنرێ .

**ئەلبەتتە (البتّە)** : بــــــڕوانە ( ئەلیەت ) .

**ئەلحەد (الحد)** : (١) گۆڕ ، قەبر . (٢) ئەو جێیەیە کە لە گۆڕدا سەری مردووی لەسەر دادەنێن .

**ئەلف** : تیپی « ا » .

**ئەلفاز ( الفاظ )** : کۆی ( لەفز = لفظ )ە قسە ، ووتە ، دەنگی تیپ کە لە زمان دێتە دەرێ .

**ئەلواح ( الواح )** : کۆی ( لەوح = لوح )ە ، بڕوانە ( لەوح ) .

**ئەلـواحی ئەلحـەد** : بـــەردی ئەلحەد ، بەردی قەبر ، ئەو بەردەیە کە سـەری مـردووی لـە سـەر دادەنرێ لە گۆڕدا .

**ئەلوان ( الوان )** : کۆی ( لەون = لون )ە ، (١) ڕەنگ . (٢) جۆر ، چەشن ، نەوع .

**ئەللا ئەللا ( الله الله )** : بۆ نرخ پێ دان و هەست بە جوانی کردنە .

**ئەم** : ووشەی ئیشارەت و دیاری کردنە بۆ نزیك بۆ گیاندارو بێ گیان بە کار دەهێنرێ .

**ئەمارەت** : (١) میرنشین ، وولات ، مەملەکەت . (٢) نیشان ، نیشانە ، دروشم ، شوێن ، عەلامەت .

**ئەمانەت** : (١) دڵنیـا بـوون ، ڕاسـتی و دروسـتی ، هێمنـی ، بێ ترس ، نەترسان . (٢) شتێك بە کەسێك ڕابسپێررێ بۆ پاراستن .

**ئەمە** : بڕوانە ( ئەم ) .

**ئەمەتە** : ئەمـە خۆیـەتی ، ئەمە ئەو شتەیە کە لە دووای دەگەڕێین .

**ئەمەگ** : ڕەنج ، پیاوەتی ، کاری چاك لە پێناوی یەکێکی تر .

**ئەمەل (امل)** : ئومێد ، ئارەزوو ، هیوا ، ئامانج .

**ئەمین (امین)** : جێی باوەڕ کردن ، هەر کەسێك کە باوەڕی پێ بکرێ و شتی پێ بسپێررێ .

**ئەمێستا** : ئێستا .

**ئەمجا** : ئنجا ، ئینجا ، ئەوجا .

**ئەمر ( امر )** : (١) فەرمان ، بڕیار . (٢) شتی بەرز ، ڕووداوی گەورە .

**ئەمڕۆ** : ڕۆژی ئێســـتا ، ئـەو ڕۆژەی تێیدا دەژین ، ئەم ڕۆژە ، ئەم سـەردەمە ، ئەم ڕۆژگارە ، ئەم زەمانە .

**ئەمساڵ** : ئەم ساڵە ، ئەو ساڵەی تێیدا دەژین ، ساڵی ئێستا .

**ئەمشەو** : ئـەم شـەوە ، ئـەو شەوەی کە تێیدا دەژین ، شـەوی ئێستا .

**ئەمما (امّا)** : بەڵام .

**ئەمن** : بڕوانە (من) .

**ئەنیس ( انیس )** : هـــاودەم ، ئەوەی دڵ دەداتەوە ، ئەوەی دەبێتە مایەی خۆشـی بۆ یەکێـکی تەنیاو گۆشەگیر .

**ئەنبار** : عەمبار ، عەمار ، جێی کۆکردنەوەو پاراسـتنی دانەوێڵە یا هەر شتێکی تر ، جێی کۆکردنەوەو پاراستنی هەموو ماڵێکی بازرگانی .

**ئەنبیا ( انبیاء )** : کۆی ( نەبی =

نبیّ )ە ، پێغەمبەر ، نێرراوی خودا بۆ چاك كردنی بازی ژیانی خەڵكی .

**ئەنجــام** : دووایــی ، كۆتــایی ، ئاخیر ، پێچەوانەی سەرەتا .

**ئەنجوم ( انجم )** : كۆی ( نەجم = نجم )ە ، بڕوانە (نجم) .

**ئەنجومی قوبوور** : ئەســـتێرەی گۆڕستان ، ئەســتێرەی مردووان ، ئەفســـانەی ناو كــوردەواری دەڵێ هەموو كەسێك ئەستێرەیێكی هەیە، كە ئەو كەسە بمــرێ ئەستێرەكەی دەڕژێ ، لێــرەدا وەكو ئەستێرەكان هەموویان لــە گۆڕســتانێكدا كــۆ بووبنەوە وایە .

**ئەندەر** : لــە نــــاو ، دەروون ، مەیان ، ناوەڕاست ، ناوەوە .

**ئەنگووتن** : (١) شنە ، شنەی با . (٢) پێكاندن ، نیشــان كــە لە جێی خۆی بدرێ .

**ئەنوار ( انوار )** : كۆی ( نوور = نور )ە ، بڕوانە ( نوور ) .

**ئەنواع ( انواع )** : كۆی (نەوع = نوع) ە ، بڕوانە ( نەوع ) .

**ئەنوەر ( انــور )** : ڕووناكتـــر ، درەوشاوەتر ، ڕۆشنتر .

**ئەنهار ( انهار )** : كۆی ( نەهر = نهر )ە ، ڕووبار ، زێ .

**ئەهالی ( اهالی )** : كۆی (ئەهل = أهل)ە ، بڕوانە ( ئەهل ) .

**ئەهلی ئەدەب** : (١) ئەو كەسانەی خەریكی ئەدەبن ، نووســــەران ، شاعیران ، زانایان (٢) ئەو كەسانەی خوو و ڕەووشتی چاكیان هەیە .

**ئەو** : ناوەڵناوەی كەسی سێیەمی تاكە بۆ نێرو مێ بەكار دەهێنرێ .

**ئەوێستا** : ئێستاكە .

**ئەوێستە** : بڕوانە ( ئەوێستا ) .

**ئەوبار ( أوبار )** : (١) كۆی (وەبەر = وَبَر)ە ، خوریی ووشتر ، هەموو قوماشــێكی لە خــوریی ووشــتر دروست بكــرێ .(٢) خــواردن ، خواردن و بــردنی زۆر ، قــووت دان .

**ئەوج ( اوج )** : (١) بڵندی ، بالا ، بڵندترین جێگە ، بەرزتــرین پلە . (٢) لە زاراوەی هەیئەتدا بڵند ترین پلەی ئەستێرەیە ، دژی ( حەزیز = حضیض )ە .

**ئەوخوارە** : ئــەو جێیــەی لــەو نزیكەوەیە ، جێیێكی نزیكی وا ئەگەر ئادەمزاد بیەوێ ســەری بدا زۆری پێ ناچێو دێتەوە .

**ئەوراق ( اوراق )** : كۆی ( وەرەق = وَرَق )ە ، بڕوانە ( وەرەق ) .

**ئەوراقی خەزان** : گەڵای پاییز ، بۆ زەردیو سیسیو ژاكاویو بەرەو مردن چوون بەكار دەهێنرێ .

**ئەوزاع** : كۆمەڵی خەڵك ، تیرە .

**ئەولاد (اولاد)** : كۆی (وەلــەد = وَلَد )ە ، كوڕ ، نەوە ، منداڵ .

**ئەووەل ( أوّل )** : ســــەرەتا ، یەكەم ، یەكەمین ، دونیای یەكەم .

**ئەووەلین (اوّلین)** : (١) پێشینان . (٢) یەكەمــین ، ئەوانــەی كــۆن ، كۆنەكان .

**ئەهل ( اهـل )** : (١) شـــايان ، خاوەن ، پســـپۆر . (٢) خێزان ، خانەوادە ، بنەماڵە .

**ئەهلی تەریق** : سۆفی، دەروێش، مورید ، شێخی تەریقەت ، پێڕەوی کەری تەریقەتی سۆفی .

**ئەی** : ووشەی بانگ‌کردنە .

**ئەی خودا** : خودایا ، خودایە !

**ئەیمەن ( أیمن )** : (١) لای ڕاست ، ڕاست . (٢) پیرۆز ، چاك و بەفەڕ .

**ئەیوان** : (١) هەیـوان ، تاق ، دەروازە . (٢) تاقی کیسرا لە مەدائین لە نزیك بەغداوەیە ، بڕوانە (شەققی ئەیوان) .

**ئەیوانی کەیوان** : تاقی زوحەل ، بڕوانە ( کەیوان ) .

**ئەییام ( أیّام )** کـۆی ( یەوم = یوم )ە ، بڕوانە ( یەوم ) .

**ئیبتیدا ( ابتداء )** : ســـــەرەتا ، دەست پێ‌کردن .

**ئیبنولحاجیب ( ابن‌الحاجب )** : ( ١١٧٤ز–١٢٤٩ز ) عوسمان کوڕی عومەر کوڕی ئەبوبەکر کوڕی یوونس، لە نەژاددا کوردە ، لـە ( ئەسنا )ی سەعیدی میسر لە دایك بووە ، لە قاهیـرەو شـــام ژیـــاوە ، لـــە ئەسکەندەری‌یە مردووە ، یەکێکە لە زانا هەرە گەورەکانی زانستی‌یەکانی ئیسلام ، لە نووسینە هەرە گرنگەکانی ( کافیە ) لە نەحوو ، ( شافیە ) لە سەرف ، ( موختەسەر ) لە فیقھ ، ئەمانــە لــە شـــەست بـــەرگدا نووسراونەتەوە ، جگە لە دەیەها کتێبی تر بە جۆرێ زانستی نەبــووە نەچێتە ناوی‌و بە سەرکەوتوویی لێ‌ی نەیێتە دەرێ .

**ئیبنوموقلە ( ابن‌مقلة )** : (٨٦٦ز –٩٤٠ز) ، محەمـــەد کوڕی عەلی‌ی کوڕی حوســێن کوڕی موقلــەیە ، وەزیرو شاعیرو نووسەر بووە ، خەت خۆشێکی بێ هاوتا بووە ، لە بەغدا لەدایك بووە ، ماوەیێــك موقتەدیر کردی بە وەزیری خۆی ، بەڵام لــە دوواییدا شار بەدەری وولاتی ئێرانی کرد ، لە پاشانا قاهیر بیللا هێنایەوە وەزارەت ، بەم جۆرە چەند جارێك لــە نێــوان بەندیخانــەو وەزارەت ڕۆژگـــاری بـــردە ســـەر ، دەستی ڕاستیان بڕی‌یەوە ، قەڵەمی بــە قۆڵی‌یــەوە دەبەســتو پــێ‌ی دەنووسی ، لە پاشانا زمانیان بڕی ، لە بەندیخانە کۆچی دوواییکرد .

**ئیحتیاج ( احتیاج )** : پێویستی ، ئاتاج ، نیازمەند بوون ، نیازمەند .

**ئیحرام ( احرام )** : (١) دوو پارچە قوماشـــی ســـپی‌ی نـــەدووراوە حاجی‌یان لە حـــەجدا یەکێکیـــان لە کەمـــەر دەئاڵێنن‌و ئەویتـــریان بە خۆیـــاندا دەدەن . ٢) لـــە حەرەم هاتنە دەرەوە . (٣) حەرام کردنی شـــتێك ، نەخـــواردنی شـــتێك . (٤) حـــەرام کـــردنی هەنـــدێ شتی حەڵاڵ لـــە پێش زیارەتی کەعبـــە بە چەند ڕۆژێك .

**ئیحسان (احسان)** : چاکە کردن ، بەخشین ، پیاوەتی نوواندن بەرامبەر کەسێك .

**ئیحیا ( احیاء ) :** کۆی ( حەی = حیّ )ە ، (١) زینـــدوو ، زینـدوو کردنەوە ، دژی مردن. (٢) ئاوەدانی، گوند ، گەڕەك ، هەوار .

**ئیخلاف ( اخلاف ) :** بەڵێنی بـە درۆ ، بەڵێن نەهێنانە دی، جێبەجێ نەکردنی پەیمان ، وەعدی بە درۆ .

**ئیخوانوسسەفا ( اخوان‌الصفا ) :** کۆمەڵەیێکی سیاسی ـ ئایینی بوو بە بیرو بـاوەڕی ئیســماعیلی خـۆی دەردەخســت ، لـە دەرو بـەری (٩٨٣ز) لە بەسـرە دروست بوو . بیرو ڕای فەلسەفی‌یان زۆر ئاشکراو ڕوون نی‌یـە ، بەڵام بـیری یۆنانی‌و ئێرانی‌و هیندی ڕێیــدا ئاشکرایە . بـیرو ڕای خۆیان لـە (٥٢) کتێبدا تۆمار کردووە ، نویشکی ئەوەیە کە : جیهان لە خوداوە پەیدا بووە ، خودا هۆی هەموو ڕووداوێـکە ، بە ڕیز ئەمانەی لێ پەیدا بووە : بیر ، گیان ، ماددەی یەکەم ، تەبیعەت ، جسم ، چەرخ‌و فەلەك ، جەوهەر . زانیاری لـە بابـەت بـیرو ڕاو تەئسـیری سیاسی‌یان هێشتا هەر کەمە .

**ئیدی :** ئیتر .

**ئیددیعا ( ادّعـاء ) :** داوا کردن ، ویستنی شتێك ، شکات کردن لـە دادگادا .

**ئیرەم :** (١) ناوی باخ یا شارێکە گۆیا شەدداد دروستی کرد بە نـاوی ئەوەی ببێتە بەهەشتی سەر ڕووی زەوی ، لەبـەر ئەوە « بەهەشـتی شەدداد »یشی پێ دەڵێن . (٢) ناوی عەشیرەتێکە لـە هۆزی عاد خـودا غەزەبی لـێ گرتن لـە بەر گونـاهی زۆریان ، ئەم ڕووداوانە لە قورئان‌دا باس کراوە . (٣) ئـەو بەردەیە کە لەسـەر ڕێـگە و شەقامـەکان‌دا دادەنـرێ بۆ ڕابـەری هـاتو چۆکەران .

**ئیزهار ( اظهار ) :** دەرخســتن ، ئاشکرا کردن ، بەیان کردن ، ڕوون کردنەوە .

**ئیسبات ( اثبات ) :** دەرخستنی ڕاستی ، ڕوون کردنەوەی شتێك کە گومانی تێدا نەمێنێ .

**ئیستیتاعە (استطاعە) :** توانایی، قابلییەت ، سەرمایە .

**ئیستیعلا (استعلاء) :** بڵند بوون .

**ئیسلام ( اسلام ) :** (١) ئایینـــی موسوڵمانان لە دەورو بەری ســاڵی (٦١١ز) بە هۆی محەمەدی کـوڕی عەبدوڵڵا بڵاو بووەوە ، لە پێشانا لە ناو عـەرەب ، ئنجا لەنـاو هەنـدێ نەتـەوەی تریش . (٢) خۆدان بـە دەستەوە ، چوونە ناو ئاشتی‌یەوە ، بوون بە موسوڵمان .

**ئیسم ( اسم ) :** ناو .

**ئیسناد ( اسناد ) :** نـەژاددان ، گەڕاندنەوەی شتێك بۆسەر شتێکی‌تر ، گەڕاندنەوەی قسە بۆ ئەو کەسەی کە کردبێتی ، گەڕاندنەوەی حەدیس بۆ پێغەمبەر .

**ئیش :** کار .

**ئیشارات ( اشارات )** کـــۆی ( ئیشارەت = اشارە )یە ، بڕوانـە ( ئیشارە ) .

**ئیشاره ( اشاره )** : (١) پیشـــان دانی شتێك بە هـۆی بزووتنـەوەی چاو یا ئەنـگوست ، قسەکردن بـە ڕەمز ، قســەکردن بە کینایـەت . (٢) لە زاراوەی زانستیی بەدیـعدا ئەوەیە کە شاعیر بە ووشە وێنەی زۆر دروست بکا .

**ئیشارەت (اشارت)** : بڕوانـــە ( ئیشارە ) .

**ئیشاللا ( ان شاءالله )** : ئــەگەر خودا حەز بکا ، ئەگەر خودا بیەوێ .

**ئیشتیباه ( اشتباه )** : گومان ، هەڵە ، یەکێك لە جێی یەکێکی تر دابنرێ بە هەڵە ، یەکێك لە باتیی یەکێکی تر بگیرێ ، کارێك بە هەڵە بە ئەنجام بگەیێنرێ .

**ئیشتیاق ( اشتیاق )** : ئـارەزوو کردن ، ویستن ، شەوق کردن .

**ئیشراب ( اشراب )** : (١) ئاودان ، دەرخوواردانی ئاو. (٢) پیشـان‌دان، ئیشارەت کردن، پیشان‌دان بەقسەو کردەوە .

**ئیشراق (اشراق)** : ڕووناك بوون ، ڕۆشـن بـوون ، بریقـــەدان ، بریسکەدانەوە ، ڕۆژهەڵاتن ، ئیلهام وەرگرتن .

**ئیعتیبار ( اعتبار )** : (١) پەنـــد وەرگرتن لە هەموو هەڵەیێك ، بـە چاوێکی بەرز تەماشای شت کردن . (٢) باوەڕ کردن، ڕاستیو دروستی، ئابڕوو و نرخو پلەی کۆمەڵایەتی .

**ئیعجاز ( اعجاز )** : نەتووانین لـە هێنانەدی کار ، هێنانەدی کارێـك کە زۆربـەی هەرە زۆری خەڵـکی بۆیان نەکرێ .

**ئیفتیخار (افتخار)** : شـــانازی کردن ، ناز کردن .

**ئیفتیرا ( افتراء )** : بە درۆ تاوان بۆ کەسێك دروست بکرێ .

**ئیفك (الافك)** : درۆ ، گونـاه ، خەتا ، بوختان ، خراپە ، خستن ، زاڵبوون .

**ئیقبال ( اقبال )** : (١) پێشـوازی کـردن ، ڕوودان . (٢) بـــەخت ، چارەنووس ، تاڵع .

**ئیقتیزا (اقتضاء)** : پێـویست ، خوواستن ، شتێك پێویستیی بـە شتێکی تر بێ .

**ئیکمال ( اکمال )** : تەواوکردن ، گەیاندن بە ئامانج .

**ئیلاه ( اله )** : **خـودا** ، ئـەوەی دەپەرسترێ .

**ئیلاهی** (١) خودایا! ئەی خودا ! . (٢) خودایی .

**ئیلتـاف ( الطـاف )** : نـــەرمی نوواندن ، چاکە کردن .

**ئیلتافی سوبحانی** : چاکەی خودا، ڕەحمەتی خودا .

**ئیلتیجا ( التجاء )** : پەنابردن ، داوای یاریدە کردن ، خۆ هاوێشتنە بەخت بۆ ڕزگاربوون لە کارەساتێك .

**ئیلتیقا ( التقاء )** : بـە یەکتـری گەیشتن ، یەکتری بینین ، بە دیداری یەکتری شاد بوون .

**ئیلحاح ( الحاح )** : زیـــاد لـە

پێویست داوای شتێك كردن ، هەوڵدانی زۆر بۆ گەیشتن بە ئامانجێك ، داوێن بەرنەدان .

**ئیلا ( الا )** : تەنیا ، مەگەر ، جگە .

**ئیمام ( امام )** : پێش نوێژ ، پێشەوا ، پێشڕەو .

**ئیمان ( ایمان )** : باوەڕ ، عەقیدە ، دژی کوفر .

**ئیمتیاز ( امتیاز )** : (١) جودا بوون ، بوونی شتێك یا جێگەیێك كە خەڵكی تر نەیبێ . (٢) ڕێگە دانی دەوڵەت بۆ دروست كردنی كارخانەو فابریقە ، دەركردنی ڕۆژنامەو گۆڤارو شتی تر .

**ئیمتیحان ( امتحان )** : تاقی كردنەوە .

**ئیمتیسال ( امتثال )** : سەردانەواندن ، بە قسەكردن ، ئیتاعەت كردن .

**ئیمداد ( امداد )** : یاریدەدان ، یارمەتی دان ، بەهانا گەیشتن .

**ئیمكان ( امكان )** : (١) توانایی بەرامبەر بە كارێك ، ڕێگە خۆش كردن . (٢) لە زاراوەی زانستیی فەلسەفەدا ، ئەو شتەیە كە « بوون »و « نەبوون »ی وەكو یەكەو پێویست نییە وەكو ئینسان ، جانەوەر ، كشتوكاڵ ، بێ گیان ، بەرامبەر ئەوە « ووجووب » هەیە كە «بوون»ی پێویستە ، وەكو ( واجب الوجود ) ئەمە كۆمەڵی ئینسانو جانەوەرو كشتوكاڵو بێ گیانە .

**ئینتیباه (انتباه)** : ئاگاداری ، ووشیاری ، بێداری .

**ئینتیخاب (انتخاب)** : هەڵبژاردن ، هەڵبژاردنی شتێك لەناو شتێكی تر ، هەڵبژاردنی یەكێك لەناو كۆمەڵێك بۆ كارێكی تایبەتی .

**ئینتیزار ( انتظار )** : چاوەنواڕی كردن ، چاوەڕووانی كردن ، چاو لە ڕێ بوون .

**ئینجاح ( انجاح )** : سەرخستنی هەموو شتێك لە كارو بارێك ، گەیاندنی هەموو كارێك بە ئەنجام ، پیرۆز بوون .

**ئینس ( انس )** : ئادەمزاد ، ئینسان ، خەڵك ، بەشەر .

**ئینسان ( انسان )** : (١) ئادەمزاد ، خەڵك ، بەشەر ، مرۆ . (٢) بیبیلەی چاو ، بیلبیلەی چاو .

**ئینسانی هەرزە** : كەسی بێ هوودە ، كەسی بێ كارە ، كەسێك بە قووڵی تەماشای ژیان نەكا و بیر لە گوزەران نەكاتەوە .

**ئینشا ( انشاء )** : دروستكردن ، داهێنان ، ووتنی قسەی جووان ، نووسینەوەی قسەی جووان ، لە خۆوە شت داهێنان .

**ئێستە** : لەم سەردەمە ، لەم كاتە ، لەو كاتەی قسەی لێ دەكرێ .

**ئێستر** : گیاندارێكی چووار پێیە بۆ بار كێشان بە كار دەهێنرێ ، لە پەڕینی نێرەكەر بە سەر ماییندا پەیدا دەبێ ، وە خۆی نەزۆكەو

یەوەی نی‌یە ، هێستر ، قاتر ، قانتر .

**ئێسقان :** ماددەیێکی ڕەقە دەبێتە بنچو بنیاد بۆ دروست بوونی پەیکەری هەموو گیانداریێك ( ئینسانو چوارپێ ) ، ئێسك ، هێسك .

**ئێش :** ئازار ، ژان .

**ئێشان :** بڕوانە ( ئێش ) .

**ئێمە :** ئاوەڵناوی کەسی یەکەمی کۆیە ، کۆی « من »ە .

**ئودەبا ( ادباء ) :** کۆی ( ئەدیب = ادیب )ە ، نووسەر ، شاعیر ، زانا .

**ئوسووڵ ( اصول ) :** کۆی ( ئەسڵ = اصل )ە ، بنج ، بناغە ، بنیاد ، دەستوور ، قانوون .

**ئوفتادە** (١) هاتنە خوارەوە لە سەرەوە بەرەو زەوی ، لە زەوی نزیك بوونەوە . (٢) زەبوون ، پەككەوتوو بۆ پیری بێ توانا بە کار دێ .

**ئولف ( الفَت ) :** (١) خوو و ڕەووشت گرتن ، فێربوون ، ڕاهاتن. (٢) دۆستایەتی، هاودەمی.

**ئومەرا (أمراء) :** کۆی (ئەمیر = امیر )ە ، فەرماندە ، فەرمانڕەوا ، میر .

**ئومێد :** هیوا ، ئامانج ، ئارەزوو.

**ئوممێد :** بڕوانە ( ئومێد ) .

**ئوموور ( امور ) :** کۆی ( ئەمر = امر )ە ، بڕوانە ( ئەمر ) .

**ئۆخەی :** ووشەیێکە لە کاتی گەیشتن بە ئامانج بە کار دەهێنرێ یا بیستنی خەبەرێکی خۆش .

**ئۆخخەی :** بڕوانە ( ئۆخەی ) .

## ب ـ B

**با :** (١) هەوا ، هەوای بزووتوو . (٢) بە ، خاوەن ، لەگەڵ ، وەکو : با کەمال . (٣) ووشەی دوعایە لە مەسدەری « بوون » ، وەکو : با بژی ، با بمری .

**باب :** (١) باوك . (٢) دەر ، دەرگا، دەرگە ، دەرکە ، دەروازە . (٣) بەشێك لە کتێب .

**بابی عەییار :** یەکێکە لە ئەفسانەی ناو کوردەواریدا ڕەنگی داوەتەوە ، بڕوانە ( عەییار ) .

**بابی ڕەزا :** خانەی ڕازی بوون ، ئەو شتە یدەبێتە هۆی ڕازی بوون و دان پێدا هێنان .

**بابی گوشایش :** دەرگای فراوان ، خانەی فراوانی ، ژیانی پڕ لە ئاسوودەو خۆشی ، گەشایی .

**باب زەن :** شیشی کەباب ، شیشی ئاسن یا دار ئەوەی گۆشتی پێوە دەکرێو لەسەر ئاگر دەبرژێنرێ .

**باتیل (باطِل) :** ناهەق، ناڕاست، بێهوودە ، پووچ ، دژی هەق .

**باتین (باطِن) :** (١) نهێنی ، شارراوە ، پەنهان ، لە ناوەوە ، لە

ژوورەوە . (٢) دەروونی هەموو شتێك ، ناوەوەی هەموو شتێك .

**باخە** : کیسەڵ ، ڕەقە .

**باد** : بڕوانە ( با ) .

**بادام** : باوی ، بایوو ، درەختێکە گەڵای درێژو باریکە ، گوڵدەکاو بەری خڕو درێژکۆلەو سەوزو ناسكو ترشە ، ئەمە چەقالە یا چووالەی پێ دەڵێن ، لە پاشانا قاووغەکەی ووشك دەبێتەوەو دەبێتە دارو ناوکەکەشی دەمەیێ ، تامی خۆشە ، لە ئەدەبیاتدا لەگەڵ چاودا بەراوورد دەکرێ .

**بادامی چاو** : چاوی وەك بادام .

**بادان** : لوولدان ، سووڕدان .

**بادی** : (١) بایی ، لەخۆ بایی . (٢) هەموو شتێکی سەر بە « با » . (٣) سەرەتا ، دەست پێکەر .
**بادی هەوا** : بێ ئەنجام ، بێسوود ، بێ نرخ ، بەلاش ، بێ دەرامەت ، مفت .

**بار** : (١) هەموو شتێکی کە کۆبکرێتەوەو لەسەر پشتی چوارپێ یا هەر شتێکی تر دابنرێ‌و بۆ گوواستنەوە ئامادەبێ . (٢) زۆر ، قورس . (٣) ئەو پەڵە ووشکییەیە کە دەنیشێتە سەر لێو ، باری لێو ، لێو بە بار کینایەتە بۆ ڕەنجەڕۆو هەناسە ساردو بەمراز نەگەیشتوو . (٤) جار ، کەڕەت .

**باران** : دڵۆپی ئاوە کە لە ئەنجامی سارد بوونی هەڵم لە هەوادا پەیدا دەبێ‌و بۆ سەر زەوی دێتە خوواری .

**باراوی** : نیسبەتە بۆ ( باراو ) ، گوندێکە لە گوندەکانی ناوچەی سرووچك ( بەرزنجە ) ، لە بنچدا بنەماڵەیێکی سەیدانی بەرزنجەیی بووەو لەوان بوونەتەوەو ئەم ناوەیان وەرگرتووە .

**بارەوەر** : بە بەر ، بەردار ، هەموو شتێکی بەرو مایەی هەبێ .

**باری ( باریء )** : خوودا ، پەروەردگار ، ( باری تەعالا = باری تعالی ) : خودای گەورە .

**بارید ( بارد )** : سارد ، فێنك .

**باریعام** : وەزعی گشتی .

**باریق ( بارق )** : بە شەوق ، ڕووناك ، بریقەدار ، درەوشان ، ئەوەی ڕۆشایی‌و ڕووناکی دەدا ، هەوری برووسکەدار .

**باریك** : لەڕ ، ناسك ، تەنك ، دژی ئەستوور .

**بارین** : هاتنە خووارەوەی باران ، هاتنە خووارەوەی بەفر .

**بارش** : هاتنە خووارەوەی بەفر یا باران لە ئاسمانەوە ، باران ، بڕوانە (بارین) .

**بارگیر** : بڕوانە ( ئێستر ) .

**باز** : (١) هەنگاوی درێژو بەرین ، بەیەك هەنگاو پەڕینەوە لە ئاوێك یا بەسەر شتێکدا . (٢) باری ، گەمە ، وازی ، وەرزین . (٣) سێ بازو یەك

باز ناوی وەرزیێکە لە کوردەواریدا بەتایبەتی لەناو فەقێیان لەسەردەمی بەهاردا لە سەیراندا دەکرێ . (٤) یەکێکە لە باڵندە گۆشت خۆرە ڕاوکەرەکان ، خاوەنی دەنووکێکی کەوانیو نینۆکی تیژو بەهێزە ، بەزۆری لە شاخدا دەژی ، باڵندەو گیانداری بچووك ڕاو دەکا ، لە کۆندا بۆ ڕاوکردن بەخێویان دەکرد ، لە پێش ڕاوکەردا دەنێررا بۆ دۆزینەوەی نێچیر .

**بازاڕ** : بازێڕ ، جێگەی کڕینو فرۆشتنی هەموو شتێکی پێویست ، جێگەی کۆبوونەوەی کڕیارو فرۆشیار ، لە پێشانا شتومەکیان لەسەر سەکۆ دادەنا ، لە پاشانا دوکان پەیدا بوو .

**بازاڕی** : (١) جەڵەبی ، چرووك ، خراپ . (٢) خەڵکی بازاڕ ، فرۆشیار .

**بازاڕی ڕیسوایی** : شۆنی ئابڕوو چوون ، جێگەی کەوتنو نزم بوونو ناو زڕنگاندن .

**بازانە** : وەکو باڵندەی باز ، ئازایانە ، چاپوکانە ، چالاکانە ، زرنگانە .

**بازی** : یاری ، گەمە ، وازی ، وەرزین .

**بازوو** : قۆڵ ، باهوو .

**بازن** : دلج ، خشڵ یا شتێکە لە زێڕو زیوو مەعدەنی ترو شووشە دروست دەکرێ ژنان بۆ جووانی لە دەستو مەچەکیان دەکەن .

**باس ( بحث = باث )** :
(١) لێدووان، گێڕانەوەی ڕووداوێك کە پێوەندی بە کەسێك یا شتێکەوە هەبێ . (٢) لێکۆڵینەوە .

**باسیرە ( باصِرە )** : چاو ، دیدە ، ئەندامی بینین .

**باسك** : ئەندامی نێوان مەچەکی دەستو ئانیشك .

**باعیس ( باعِث )** : هۆ ، سەبەب ، عیللەت .

**باغ** : بێستان ، ئەو زەوییەیە کە پەرژین بکرێو هەموو جۆرە دارو درەختێکی لێبڕوێنرێ .

**باغات** : کۆی (باغ)ە ، بڕوانە ( باغ ) .

**باغەوان** : پاسەوانی باغ ، ئەو کەسەیە کە پیشەی پەروەردەکردنی گوڵو دارو درەختی باغە .

**باغی سێوان** : کینایەتە بۆ سینگو مەمك ـ سینگ باغەو داری سێویش تێیدا سێوی گرتووە کە مەمکەکانی دلبەرە .

**باغچە سەرا** : باغی کۆشكو باڵەخانە .

**باغی** : لەخۆدا نەترس ، زۆردار ، سەرکێش ، گەردەنکەش .

**باقی** : (١) نەمر ، جاوید ، پایەدار ، ئەوەی ماوە ، ئەوەی لە جێگەی یەکێکی تر دەمێنێتەوە . (٢) ماوەی شتێك کە لە شتێکی تر دەردەهێنرێ .

**باقییە (باقیە)** : مێی (باقی)یە ،

( باقی‌یاتی سـالیحات = باقیات الصالحات ) : کردەوەی چاك ، کاری باش ، بڕوانە (باقی) .

**باڵ** : ئەنـدامی فڕین‌و پـەرەواز کردنە لە لەشی باڵندە.(۲) دەست‌و بازووی ئادەمزاد لەسەر شانەوە تا سەر ئەنگوست .

**بـالا** : (۱) سـەر ، سـەرەوە ، بلنـدی ، بـەرزی ، دژی ژێـرو خووارەوە . (۲) قەدو قامەت .

**بام** : بەیانی ، بەیانی زوو ، نزیکی ڕۆژهەڵات ، سپیدە .

**بامیداد (بامداد)** : بڕوانە (بام) .

**بان** : (۱) سەربان . (۲) دارێـکە سەوزو ناسك‌و خۆش بۆ ، بەری لە فستق دەکا ، ڕۆنێکی بۆن خۆشی لێ‌دەردەهێنرێ ، بە دەنکەکانی دەڵێن ( حەببولبان = حب البان ) ، لە بەر بلندی‌و ڕێکی‌و لووسی لە شیعردا لەگەڵ قـەدو باڵای خۆشـەویست بەراوورد دەکرێ .

**بانات** : کۆی ( بان )ە ، بـڕوانە ( بان ) .

**بانکـوت** : بانکـوش ، پـارچە دارێکە لە شێوەی خاکەناز دروست دەکرێ بـەڵام کلکـەکەی کـورت‌و دەمەکەی پانـە ، بـۆ کوتانـەوەی گوسەبانە بە کار دەهێنرێ .

**بانگ** : (۱) هـاوار ، دەنـگ . (۲) دوعاو دەنگێکە لەسەر منارەوە بە ئاواز دەخوێندرێتەوە بۆ ئاگادارکردنی خەڵکی بۆ نوێژکردن .

**بانگە بانگ** : دەنگە دەنگ ، هاوار بـردن ، هانـا بـردن ، داوای یاریدەکردن .

**بانگ‌کردن** : گازکـردن ، هاوار کردن ، ئاگادار کـردنی کەسێك بۆ ئەوەی بێتە پێشەوە یا کارێك بکا .

**باوەڕ** : ئیمان ، عەقیدە ، ئیعتیقاد کردن بە شتێك ، قسەیێك یا شتێك بچێتە دڵەوە .

**باوەشێن** : شتێکی پان و تەنکە لە گەڵای داری خـورما یا شتی‌تر دروست دەکرێ ، بە ڕاوەشاندن و بزواندن‌و سووڕاندنەوەی بای فێنك دروست دەکا .

**باوك** : باب .

**بـە** : بەهێ ، بەی ، بێ درەختێکە لە داری سێو دەکا ، بەری زەردو ئاودارو درشت ترە لە سێو ، بۆنێکی خۆش‌و تامێکی تایبەتی‌ی هەیە ، لە پاییزاندا دەگا .

**بەبار** : (۱) زۆر . (۲) بەبـەر ، بەردار .

**بە بلندی** : هێندەی بلندی ، بـە قەدەر بلندی .

**بـەت ( بَط )** : (۱) مـراوی . (۲) سوراحی‌ی مەی .

**بە تەمابوون** : چاوەڕووان بوونی شتێك ، بڕیاردان بۆکردنی شتێك .

**بە چاوی سووك** : بایەخ نەدان بە شت ، کەم‌کردنی نرخی ڕاستەقینەی

شت ، شتێك لە خۆی کەمترو بچووکتر ببینرێ .

**بە حەق** : بە ڕاستی .

**بە حیسابێ** : بە ڕاستی ، بە بە ووردی .

**بەحر** : (١) زەریا ، دەریا ، دەلیا . (٢) کێشی شیعر ، ژمارەی بەحری شیعر نۆزدەیە : تەویل ، مەدید ، بەسیت ، وافیر ، کامیل ، هەزەج ، ڕەجەز ، ڕەمەل ، مونسەریح ، موزاریع ، موقتەزەب ، موجتەس ، سەریع ، جەدید، قەریب، خەفیف ، موشاکیل ، موتەقاریب، موتەداریك؛ جگە لەمە زانایانی عەرووز یازدە بەحری تریشیان دۆزیوەتەوە : عەریز ، عەمیق ، حەریم ، کەبیر ، موززەیەل ، قەلیب ، حەمید ، سەغیر ، ئەسەم ، سەلیم ، حەمیم .

**بەحرەین** : دوو بەحر ، دوو دەریا ، کینایەتە بۆ دوو چاوو فرمێسکەکانی ئەوەندە زۆرن دوو بەحر دروست دەکەن .

**بەحری فیرعەون** : ڕووباری نیل ، بڕوانە ( نیل ) .

**بەحری موحیت** : بڕوانە ( موحیت ) .

**بەحس ( بحث )** : بڕوانە (باس) .

**بەخیل ( بخیل )** : چاو برسی ، چاو تەنگ ، قرچۆك ، ڕەزیل .

**بە خۆڕایی** : بێنرخ ، بەلاش ، شتێك بە بێ بەرامبەر چنگ بکەوێ .

**بەخشا ( بەخش )** : (١) بەش ، بەهرە ، نەسیب . (٢) بەخشین ، لێبووردن ، عەفوو کردن . (٣) دیاریدان ، نیشانکردن ، بە بالآبڕین .

**بەخشان** : بڕوانە ( بەخشا ) .

**بەد** : خراپ ، بێفەڕ ، ناپەسند ، دژی چاك .

**بەداو** : داودار ، شتێك داوی زۆر تێدا بێ ، داوی ڕاو ، زولفی بەداو ، ئالۆز .

**بەدێ ( بدا )** : دیارکەوتن ، پەیدابوون ، دەست پێکردن ، سەرەتا .

**بەد ئەختەر** : بەد بەخت ، بەختڕەش .

**بەدەخشان** : ناوی ناوچەیێکە لە تورکستانی ئەفغانستاندا کە بە لەعل بەناوبانگە ؛ هەروەها بە مانای لەعلیش هاتووە .

**بەدەر** : جگە ، بێجگە ، شتێك لە ناو شتێکی تر بچێتە دەرەوە .

**بەدەل** : (١) جێگر ، لە باتی ، نرخ ، شتێکە جێگەی شتێکی تر بگرێتەوە . (٢) چاوێر ، پلەبەرز .

**بەدەن** : لەش ، تەن ، جەستە .

**بەد خوو** : بەد ڕەووشت ، سەرسەری ، بێ ئەدەب ، بێ ئەخلاق .

**بەدر ( بدر )** : مانگی چواردە ، مانگی تەواو .

**بەدری دوجا (بدر الدجی)** : مانگی چواردە شەوی زۆر ڕووناك — **دوجا** : تاریکی ، کە مانگی چواردە

له ناو تاریکی‌دا بێ دیاره خۆی زۆر ڕووناکو بریقه‌دار ده‌بێ .

**به‌د ناو** : بێ ئابڕوو ، ڕیسوا ، که‌سێکی ناوو ناوبانگی خراپی هه‌بێ .

**به‌د ناوی** : بێ ئابڕوویی ، ڕیسوایی ، ناوو ناوبانگی خراپ .

**به‌ر** : (۱) بن ، ژێر ، پێش ، له‌به‌ر ، به‌رامبه‌ر . (۲) به‌رهه‌می هه‌موو کشتوکاڵێك به‌تایبه‌تی دارو دره‌خت . (۳) تووکی ده‌وروبه‌ری ئه‌ندامی مێینه‌ی ژنو ئه‌ندامی نێرینه‌ی پیاو .

**به‌رابه‌ر** : به‌رامبه‌ر ، وه‌ك یه‌ك .

**به‌رات** : مووچه‌و یارمه‌تی‌دانێکی ساڵانه‌یه ده‌وڵه‌مه‌ند بۆ هه‌ژاری ~~بۆ هه‌ژاری~~ ده‌بڕێته‌وه ــ شه‌وی به‌رات : شه‌وی پازده‌ی مانگی شه‌عبانه به پێی ساڵنامه‌ی هیجری .

**به‌ری ( بریء )** : بێ تاوان ، بێ گوناه ، پاك ، دژی تاوانبار .

**به‌رین** : پان ، فراوان .

**به‌رجه‌سته** : بڵند ، به‌رز ، که‌سی گه‌وره‌و به‌ناوبانگ .

**به‌رد ( بَرد )** : (۱) سه‌رما ، ساردی ، دژی گه‌رما . (۲) شتێکی ڕه‌قو سفتو قورسو به‌هێزه ، له سه‌ر ڕووی زه‌وی‌و ناو زه‌وی‌دا زۆره ، هه‌موو ڕه‌نگی هه‌یه .

**به‌رده باران** : به‌رد تێ‌گرتن ، به به‌رد له که‌سێك یا شتێك بدرێ .

**به‌رده‌باز** : ئه‌و به‌رده‌یه که له ناو جۆگه‌له داده‌نرێ بۆ په‌ڕینه‌وه .

**به‌رده ڕه‌ش** : (۱) به‌ردی ڕه‌ش . (۲) ( حجر الأسود )ی عه‌ره‌بی به کوردی .

**به‌ردی عه‌جووز ( برد العجوز )** : سه‌رمای پیرێژن ، به پێی ساڵنامه‌ی مه‌سیحی‌ی ڕۆژئاوا له (۱۰)ی مانگی مارت ده‌ست پێ‌ده‌کا .

**به‌ردولعه‌جووز ( برد العجوز )** : بڕوانه ( به‌ردی عه‌جووز ) .

**به‌رراق ( برّاق )** : بریقه‌دار ، شه‌وقدار ، تیشکدار ، زۆر ڕووناك .

**به‌رز** : بڵند ، گه‌وره ، شکۆ .

**به‌رزنجی** : مه‌به‌س سه‌یدو شێخانی گوندی « به‌رزنجه »یه له ناوچه‌ی سلێمانی ، وا ده‌گێڕنه‌وه که له ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی پازده‌مینی زایین شێخ مووساو شێخ عیسا دوو برا بوون هاتنه ئه‌و ناوچه‌یه‌و له به‌رزنجه جێ‌نشین بوون ، به ناوی ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌رو شێخایه‌تی‌و ته‌ریقه‌تی ده‌روێشی قادری ناوو ناوبانگ‌و ده‌سه‌ڵاتیان په‌یداکرد ، به ناوبانگترین که‌سێکی ئه‌م بنه‌ماڵه‌یه شێخ مه‌حموودی شۆڕشگێڕ بووه ، له پێناوی مافی کوردو کوردستان‌دا خه‌باتی کردووه .

**به‌ریقه‌لبه‌سه‌ر ( بَرق البصر )** : نیگا ، تیشکی چاو ، نووارین ، ڕووانین ، بزووتنه‌وه‌ی چاو .

**به‌رق** : برووسك ، ڕووناکی .

**به‌رگ** : (۱) په‌ڕه‌ی گوڵ ، گه‌ڵای گوڵ ، په‌لکی گوڵ . (۲) په‌ڕه‌ی کاغه‌ز ، کتێبێکی جزوو به‌ند کراو ،

بەشێك لە كتێبێكی زۆر گەورە .
(٣) جل ، جلك ، هەموو شتێكی كە ئادەمزاد بۆ لەبەركردن‌و پۆشین بە كاری بهێنێ .

**بەرگی مەرگ‌و ماتەم** : جلی ڕەش ، جلی شین ، ئەو جلەی بۆ پرسەو تازیە لە بەردەكرێ .

**بەرگ‌و بار** : (١) پۆشتە ، گوشاد . (٢) ئەو پارچە قوماشی ڕەنگاوڕەنگ‌و شتومەكانەیە كە بە ئالای سەر گۆڕی پیاو چاكاندا دەكەن .

**بەرگ‌و تووك** : (١) جل . (٢) پەڕی باڵندە كە وەكو جل وایە بۆی .

**بەر هاویشتن** : (١) مندال لە بارچوون ، مندال بوون لە ناوەختدا بە مردوویی . (٢) سووبوونەوە ، خەفەت خواردن .

**بەڕ ( برّ )** : بیابان ، سارا ، زەوی‌ی ووشك ، چۆل ، ووشكایی .

**بەڕە ـ بەڕ** : جۆرە ڕایەخێكی ناو ماڵە لە خوری دروست دەكرێ‌و لە كوردستاندا پیشەسازی‌یێكی نایابە .

**بەز** : چەوری ، ئەو چەوری‌یەی ناوەوەی مەڕو ماڵاتە كە لە دەورو بەری وورگ‌و ڕیخۆڵەكانی‌یەتی .

**بەزلە ( بذله )** : قسەی خۆش ، قسەیێك كە دڵ بكاتەوە .

**بەزلە گۆ (بذله گو)** : ئەو كەسەی قسەی خۆش دەكا .

**بەزم** : جەژن‌و ئاهەنگ ، كۆبوونەوەی خۆش ڕابواردن، كۆڕی خواردنەوەو سەرخۆشی .

**بەزمی تەماشا** : ئاهەنگی بینینی لەنجەولار ، بینینی سەردەمی خۆشی‌و ڕابواردنی بەختیاری .

**بەزمی ڕەندان** : ئاهەنگ‌و خۆشی كەسی زیرەك‌و چاپوك‌و فێڵبازو بێباك‌و ئەو كەسەی بۆ ئێستای دەژی‌و بیر لە سبەینێ ناكاتەوە ، بڕوانە ( ڕەند ) .

**بەزمی هەزار** : ئاهەنگ‌و زەمزەمەی بلبل .

**بەس** : (١) زۆر ، گەلێك . (٢) وەستان ، دەست لە كار هەڵگرتن . (٣) بەڵام .

**بە سەری كاكم** : سوێندێكە بەتایبەتی كچ‌و كیژۆڵە بە سەری برا گەورەیان دەخۆن .

**بە سەر هاتن** : (١) ڕۆیشتن لە سەر سەر ، ڕۆیشتن بە سەر . (٢) ڕووداو ، قەوماو .

**بەسەڕ ( بصر )** : چاو ، بینایی ، بینین ، هەست كردن بە بینین .

**بەسیت ( بسیط )** : (١) ئاسان ، فراوان ، سادە ، ساكار . (٢) لە زاراوەی زانستی‌ی شیمیا هەموو شتێكی كە مورەككەب نەبێ‌و بەشی تێدا نەبێ ، هەموو شتێكی جوزئی وەكو كولل وابێ : زێڕ ، زیو ، مس. (٣) لە زاراوەی زانستی‌ی عەرووز ناوی بەحرێكە كێشی ( مستفعلن فاعلن مستفعلن فاعلن )ە .

**بەست ( بسط ) :** فراوان کردن ، پانکردنەوە .

**بەستە :** (١) دەستە ، دەسك . (٢) بەند کردن ، سفت کردن ، لە یەکتری نزیك کردنەوە .

**بەستەی کەمەند :** بە کەوان بەستراو .

**بەستەیی هەودا:** دەستەی ئاوریشم ، کینایەتە بۆ زولف .

**بەستە زمان :** زمان بەستراو ، بێ دەسەلات ، کۆلەوار ، هیچ نەزان ، گیانداری بێ دەسەلات .

**بەستن :** (١) گرێدان ، پێچان ، بە یەکتری یەوە قایم کردن . (٢) بوونی ئاو یا هەر شلەیێکی تر بە سەهۆل . (٣) دانان ، دامەزراندن ، کۆنگرە بەستن، کۆڕبەستن، حەلقە بەستن، کۆبوونەوەی دەروێشان بۆ زیکرو تەهلیلە . (٤) مووی سەر یا زولفی ژن کە بە گوریزە دەبێ لە سەر ڕوومەت یا شانو مل بە ئالۆزیو خوارو خێچی خۆی دەنوێنێ .

**بەشارەت (بشارت) :** مژدە ، هەواڵی خۆش ، خەبەری شادی .

**بەشەر :** ئادەمزاد ، مرۆ ، مەردوم .

**بەشەرهاتن :** لە یەکتری دان ، بە گژ یەکدا چوون .

**بەشیر :** (١) ئەوەی موژدە دێنێ ، موژدەدەر ، ئەوەی هەواڵو خەبەری خۆش دێنێ ، یەکێکە لە ناوەکانی محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان .

(٢) شیردار ، ئەوەی شیری هەیە ، ئەوەی شیری زۆرە .

**بەشووش (بشوش) :** ڕوو خۆش ، دڵ خۆش ، دەم بەخەندە ، دەم بە بزە ، دەم بە پێکەنین .

**بەعز (بعض) :** هەندێ، پارچەیێك لە شتێك .

**بەغدا (بغداد) :** ناوی شارێکە ئەبوو جەعفەری مەنسووری خەلیفەی عەبباسی لە (٧٦٢ز)دا لە سەر ڕووباری دیجلە لە وڵاتی مێزۆپۆتامیا دروستی کرد ، هێرشی مەنگۆلەکان لە ساڵی (١٢٥٨ز) وێرانی کرد ، تەیموووری لەنگ لە ساڵی (١٤٠٠ز) تاڵانی کرد ، لە ساڵی (١٦٣٨ز) تورکە عوسمانی یەکان داگیریان کرد ، لە دەورو بەری جەنگی جیهانی یەکەم کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیز ، لە پاش جەنگ بوو بە پایتەختی دەوڵەتی عیراق . ووشەی ( بەغدا ) ووشەیێکی ئێرانی یە « بەگ‌داد » واتە (خودادات) یا (خووادە) .

**بەفر :** دەنگی سپی ی شەش پەڕ یا شەش لقی یە ، لە لۆکە دەکا ، لە زستاندا لە ئاسمان دەبارێ ، لەو کاتەی کە پلەی گەرمایی لە ئاسماندا کەمتر لە سفر دەبێ ، هەڵمی ئاسمان دەیبەستێو دێتە خوارێ .

**بەقا (بقاء) :** مانەوە ، هەمیشەیی، تێك نەچوون ، نەمردن .

**بە قەد :** بە قەدەر ، هێندەی .

**بەقەم :** دارێکە بڵند و گەورە ،

گەڵای لە گەڵای دار باوی ( بـادام ) دەکا ، گوڵی وورد و بەری خڕ و سووره ، لقەکانیشی ڕەنگیـــان سووره ، ڕەنگی سووری لێ دروست دەکرێ بۆ ڕەنـــگ کردنی خوری و ئاوریشم و هەموو جۆره قوماش .

**بەقیــع (بقیـع)** : (١) نـــاوی گۆڕستانێکه لە مەدینه ، یەکێکه لەو شوێنه پیرۆزانـەی کـه حاجی‌یـان زیارەتی دەکەن . (٢) جێگەیێکی کە دارو درەختی زۆرو ڕەنگاو ڕەنـگی لێ بێ .

**بەقییه (بقیّه)** : ماوه ، پاشماوه ، ئـــەوەی لە مــــەیو شـــەراب دەمێنێتەوه .

**بەکەم گرتن** : بە سووکی تەماشا کردن ، بایـەخ نەدان ، بـە نزمی تەماشا کردن .

**بەکرەجۆ** : کێلگەیێکه بە دە کیلۆ مەترەیێك لە شـاری سلێمانی‌یەوه دوورەو کەوتۆتە لای ڕۆژئاوای لــە سەر ڕێگەی کەرکووك ، بەشێك لە ئـاوی ســەرچناری بـۆ دەچـێ ، ڕووبـارو کێلـگەکە بەکـــرەجۆی پێ‌دەڵێن .

**بەلقیس** : ناوی شاژنی مەملەکەتی ســەبایه ، بـە جـوانیو شـکۆو زیرەکیو عەیاری ناوی دەرکردووه، گۆیا چۆتە لای سلێمان پێغەمبەر بۆ ئەوەی هونەری خـۆی بۆ بنوێنێو حیکمەتی لێ‌وەربگرێ ، ئنجا شووی پێ‌بکا ، لـــە قورئـانـدا بـاسی لێوەکراوه . بڕوانه ( سلێمان ) .

**بەڵا (بلاء)** : ڕەنج ، گرفتــاری ، ئاسیب ، کارەسات ، موسیبەت .

**بەڵا گـەردانی بالا** : لـــە دەور گەڕان ، بە قوربان بوون ، گەڕاندنی قـۆچی قوربانی بـە دەوری ئـەو کەسەی کە بۆی دەکرێ بە قوربـانی لە پێش سەربڕینی .

**بەڵێ** : ووشـەی وەڵامـه ، بـه مانای ( ئا ) ، دژی ( نا ) .

**بەڵکو** : بەڵام .

**بەم** : بە ئەم ، بە ئەمە .

**بە مەرگی تۆ** : سوێند بــە ژیانی تـۆ .

**بە مەرگی تۆ قەسەم** : بــڕوانە ( بە مەرگی تۆ ) .

**بەم و زیر** : بەم ــ ئـاوازی پڕو درشتو ئەستووره کە لەتارو عوودو ئالەتی تری مۆسیقا دەردەچێ ، ئەو تەلەی ئەم جۆره ئاوازه دەردەهێنێ ؛ زیر ــ ئاوازی خاوو ووردو باریك ، دژی ( بەم )ە ، پێـکەوه بە شێوەی ( بەمو زیر ) یا ( زیلو بەم ) بە کار دەهێنرێ .

**بەم ڕەنگە** : بـەم جـۆره ، بەم شێوەیه ، ئاوا .

**بەند** : (١) حەپس ، ئەو زنجیرو کۆتەیە کە لە دەستو پێی تاوانبار دەکرێ لـە بەندیخـانه ، زنجـیرو پێوەندی ئـاژاڵ . (٢) بەشێك لـە کتێب یـا دەسـتوورو قانـوون . (٣) جومـگە ، جێـگەی بـە یـەك گەیشتنی دوو ئێسقان لە لەش‌دا . (٤) بەنداو ، سەددە ، دیوارێك لە

بەرد یا دار دروست بکرێ بۆ گرتنی بەری ئاو . (٥) دەستەیێك کاغەز لە فابریقە ژمێررابێ‌و بەسترابێ .

**بەندە** : نۆکەر ، عەبد ، غولام ، بەند ، ئەو کەسەی بە پارە بکڕدرێ ، دژی ئازاد . (٢) بۆ ڕیزگرتن لە باتی (من) بە کار دەهێنرێ ئەگەر قسەکەر لەگەڵ یەکێکی گەورە بدوێ .

**بەنی** : منداڵان ، نەوە .

**بەنی ئادەم** : ئادەمزاد ، ئادەمیزاد، نەوەی ئادەم ، خەڵك ، ئینسان ، مرۆ .

**بەها** : نرخ ، قیمەت .

**بەهار** : یەکێکە لە چووار کەژەکانی ساڵ ، بەپێی سالنامەی ڕۆژئاوایی ئەم کەژە دەکەوێتە مانگەکانی مارت‌و نیسان‌و مایس ، لەم کەژەدا گیاو گوڵ دەڕوێ‌و دارو درەخت چرۆ دەداو سەوز دەبێ .

**بەهەشت** : جەننەت، فیردەوس ، باخێك کە لە خۆشی‌و تەڕی‌و سەوزی وێنەی نەبێ ، ئەو جێگەیەیە کە ئیمانداران لە پێش مردندا هەمیشە بیری لێ دەکەنەوە کە لە پاش مردن ببێتە مەڵبەندی‌یان، دژی دۆزەخە کە جێگەی گوناهکارانە بە پێی بیرو باوەڕی ئایین .

**بەهلوولی (بالوولی)** : (١) نیسبەتە بۆ (بەهلوول) ، بالوولی دانا ، ناوی کەسێکی ڕووخۆش‌و شێتۆکەو زۆر زان‌و زیرەك بووە ، لە سەردەمی هارونی ڕەشیددا ژیاوە . (٢) شێواو ، پەشێو ، دێوانە ـ زولف بە هلوولی : زولفی شێواو .

**بەو** : بە ، بە ئەو ، بە هۆی ئەو ، لە ڕێگەی ئەوەوە .

**بەو پێیە** : بەو جۆرە .

**بەی** : بەهێ ، بڕوانە ( بە ) .

**بەیاز (بیاض)** : (١) سپی ، سپی‌یەتی . (٢) دەفتەر ، دەفتەری باغەڵ ، دەفتەری شیعر .

**بەیازی دەفتەر** : کاغەزی دەفتەر، ئەو پەڕە کاغەزانەی لە کۆندا شیعریان لە سەر دەنووسرا ، دەفتەری شیعر کە بە درێژی دەکرێتەوە .

**بەیان** : (١) قسەی ڕەوان‌و جووان‌و بێ‌گرێ ، قسەی ڕوون‌و ئاشکرا . (٢) ڕوون کردنەوە ، ئاشکرا کردن . (٣) کۆتایی شەوو سەرەتای ڕۆژ ، ڕووناکی‌ی پێش ڕۆژهەڵات .

**بەیانات ( بیانات )** : کۆی (بەیان= بیان )ە ، بڕوانە ( بەیان ) .

**بەیت (بیت)** : (١) ماڵ ، خانوو ، خانە ، جێگەی ژیان‌و حەسانەوە . (٢) ماڵی خودا ، کابە ، کەعبە . (٣) دێڕی شیعر کە لە دوو نیوە دێڕ شیعر یا ( میسراع = مصراع ) پێك هاتووە .

**بەیتی باری** : ماڵی خودا ، کەعبە .

**بەیتی عـەتیق (البیت العتیق) :** ماڵی خودا ، کەعبە .

**بەیتی عەنکەبووت (بیت‌العنکبوت):** ماڵی جاڵجاڵۆکە، داوی جاڵجاڵۆکە.

**بەیتی مەعموور (البیت المعمور) :** باڵاخانە یا مزگەوتێکە لە ئاسمان لە سەرووی کەعبەوەیە .

**بەیتوڵلا (بیت الله) :** ماڵی خودا ، کەعبە .

**بەیتولحـەزن ( بیت الحـزن ) :** (١) مەڵبەندی خەم‌و ناسۆر ، هەموو جێگەیێکی کە خەم‌و نالەباری لێ‌بێ . (٢) ئەو ژوورەیە کە یەعقووب تێیـدا دەژیا و لە دووریی یووسفی کوڕی دەتلایەوە و لە شین و ناسـۆر و واوەیلادا بوو . ( بیت الاحـزان ) و (کولبەیی ئەحزان )یشی پێ دەڵێن.

**بەیدا (بیداء) :** بیابـان ، چۆڵ ، سارا .

**بەیدەر :** خەرمـان ، خەرمەن ، خەرمانی جۆ یا گەنم .

**بەیدەق :** (١) ڕابەری سەفەر ، ڕێـگە پیشـاندەری سـەفەر . (٢) نـاوی یەکێـك لە بـەردەکانی شەترەنجە . (٣) سەربازی پیادە ، عەسکەر .

**بەیز ( بَیْض ) :** هێلکە .

**بەیزا (بیضاء) :** مێی ( ئەبیەز = أبیض)ە ، سپی ، پێست سپی .

**بەیزاوی (البیضاوی) :** عەبدوڵلا کوڕی عومـەری کوڕی محەمـەدی، کوڕی عەلی شـیرازی ناسیروددینی بەیزاوی ، لە شاری بەیزا لە نزیك شیراز لە دایك بووە ، قازی‌و زاناو خاوەن تەفسیری قورئان بووە ، لە شیراز قازی بووە ، لە تەورێز ژیاوەو هەر لەوێش مردووە ، لە نووسینە هەرە گرنـگەکانی دەبێ تەفسـیری ( انوار التنـزیل واسرار التـأویل ) دەست نیشان بکرێ کە بە تەفسیری بەیزاوی ناوی دەرکردووە ، کتێب‌و نووسینی تریشی زۆرە بە عەرەبی‌و فارسی ، لە (١٢٨٦ز) کۆچی دوایی کردووە .

**بەیزە (بیضە) :** بڕوانە (بەیز) .

**بیئیزنیللا (باذن‌الله) :** بە یارمەتیی خودا ، بە خواهشتی خودا ، ئەگەر خودا بیەوێ .

**بیجادە :** عەقیـق ، کارەبـا ، جەواهیر، جۆرە یاقووتێکی سوورە .

**بیحەمدیللا (بحمدالله) :** ڕستەیێکە بۆ سوپاسی خودا بە کار دەهێنرێ .

**بیـد :** (١) بی ، درەختێـکی بێ بەرە ، لقەکانی ڕاست‌و بڵندن ، لە جێگەی فێنك‌و ئاوداردا دەڕوێ ، گەڵای تاڵەو زوو ووشك دەبێ ، بە عـەرەبی سەفسـافی پێ‌دەڵێـن . (٢) کۆی (بەیدا = بَیْداء)ە ، بیابان ، چۆڵ ، دەشتی کاکی بە کاکی .

**بیدی مەجنوون :** (١) شۆڕە بی ، شەنگە بی ، یەکێکە لـە جۆرەکانی درەختی بی ، لقەکانی بەرەو زەوی شۆڕ دەبنەوە . (٢) نـاوی مێش‌و مەگەزێکە .

**بیستن :** گۆ لێ بوون .

**بیعەیِنی ( بِعَینِهِ )** : خـۆی ، وەکو خۆی بە بێ دەسکاری .

**بیعسەت ( بعثت )** : نـاردن ، پەیام ، ناردنی کەسێك بۆ هێنانەدی کارێکی گەورە .

**بیکر (بکر)** : کچ ، ژنی نەسمراو ، ژنی کون نەکـراو . (٢) نۆبەرە ، سەرەتاو یەکەمی هەمـوو شتێك ، یەکەمین منداڵی باوك یا دایك .

**بیلال (بلال‌الحبشی)** : بیـلال کوڕی ڕەباحی حەبەشی ، بانگدەری نۆژو ئەمینداری ماڵی پێغەمبەر بوو، ڕەنگی ڕەش‌و بە باڵا درێژو بە تەن لاواز بوو ، یەکەمین کەسی وولاتی حەبەشستان بوو، بوو بەموسوڵمان، کە پێغەمبەر کـۆچی دووایی کـرد بیلال دووا بانگی داو ئیتر وازی لە بانگدان هێنـا ، لە دووا سـاڵانی ژیانی‌دا چووە شام‌و لەوێ لە ساڵی (٦٤١ز) کۆچی دووایی کرد .

**بیم** : ترس ، دوو دڵی ، واهیمە ، وەسواسە .

**بیمار** : بڕوانە ( نەخۆش ) .

**بینایی** : بینین ، بینا ، یەکێکە لە پێنج حاسسەکە ، کاری بینینی شت کە بە چاو دێتەدی .

**بینین** : بڕوانە ( بینایی ) .

**بـێ** : (١) وەرە . (٢) نی‌یـە ، ووشەی نەفی‌یە .

**بێ باك** : بێ تـرس ، بێ پەروا ، بەرەڵلا .

**بێ‌بەقا** : ئەو کەسەی تا سەر لـە سەر کار و قسەی خۆی نابێ ، ئەو کەسەی بەردەوام نابێ لــە قسە و کردەوەی ، ئەوەی بەڵێن نایێنێتــە جێ .

**بێ پەردە** : ئاشـکرا ، دیـار ، بینراو .

**بێ چارە** : بێ نەوا ، بێ دەرمان ، ناگزوور .

**بێ حاڵ** : نەخۆش ، ناڕەحەت ، پەژمـردە ، سـەرە مـەرگ ، بـێ دەرامەت .

**بێ حورمەت** : بێ ڕیز ، بێ قەدرو قیمەت ، بێ جێگەو شۆن .

**بێـدار** : نەنووسـتوو ، خـەو لێ‌نەکەوتوو ، کەسێکی کـە خەوی نەبێ .

**بێداری** : نیسبەتە بۆ (بێدار)، بڕوانە ، (بێدار) .

**بێ دڵ** : دڵدار، عاشق ، شەیدا.

**بێزار** : ئەو کەسەیە کە لە شتی بەدو نابـەجێ دوور دەکەوێتەوە ، ڕاکـردوو لە کاری خـراپ ، دوور کەوتنەوە لە هەموو کارو کردەوەیێکی کە نەچێتە دڵەوە .

**بێزاری** : نیسبەتە بۆ (بێزار) ، بڕوانە (بێزار) .

**بێژتن (بێژین)** : گوتن ، ووتن .

**بێ ستوون** : (١) بێ کۆڵـەکە ، ئاسـمان ، چـەرخ‌و فەلـەك . (٢) بێستوون : نـاوی شاخێکە بە (٢٤کم) لە کرماشانەوە دوورە لـە سەر ڕێگەی کرماشان ــ هەمەدان ،بە فەرمانی دارای سێ‌یەمین شاهنشای

هەخامەنشی ( ٤٨٦-٥٣٢ پێش ز ) بەسەرهاتی پێشووی لە سەر هەڵکەندراوە ، ئەم شاخە پێوەندی بە ڕووداوەکانی دلداری « شیرین و خوسرەو » و « شیرین و فەرهاد »ەوە هەیە ، بڕوانە ( شیرین ) .

**پێش** : زۆر ، گەلێك .

**بێ شوبهە** : بێ گومان ، بێ شك .

**بێ شك** : بێ گومان .

**بێ فەڕ** : ناشیرین ، تاریك ، درشت ، بێ کەڵك .

**بێگانە** : نەناس ، غەریب ، خەڵکی دەرەوە ، کەسێك خەڵکی وڵاتێکی تر بێ ، دژی ئاشنا .

**بێڵ** : پێمەرە .

**بێن** : بۆن ، عەبیر .

**بێ نەوا** : بێ چارە ، بێ سەرو سامان ، بێ توانا ، بەدبەخت .

**بێ وەفا** : بێ بەڵێن ، بێ پەیمان ، ئەو کەسەی پەیمان ناهێنێتە دی ، ئەو کەسەی چاکە لەگەڵ دۆست ناکا ، ئەو کەسەی خراپە لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکا کە چاکەی لەگەڵدا کردووە .

**بێ هوودە** : (١) بێ سوود ، بێ کەڵك، ڕەنجبەخەسار. (٢) ناڕاست. ناهەق .

**بوت ـ بت** : سەنەم ، پەیکەرێکە لە بەرد یا دار یا مەعدەن یا هەر شتێکی تر لە شێوەی ئینسان یا شتی تر دروست دەکرێ بۆ پەرستن. (٢) دلبەرو خۆشەویست.

**بوتخانە** : (١) جێگەی بوت ، ئەو جێیەی بوتی لێ دادەنرێ . پەرستشگای بوتان ، بوتستان . (٢) حەرەم ، جێگەی ژیانی ژنانی پادشایان .

**بوخار ( بخار )** : هەڵم .

**بوخەلا (بخلاء)** : کۆی (بەخیل = بخیل)ە ، بڕوانە ( بەخیل ) .

**بوختی** : جۆرە ووشترێکی بەهێزی باڵا بەرزو دوو کۆهانەیە بە زۆری ڕەنگی سوورە لە هەندێ شوێنی خوراسان و ئاسیای ناوەڕاستدا دەژی .

**بوراق ( بُراق )** : ئەو ئەسپەیە کە پێغەمبەر لە شەوی میعراجدا سوواری بوو و پێی چووە ئاسمان بۆ بارەگای خودا .

**بورووج (بُروج)** : کۆی (بورج = بُرج)ە ، بڕوانە (بورج) .

**بورج** : (١) هەر یەکێك لە دووازدە بەشی فەلەك کە زەوی لە دەوری‌یان دەسووڕێتەوە ، هەر کاتێك کە زەوی یەکێکیان دەبڕێ مانگێکی خورشیدی تەواو دەبێ ، بەم پێیە بورجەکان دووازدەن بەرامبەر دووازدە مانگ : بەرخ ، گا ، دوو پەیکەر، قرژاڵ ، شێر ، گوڵەگەنم، ترازوو ، دوو پشك ، کەوان ، کار، دەوڵك ، نەهەنگ . (٢) کۆشك ، قەڵا ، بینای بڵندی خڕ ، یا چووار گۆشەیی کە بۆ پاسەوانی بە کار دەهێنرێ . (٣) هێلانە کۆتر .

**بورجی سەما** : بورجی ئاسمان ، بروانە (بورج) .

**بورد** : (١) سوود ، قازانج ، کەلك ، ئەوەی ئادەمزاد لە قومار دەیباتەوە . (٢) ئەو ماوەیەیە کە تیر یا گوللە دەیبڕێ‌و ئیتر سارد دەبێتەوەو دەکەوێ . (٣) جۆرە قوماشێکی میل میلە لە کەتان دروست دەکرێ .

**بوردی یەمەن** : قوماشێکی کەتانی‌یە لە چاکترین جۆری بورد دەژمێررێ‌و لە وولاتی یەمەن دروست دەکرێ .

**بورد بار** : کەسی ئارام گرتوو ، کەسی بە سەبرو تەحەمول .

**بورهان** : ڕوون کردن ، بەڵگە ، دەلیل ، حوجەت .

**بوزورگ** : گەورە ، مەزن ، کەسی بەڕێزو پایەدار .

**بوعد ( بُعْد )** : دووری ، دوور بوونەوە ، دوور کەوتنەوە .

**بوغز ( بُغْض )** : کین ، قین ، ڕق ، دوژمنایەتی .

**بوکا ( بکاء )** : گرین ، گریان ، گریە .

**بولهەوەس (بلْهَوَس ـ بوالهَوَس)** : دێوانە ، شێتۆکە ، پڕ هەوەس .

**بووەتە** : بووە بە .

**بوهتان** : درۆ ، ئیفتیرا ، بوختان ، بە درۆ هەڵبەستنی قسە بە زمانی یەکێکی ترەوە .

**بووریا ( بورياء )** : حەسیر ، هەموو ڕایەخێکی لە قامیش‌و لقی دار خورما دروست کرابێ .

**بوو عەلی سینا** : ئیبن سینا ، ئەبوو عەلی‌ی حوسێن کوڕی عەبدوللایە ، ناوی دایکی « ستارە » بووە ، لە ساڵی (٩٨٠ز) لە دایک بووەو لە ساڵی (١٠٣٦ز) لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە . ئیبن سینا یەکێکە لە گەورە ترین زانایانی نەتەوە موسوڵمانەکان‌و ڕۆژهەڵات‌و هەموو جیهان خەریکی هەموو زانستی‌یە کلاسیکی‌یەکانی کۆن بووە بەتایبەتی قانوون‌و فەلسەفەو پزیشکی .

**بووقەلەموون** : عەلی شیش ، بۆقلەموون ، تەلەموون .

**بووك** : ئەو کچەیە کە تازە شووی کردووە .

**بووگی** : بووی بە شێوەی سنەیی زمانی کوردی لە چاووگی ( بوون )ە ـ بووگی بە سەرگەلە : بووی بە سەرگەلە .

**بووم** : (١) کوندەبوو . (٢) جێگە، ماڵ ، شار ، وولات ، سەرزەمین .

**بووم ئاسا** : وەکو کوندەبوو ، کینایەتە بۆ ڕەش‌بینی‌و ماتەمی‌و کارەسات‌و تاریکی‌و ژیانی ناو خەرابەو وێرانە .

**بۆ** : بۆن ، عەبیر .

**بۆتە** : (١) قاپێکی بچووکی قووڵە بۆ تواندنەوەی زێڕ یا زیو یا هەر

مەعدەنێکی تر بــە کار دەهێنرێ . (٢) گیایێکی بە لق‌و بــەرگە زۆریش گەورەو بەرز نی‌یــە . (٣) جــۆرە نەخش‌و نیــگارێکە لە ســەر پارچە قوماش یا جــل یا هەر شــتێکی تر دەکێشرێ . (٤) زولف ، گێسوو .

**بۆچ** : بۆ ، لە بەر چی ، ووشەی پرسیارە .

**بۆز** : بۆر ، خۆڵەمێشی ، ڕەنگی ڕەش‌و سپی تێکەڵ .

**بۆس** : ماچ .

**بۆسە** : بڕوانە (بۆس) .

**بۆس‌و کەنار** : مــاچ‌و مــووچ ، کەسێك لە پڕو لــە لاوە بــگیرێ‌و ماچ بکرێ .

**بۆستان** : گولستان ، گولزار ، باخ ، باغ .

**بۆستانی ئیرەم** : بڕوانە (ئیرەم) .

**بۆق** : گیانــدارێکی بچــووکە ، تەڕو لنجە ، چووار پێ‌ی هەیە ، لە سەر زەوی‌و لــە ئاودا دەژی ، بە هەڵبەزین‌و قونە دەڕوا .

**بۆم** : بۆ من .

**بۆن** : عەتر ، گوڵاو .

**بۆیە** : لە بەر ئەوە .

**بچووك** : گچکە ، وورد .

**بخوور** : شــتێکی وەکو سەمغ‌و کەتیرە وایە دەخرێتە ئاگرەوەو بۆنی خۆش دەدا ، بخورد .

**بــرا** : کوڕێك لەگــەڵ کچێك یا کوڕێکی تر لە باوك‌و دایکێك بن ، ئەو کوڕە برای کوڕەکەیە یاکچەکەیە.

**برەو** : هەڕمێن ، ڕەواج .

**برین** : زەخم ، زام .

**برینار** : زامدار ، ئەو کەسەی برینی هەیە .

**برۆ** : خەتێکی کەوانی‌یە لە موو لە خوواررووی نێوچــەوان‌و سەرووی چاو شین دەبێ .

**بردن** : وەرگرتن ، گواستنەوەی شت لە جێگەیێك بۆ جێگەیێکی تر .

**برژان** : سووتان ، لێنانی گۆشت بە ئاگر .

**برسی** : ئــەو کەســەی ئاتــاجی خواردنە .

**بریان ــ بریانی** : بــرژاو ، بــە کەباب بوون ، سووتانی گۆشت .

**بریشم تەنی** : تەنینــی پارچــەی ئاوریشــم ، چنینــــی پارچــــەی ئاوریشم .

**بڕین** : (١) کەرت‌کردن ، پارچــە کردن . (٢) وەستان ، وەستاندن .

**بڕشت** : بڕین .

**بڕیاو** : براو .

**بژ** : تووکی زۆری زبرو بەهێز .

**بژانگ** : برژانگ .

**بفەرما** : بفەرموو ، فەرموو .

**بگرە بــەردە** : بگــرەو بــەردە ، کێشمەکێش ، گیروگرفت .

**بلــوور** : بەللــوور ، جــۆرە

شووشـــەیێکی ڕوونو بێ گـەردە ، کریستال .

**بلوورین :** وەکو بلوور .

**بلبل ـ بولبول :** باڵنـــــدەیێکی بچـووکو دەنگ خۆشە لـە بەهارو هاوینان‌دا لە سـەر دارو درەختو گوڵ دەنیشێتەوە ، عیشقی بلبـلو گوڵ لە ئەدەبیاتی جیهان‌دا مایـەی بەرهەمی ئەدەبی بووە ، هەزار .

**بلند :** بەرز ، باڵا .

**بلندی :** بەرزی .

**بلا :** با ، بام ، دەبا .

**بلاو :** بەڕاگەنـدە ، شـتێك لـە یەکتری دووربکەوێتەوە .

**بلێسه :** گلپە ، هاڵاو ، هەڵاو .

**بلق :** بۆشایی‌یێکە لـە با لە ناو شتی شلی وەك ئاو .

**بن :** ژێر .

**بنـــازم :** شــــانازی بـــکەم ، شانازی‌کـردن ، شـــانازی پێـوە کردن .

**بنەفشه :** بنەوشە ، وەنەوشە ، گیایێکی کورتە ، لقی باریكو گـوڵی ووردی بچووکی هەیە ، ڕەنگی شین یا زەردە ، لە باخچەدا دەچێنرێو لە بەهارانیش‌دا لـە پێش هەمـوو گوڵێـکی تر پەیـدا دەبـێ ، بـۆنی خۆشـە .

**بنواره :** بڕوانە ، بڕۆنە ، بنۆڕە ، تەماشابکە ، سەیرکە .

**بنیاد :** بنیات ، بنـج ، بناوان ، بناغە ، نـەژاد ، ئەسـڵ ، پایـە ، جەوهەر ، بن ، ئەساس .

**بونیان ( بُنیان ) :** بنیاد ، بنج ، بنجو بناوان، بناغە ، پایە، کۆڵەگە .

**بیـــا :** وەرە ، ڕســـــتەیێکی فارسی‌یە .

**بیابان :** دەشت ، سارا ، زەوی‌ی ڕاستو بێ‌گرێو بێ‌ئاوو شینایی . (٣) شەق لێدان بە پێ ، ڕامالین ، دامالین ، جنێودان .

## پ = P

**پا :** پێ .

**پایەخت :** پایتەخت ، ئەو شارەیە کە جێ‌نشینی مـــەلیك یا ســەرەك کۆمارو دەستەو دایەرەی دەوڵەتە .

**پاچ :** شتێکە بۆ کێلانی زەوی بە کـار دەهێنـرێ ، ئاسـنێکی سـێ سووچی لـووت تیژە بـە دار قایم کراوە .

**پادشاه :** فەرمانـڕەوای بەهێزو توانـاو خـاوەن تـەختو تـاج ، ســولتان ، مەلیك ، شـەهریار ، خدێوی ، خوسـرەو ، قەیـسەر ، قەراڵ ، پاشا .

**پار :** ساڵی ڕابردوو .

**پاراو :** (١) تێرئاو، هەموو شتێکی تەڕو تێر ئاو . (٢) سافـو بێ‌گەرد .

**پاره :** (١) پارچە ، بەش ، هەندێ لە شـتێك . (٢) پـوول ، فلس ، دینار ، درهەم کاغەز بێ یا مەعدەن .

**پارچه :** (١) قوماش ، بەشێ لە

قوماش . (٢) بەش ، هەندێ لە شتێك ، کەرتی شت .

**پارچەلۆك :** بچووکی پارچە ، پارچەی بچووك ، کینایەتە بۆ پەڵە هەور ، بڕوانە (پارچە) .

**پاڕانەوە :** هانابردن ، داوێن گرتن ، تکا کردنی کەسێکی بێ دەسەڵات لە کەسێکی بە دەسەڵات بۆ شتێك .

**پاسار :** (١) گۆسەوانە ، تارمە . (٢) تەختەیێکی ئەستوورو گەورەیە دارتاشان لە سەرەوەو خوارەوەو ناوەڕاست بە شێوەیێکی پان تەختەیێکی تەنكو ناسك لە ناوەڕاستەوە لێی قایم دەکەن . (٣) شەق لێدان بە پێ ، ڕامالێن ، جنێودان .

**پاساری :** جۆرە چۆلەکەیێکە .

**پاش :** (١) پژاندن ، بژێن ، بڵاوکردنەوە ، ڕژاندن ، بڕوانە ( نەمەك پاش ) . (٢) پشت ، دووا ، شتێك لە دووای شتێکی تردا بێ ، دژی پێش .

**پاك :** بێگەرد ، بێ غەش ، بێ خەوش ، پاکیزە ، داوێن پاك ، پاك داوێن .

**پاڵان :** بڕوانە ( کورتان ) .

**پاڵانی :** ئەسپی بارکێش ، ئەو ئەسپەیە کە کورتانی لە سەر پشت دادەنێن . ناوی عەشیرەتێکی کوردە .

**پاڵوو :** (١) کەلەکە ، ئەو بەشەی زینو کورتانە کە دەکەوێتە بن کلکی وڵاخەوە . (٢) بالووکە .

**پان :** فراوان ، بەرین .

**پاوانە :** خرخاڵی منداڵ ، خلخاڵی منداڵ ، خشڵێکی زەنگولەدارە لە زێڕ یا لە زیو دروست دەکرێ بۆ منداڵان بە کار دەهێنرێ ، خرخاڵی زێڕ یا زیوی ژنان .

**پایان :** دووایی، ئەنجام ، کۆتایی ، بن .

**پایە :** (١) هەموو شتێکی لە پێ بچێ ، پایەی مێزو کورسی . (٢) بنیاد ، بنج ، بناغە . (٣) ڕیز ، ڕوتبە ، پلەی کۆمەڵایەتی بەرز .

**پاییز :** یەکێکە لە چووار کەژی ساڵ ، سێ مانگی پێش زستانە ، بە پێی ساڵنامەی مەسیحی ئەوروپا مانگەکانی ئەیلوولو تشرینی یەکەمو تشرینی دووەم دەگرێتەوە ، کەژی گەڵاڕێزان ، خەزان .

**پەتك :** گوریس ، پەت .

**پەراسوو :** ڕیزە ئێسقانێکی کەوانەییە لە ڕاستو چەپی ئینسانو گیانداردایە ، لە پێشەوە بە ئێسقانی سینگو لە پشتەوە بە مۆرغەی پشت بەستراوون .

**پەری :** کەسێکی ئەفسانەیییە لە شێوەی ژنێکی یەکجار جوواندایە ، وەکو فریشتە باڵی هەیە ، لە جووانیدا دژی دێوە ، ژنی جووان لەگەڵ ئەودا بەرامبەرو بەراوورد دەکرێ .

**پەرێشان :** پەراگەندە ، بڵاوبوۆوە ، ئاڵۆز ، بەرشو بڵاو ، دەست تەنگ ، بێ نەوا ، لە ئەدەبیاتدا بۆ زولفی ئاڵۆزو شێواو بە کار دەهێنرێ .

**پەرێشانی** : پەرِاگەندەیی ، دەست تەنگی ، بێ نەوایی .

**پەرچەم** : (١) قژی سەر نێو چەوان ،کاکۆڵ . (٢) دروشم ، ئەو قوماشەیە کە بە دارەوە دەکرێو دروشمو نیشانەی وولاتێك یا لەشکرێك یا تیپێك یا ڕێکخراوێکە . (٣) ئەو جێیەیە لە گوڵدا کە تۆوی لێیە .

**پەرچەم پەشێوان** : ئەوانەی پەرچەمیان پەشێواوە ، جووانان ، نازداران ، کچانو ژنانی جووان .

**پەردە** : ڕووپۆش ، سەرپۆش ، شاررِاوە ، پارچەیێکە لە پەنجەرە یا دەرگا یا هەر شتێکی تر دەگیرێتەوە، یا هەر پارچەیێك کە لە ژوورێکدا بگیرێتەوە بۆ ئەوەی بیکا بە دوو لا .

**پەردەو کینایەت** : قسەیێك کە مانای ڕووکەشو دیاری مەبەس نەبێ بەڵکو بۆ مانای تر بە کار بهێنرێ ، بەلاغەت لە قسەکردندا .

**پەرژین** : دیوارێکە لە قامیش یا دارودەوەن یا هەرشتێکی تر بە دەوری باخدا دروست دەکرێ بۆ پاراستنی .

**پەرستن** : ستایش کردن ، بەندەییکردن ، خزمەت کردن .

**پەرش** : بڕوانە ( پەرشو بڵاو ) .

**پەرشو بڵاو** : پەرِاگەندە .

**پەروانە** : (١) پەپوولە ، دوو جۆرە ، یەکەمیان ڕەنگاو ڕەنگە لە دەوری گوڵ دەسوورِێتەوەو لە سەر پەرِەکانیدا دەنیشێتەوە ؛ دووەمیان لە یەکەمیان بچووکترە بە شەو لە دەوری مۆمو چرا دەسوورِێتەوە تا دەسووتێ ، پەپوولەی شەویشی پێ دەڵێن . (٢) بە هەموو ئالەتێکی پەردار دەووترێ کە لە دەوری خۆی بسوورِێتەوە ، وەکو پەروانەی یاریی منداڵان یا پەروانەی فرۆکە.

**پەروین** : پێرو ترازوو ، سورەییا ، کۆمەڵە ئەستێرەیێکی بچووکە لە ئاسماندا لە جێگەیێك کۆبوونەتەوەو وەکو ڕیزە ئەستێرەیێك دیارن .

**پەروێزەن** : بێژنگ ، بێژینگ .

**پەرِ** : (١) تووك ، تووکی باڵندە ، ئەو بەرگەی لەشی باڵندە دادەپۆشێ . (٢) بەرگی کاغەز ، تەبەقەی کاغەز .

**پەرِە** : بڕوانە ( پەرِ ) .

**پەشیمان** : پاشگەز بوو ، ئەو کەسەیە کە کارێك بکاو لە پاشانا نارِەزایی خۆی تێیدا پیشان بداو نەیەوێ جارێکی تر ئەو کارە دوو بارە ببێتەوە .

**پەشێو** : شێواو ، سەرلێشێواو ، شپرزە .

**پەششە ـ پەشە** : مێشوولە ، پێشکە ، مەگەزێکی بچووکی باڵدارە، چزوویێکی باریكو تیژی هەیە بە هۆی ئەوەوە بە ئادەمزادەوە دەدا .

**پەشم** : (١) خوری ، مووی لەشی مەرِو بزنو ووشترە کە بۆ دروست کردنی قوماش بە کار دەهێنرێ .

(٢) قسەی بێ مانا ، قسەی بێ نرخ، قسەی هیچ .

**پەشمین** : قوماشی خوری ، قوماشی لە خوری دروست کراو ، شتی لە خوری دروست کراو .

**پەل** : (١) دەست ، قۆڵو باسکی هەموو گیانداریێك . (٢) لق . (٣) پارچە ، کەرت . (٤) ئەو پارچە خاکەیە کە بۆ کشتوکاڵ ئامادە کراوەو دەوری هەندێ بە خۆڵ بەرز کراوە .

**پەلاس** : (١) جلوبەرگی خوریی درشتو قەبە ئەوەی دەروێشان لە بەری دەکەن . (٢) جۆرە ڕایەخێکە لە خوری دروست دەکرێ .

**پەڵە** : پارچەیێك لە هەور ، پارچەیێك لە دەغل ، پارچەیێك لە هەرشتێك بێ ؛ هەموو خاڵو ڕەنگو شتێکی تری کە بکەوێتە سەر شتێکی ترو ڕەنگی لەو نەکاو پێیەوە دیار بێ .

**پەناگرتن** : خۆ شاردنەوە ، خۆ لە چاو وون کردن ، گەڕان بە شوێن جێگەی ژیانی ئاسوودەیی .

**پەناھ** : جێی نادیار ، جێی ئاسوودە ، ئەو جێیەی کە ئادەمزاد لە تەنگوچەڵەمەو کارەسات ڕزگار دەکا .

**پەنجە** : پێنج ئەنگوستی دەست یا پێی ئادەمزاد ، نینۆکی دڕندەو باڵندە ، هەموو شتێکی لە پێنج ئەنگوستی ئادەمزاد بکا .

**پەنجە بلوور** : ئەنگوستی وەك بلوور ، بڕوانە ( بلوور ) .

**پەنجەرە** : کولانکەی شیشدارە کە لە ئاسن یا دار دروست کراوە لە ژووردا .

**پەنهان** : شارراوە ، نادیار .

**پەیا پەی** : یەك لە دووای یەك ، پەی دەر پەی .

**پەیام** : نامە ، هەواڵ ، دەنگو باسێك لە لایەن کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بنێررێ .

**پەیەمبەر** : بڕوانە (پێغەمبەر) .

**پەیین** : زبڵ ، پیسایی ئاژاڵو حەیوانی گۆشت نەخۆر .

**پەیدا بوون** : دەرکەوتن ، دیاربوون ، ئاشکرا بوون ، نوواندن .

**پەیغامبەر** : بڕوانە (پێغەمبەر) .

**پەیك** : نامەبەر ، چەپەر ، تەتەر ، قاسید ، پۆستەچی .

**پەیکی ڕەفرەف** : نامەبەری خۆشڕەو ، ئەو مافوورەیە کە لە ئەفسانەدا دەڵێ ئادەمزاد لە سەری دادەنیشێو دەفڕێ ، بەرماڵی حەزرەتی سلێمان .

**پەیکەر** : هەیکەل ، لەش .

**پەیکەر کردن** : ڕەگو ڕیشەو دەمار بڕین .

**پەی کردن** : کەرت کردن ، شکاندن ، بڕین .

**پەیوەستە** : پێوەند ، بە یەك گەیشتن ، بە یەکتری بەستن ؛ هەمیشە .

**پەیوەنـد** : (١) دوو شـت بـە یەکتری‌یـەوە بەسـترابێ . (٢) موتروبەکردن .

**پیر** : (١) بە تەمەن گەورە ، سەر سپی ، ڕیش سپی . (٢) مورشیدو ڕابەری دەروێشی – پـیری موغان : پێشەوای تەریقەت .

**پیرانەسەر** : سـەردەمی پـیری ، ڕۆژگاری پیری .

**پیری** : نیسبەتە بۆ (پیر) ، بڕوانە بڕوانە (پیر) .

**پیرۆزە** : یەکێـکە لـە بـەردە بەنرخەکان ، ڕەنگی شینی ئاسمانی‌یە لە مەعدەن دروست دەکرێ ، بـە زۆری بـۆ ئەموسـتیلە بـە کـار دەهێنـرێ ، مەعدەنی پـیرۆزە لە نیشابوورو کرمانو فارسی وولاتی ئێران چنگ دەکەوێ .

**پیرەسوور** : نـاوی چاکێکە لە سلێمانی لە تەك گەڕەکی مەڵکەندی ، هەندێ لەخانوبەرەکانی دەورو بەری چاکەکە بە ناوی ئەوەوە نراوە ، واتا گەڕەکی پیرەسوور ، لە سەردەمی خـۆیدا گۆڕسـتانێکی بچووك لـە دەوری چاکەکـەدا بـووە ، بـەڵام ئێستاکە تەنیا قسـنە بچووکەکە بە پەرپووتی ماوەتەوە .

**پیشـانی** : (١) نێوچـەوان ، پەرچەم . (٢) شۆخی ، بێ شەرمی چاو قایمی .

**پیشان‌دان** : بەر چـاو خستنی شتێك ، شتێك خستنە بەر چاوی کەسێك .

**پیلەتەن** : **فیلەتەن** ، لەشی گەورەو بەهێزی وەکـو فیل ، پاڵـەوان ، قارەمان .

**پێ** : ئەندامێکی لەشی ئادەمزادو ئاژەڵە کە بە هۆی ئەوەوە دەتووانن بەڕێوە بڕۆن .

**پێچ** : خوواری ، خووارو خێچی ، چەماوە ، حەلقە ، لوولی .

**پێچە** : پەچە ، ڕووبـەند ، ڕوو پۆش .

**پێچیدە** : خووار ، خووارو خێچ، چەماو ، لوولدراو .

**پێچش** : پێچ خوواردوو ، شتی چەماوە ، شتی خووارو خێچ .

**پێداهاتن** : بەسەری‌دا ڕۆیشتن .

**پێرار** : سالی پێش پـار ، دوو سـاڵ لەمەوبـەر ، دوو سـاڵ لەمەوپێش .

**پێش خزمەت** : خزمەتکار ، ئەو کەسـەیە لە ماڵ یا هەر دەستگایێك بە فەرمانی یەکێکی تر هەموو کارو بارێك دەباتە سەر .

**پێکان** : (١) تـیر ، سـەری نێـزە ، هەمـوو ئاسـنێکی نـووك تیـژ . (٢) لێدان ، نیشـانـە کە لە جێ‌ی خـۆی بـدرێ . (٣) بـە مەبـەس گەیشـتن ، گەیشـتنە ئەنجـام لە لێکۆڵینەوەیێکی قووڵ‌دا .

**پێ‌کەنین** : کەنین ، خەندە ، بزە ، کرانەوەی لێو لە کـاتی شادی‌دا ، دژی گریان .

**پێکەوە** : دوو کەس بە یەکەوە ، دوو شت لەگەڵ یەکدا بن ، وێکڕا .

**پێلەقە** : بە پێ لە شتێك دان ، لەقە وەشاندن بە پێ .

**پێمەلە** : جۆرە مەلەیێکە بە قیتی لە ناو ئاودا بە جوولاندنی هەر دوو پێ دەکرێ ، جوولاندنی هەر دوو پێ .

**پێم دەڵێن** : بە من دەڵێن .

**پێوان** : ئەندازە گرتن ، زانینی پانیو درێژیو قورسیو قەوارەی شت .

**پێوەر کردن** : شتی وورد بە سەر شتێکی تردا کردن .

**پوختە** : (١) خواردەمەنیی پێگەیو ، دژی خاو . (٢) کەسی کارمەندو زاناو خاوەن تاقی کردنەوە .

**پوختەگی** : ڕێکوپێکی ، تەواوی ، بڕوانە (پوختە) .

**پوود** : ئەو تاڵە دەزووەیە کە لە چنیندا بە پانایی بە کار دەهێنرێ واتە ئەوەی لە مەکووك دێتە دەرێ ، بەرامبەر بە « تار » ە کە بە درێژی بە کار دەهێنرێ ، بڕوانە ( تار ) .

**پووس** : بڕوانە (لووس) .

**پووش** : گیای ووشك .

**پووشوو** : شتێکی نەرمو ووشکەو زوو ئاگر دەگرێ لە هەندێ دارو دەوەن پەیدا دەبێ بۆ بەر دەستێ بە کار دەهێنرێ .

**پووك** : ئەو گۆشتەیە کە ددانی لێڕوواوە لە ناو دەمدا .

**پوول** : (١) پارە ، پارەی لە مەعدەن دروستکراو . (٢) شتێکی چاپکراوی وێنەدارە ، نرخی پارەی هەیە لە پۆستەدا بە کار دەهێنرێ بۆ ناردنی نامەو شتی تر .

**پۆست** : پێست ، چەرم جلوبەرگی دەروێشان .

**پۆست نشین** : شێخو مریدو دەروێش ئەوەی زیندەگانیی لە تەکیەو خانەقاکان دەباتە سەرو ژیانێکی درشت دەژی .

**پۆشین** : داپۆشین ، لەبەر کردن ، نوواندن .

**پۆلاد** : پۆڵا .

**پەدەر** : باوك ، باب .

**پرتەو** : ڕۆشنایی ، ڕۆشناییو تیشك .

**پرتەو بەخش** : ئەوەی ڕۆشاییو ڕووناکی دەدا .

**پرد** : شتێکە لە دار یا بەرد یا ئاسن لە سەر ڕووبار یا هەر ئاوێکی کە بڕوا دروست دەکرێ بۆ پەڕینەوە ــ پردی سیرات : بە پێی ئەفسانەیی ئایین ئەو پردەیە کە ژێری دۆزەخەو ئەودیوی بەهەشتە ، لە موو باریکترو لە شیر تیژ ترە ، گوناهبار ناتووانێ بە سەریدا تێپەڕێو دەکەوێتە دۆزەخەوە ، ئیمانداریش بە سەریدا تێدەپەڕێو دەچێتە ئەودیو کە بەهەشتە .

**پرده سوور** : دەبێ ناوی پردێك بووبێ لە سەر ئـاوی شیوەسوور ، بڕوانە (شیوەسوور) .

**پرسین** : پسـیار کـردن ، داوا کردنی زانینی هەواڵێك .

**پرسش** : بڕوانە (پرسین) .

**پڕ** : شتێك ناوی بەتـاڵ نەبێ ، شتێك لە شتێکی تر بکرێ‌و بـکاتە لێوی .

**پساندن** : کەرت بوونی داو یا هەر شتێکی تر .

**پشت** : (١) دیوی دووەمی هەموو شتێك ، بەشێ لە لەشی ئادەمزاد لە شانییەوە تاکەمەری لای پێچەوانەی سینگ ، بەشی سەرووی چووار پێ لە ملی‌یـەوە تـا کلکی . (٢) یـارو یاوەر ، پشت‌و پەنا ، یارمەتی دەر .

**پشتان** : قـژی تەوقی سـەرو پشتی سـەر کە لە پشـتەوە شۆڕ دەبێتەوە ، کەزی .

**پشت‌و کەمەرە** : نـاو قـەد ، پشتێند .

**پشکووتن** : کرانـەوەی غونچەی گوڵ ، چرۆ دەرکردنی دارو درەخت لە بەهاردا .

**پشکۆ** : پەنگـر ، کڵـۆی ئاگری گەش .

**پڵنگ** : جانەوەرێـکی گـەلێ بە هێزە ، لەشی وەکو شێرو بەبر وایە ، دڕندەو چاپـوکە ، پێستی سپی‌یەو خاڵی ڕەشی پێوەیە لـە شاخەکانی ئاسیاو ئەفەریقادا دەژی .

**پیاڵە** : جام ، بادە ، ئەو قاپەیە کە شەراب‌و مەی تێدا دەخورێتەوە .

**پیاو** : (١) نێرینە، ئادەمزادی نێر، بەرامبەر ژنە . (٢) ئازاو دلێر .

## ت = T

**تـا** : (١) ووشـەی گـرێدان‌و ئیزافەیە بۆ کۆتایی‌و دووایی : لـە هەولێرەوە تا کەرکووك هەشتا کیلۆ مەترەیە . (٢) نیوەی بار ، لابار ، لای ترازوو . (٣) کەڵ ، تاڵ ، تەلی لوول دراو .

**تاب** : (١) فراوانی‌و ڕۆشنایی ، گەرمی ، گـەرم‌و گـوڕی ، هەموو شتێکی ڕووناك هەمـوو شتێکی پڕ تیشك وەکو هەتـاو و مۆم‌و چراو شتی تر . (٢) هێـزو توانا . (٣) پێچ‌و خـەمی زولف . (٤) ڕەنـج‌و میحنەت ، مەشەقەت .

**تابان** : درەوشـەدەر ، ئـەوەی ڕووناکی دەدا .

**تابەکەی** : تاکەی ، هەتاکەی .

**تابیع (تابع)** : پێڕەو ، ئەو کەسەیە کە سەر بە کەسێکی ترەوەیە ، ئـەو شتەیە کە سەر بە شتێکی ترەوەیە ، سەرشۆڕی یەکێکی تر .

**تابووت** : دارە مەیت ، سندووقی لە دار دروست کـراوە مردووی لە ناو دەنێن بۆ ناشتن ، یا مردووی پێ دەگوێزنەوە بۆ گۆڕستان .

**تابوور (طابور)** : ریـز ، تیپ ، فیرقه .

**تابش** : (۱) درەوشـــانەوە ، پرتەودان ، ڕۆشـنایی‌و گەرمـایی ڕۆژو هەتاو و ئاگـر . (۲) سـوور کردنەوەی ئاسن بە ئاگر .

**تاتا** : کەڵ کەڵ ، داد داو .

**تاج** : تانج ، کڵاوی گەوهەربەندی شاهنشاهان ( مەلیك‌و قەیـسەرو ئیمپراتۆرو سولتان‌و کەسی تر ..).

**تاجی عەرەب** : سەرداری عەرەب، محەمەد پێغەمبەر .

**تار** : (۱) تاریك ، ڕەش . (۲) داو، تەل ، تاڵ ، تاڵی موو ، داوی موو . (۳) دەمـار ، ڕەگ . (٤) ئالەتێـکی مۆسـیقی‌یە . (٥) دارێـکە یەکجار بڵندە لە هیندسـتاندا زۆرە لە لقی ڕایەخ‌و لە بەری شـەراب دروست دەکرێ .

**تـارا** : قوماشـێکی ئاوریشـمی تەنك‌و ناسکە دەموچاوی بووکی پێ دادەپۆشرێ لە کاتی گوواستنەوەدا ؛ هەموو قوماش‌و پەردەیێکی تەنـك‌و ناسك .

**تاریخ** : مێژوو ، دیار کردنی کاتی هەر شـتێك ، دیاری کـردنی ئەو سەردەمەی کە ڕووداوی گـەورەی تێدا بووە ، لێکدانـەوەی ڕووداو و بەسەرهاتی پێشینان .

**تاریخی جەم** : تاریخ جم (١٢٥٤) بە حیسابی ئەبجەد ڕستەی ( تاریخ جم ) بە ئیملای کۆنی فارسی ئامێز دەکاتە ساڵی ١٢٥٤ی هیجری ، ئەمە ساڵی مردنی سلێمان پاشاو بـوونی ئەحمەد پاشایە بە میری سلێمانی :
ت ٤٠٠ + ا ١ + ر ٢٠٠ + ی ١٠ + خ ٦٠٠ + ج ٣ + م ٤٠ = ١٢٥٤ ، ئەم ساڵە هیجری‌یە بەرامبەر (١٨٣٨ – ١٨٣٩ز)یە .

**تاریکی** : دژی ڕوونـاکی ، دژی ڕۆشنایی .

**تارو پـوود** : هەمـــوو شـتێکی چنراو ، بڕوانە ( تار ) ، ( پوود ) .

**تارو مار** : پەڕاگەنـدە ، زێرو زەبەر ، نابووت ، دار لە سەر بەرد نەمان .

**تـاز** : ناکـەس ، خەسـیس ، نادان ، بەدخوو ، داوێن پیس .

**تازە** : (١) نـوێ ، دژی کـۆن . (٢) تەڕو ناسك . (٣) ئێستە .

**تـازە جـەوان** : لاوی تـازە هەڵکەوتوو ، نەونەمام .

**تازە ساو** : بڕوانە (ساو) .

**تازەهەڵدان** : تازە دروست بوو .

**تاژی** : تانجی ، تازی ، جـۆرە سەگێکی ڕاووشکارە .

**تاس (طاس)** : کاسـەی مس ، جۆرە جامێکە .

**تاسات (طاسات)** : کۆی (تاس)ە ، بڕوانە (تاس) .

**تاسان** : هەناسـە بڕان ، کـاس بوون ، سـەر کاس بوون ، گێـژ بوون .

**تاغی (طاغی)** : زۆردار، ستەمگەر، زاڵم .

**تاق (طاق)** : بانێکه بـه شێوەی کەوان لە خشت بۆ سەرووی دەرگا یـا هەیـوان دروسـت دەکـرێ . (٢) دەلاقە ، دەرەجە ، بۆشایی‌یێکە لە ناودیوار بەجێ دەهێلرێتەوە بـۆ شتومەك . (٣) تاك ، تەنیا ، یەکێك .

**تاقانە** : منداڵێکە باوكو دایـکی تەنیا ئەویان هەبێ ، هەموو شتێکی تاكو تەنیا .

**تاقە** : جـــۆرە قوماشـــێکی ڕەنـگاوڕەنگ بوو لـە ئاوریشـمو سـورمە دروسـت دەکـرا کـەواو سوخمەی ژنو پیاوو دەرپێی ژنو چاکەتی منداڵانی لێ دروست دەکرا .

**تاقەت (طاقت)** : توانایی ، تاو .

**تاقی ئافاق** : ئاسمان ، گەردوون ، چەرخو فەلەك .

**تاقی ئەبرۆ** : برۆی کەوانی .

**تاقی خەزرا ( طاق خضراء )** : ئاسمان .

**تاقی کیسرەوی** : تاقی کیسرا ، ئەیـــوانی کیســـرا ، مەدائین ، سەلمان پاك ، بەناوبانگترین کۆشكو باڵەخانەیێکە شاهنشاهانی ساسانی دروستیان کـردووە ، لە پێشانا ئـاوەدانو یەکێك بـوو لە خۆشترینی قەسـرو باڵەخـانەکانی جیهان ، ئێستاکە کەلاوەیە هەندێ لە تاقو دیوارەکانی ماوە . بە پێی ئەفسانەی ئایینی نـاو کوردەواری گۆیا تاقەکە لە حەژمەت پەیدا بوونی ئایینی موسـولمان درزی بـردووە چونکە ڕەمزی سەردەمی گاوریو بوت پەرستی بووە، بەیتی ناو خەڵکی کورد دەڵێ :

تاقی کیسرەوی شەق بوو
جێی بە کافران لەق بوو

**تاقی نەزارەت ( طاق نظارت )** : (١) جێی چـاوەڕووانی ، جـێی بینین . (٢) برۆ تاقێـکە دەکەوێتە سەر چاو .

**تاقی هەیوان** : بڕوانە (ئەیوان) .

**تاقم** : دەستە ، کۆمەڵە شتێك ، پۆل .

**تاکو** : هەتاکو ، هەتاوەکو .

**تالیب ( طالب )** : (١) داواکەر ، ئەو کەسەی داوای شتێك دەکات. (٢) قوتابی .

**تاڵ** : (١) تفت ، دژی شیرین .
(٢) کەسـی تـووڕە ، بەدخـوو .
(٣) کەڵ ، تا ، تەلی لوول دراو .

**تاڵاو** : ژەهراو ، ئاوی تاڵ .

**تاڵی** : تفتی ، دژی شیرینی .

**تالع** : (١) بەخت ، چارەنووس . (٢) دەرکەوتن ، دیار بوون ، هەڵاتن بۆ ڕۆژو مانگو ئەستێرەو دلبەر .

**تاڵی شاری** : دەرمانێکە بۆ دەباغ کردنو خۆش کردنی پێستە بە کار دەهێنرێ .

**تام** : چۆنیـەتی خـواردن یـا خواردنەوە کـە زمـان هەسـتی پێ دەکات ، خۆشو ناخۆش ، تاڵ ، شیرین ، ترش ، سوێر .. هتد ..

**تانجەرۆ** : ڕووبارێکە لە ئاوی سەرچناری باکووری ڕۆژئاوای شاری سلێمانی دەبێتەوەو بەرەو خوارووی شار دەڕوا ، ئنجا لا دەدا بەرەو شارەزوور تا دەگاتە دوواوان ، لە لای کانی گۆمەدا ئاوی ئالیشەی تێدەکا ، لە پاشانا ئاوی تەقتەقیش ، ناوی ڕووبارەکە بە پێی ئەو ناوچانەی پێیدا تێدەپەڕێ دەگۆڕێ .

**تاو** : (١) هێز ، کوڵ ، بۆ غاری وولاخ و خێرا ڕۆیشتنی ئادەمزاد . (٢) دەم ، ماوەیێکی کەم . (٣) هەتاو ، ڕۆژ . (٤) بارانی بە لیزمە ، بڕوانە (تاب) .

**تاوە** : (١) قاپێکی پەلە شتی خواردنی تێدا سوور دەکرێتەوە . (٢) بەردێکی پانە ئاشەوانان کولێرە ئاشی لە سەر دەبرژێنن .

**تاوەباران** : بارانی بە تاو ، بارانی زۆر ئاودار ، بارانی سەر بە کلاوە ، ئەو بارانەیە کە زۆر ئاودارە بەلام زوو تەواو دەبێ .

**تاووس** : باڵندەیێکی جوانە ، نێرینەی تووک و پەڕی ڕەنگاوڕەنگی هەیە ، تووکی لە سەرەتای هاوینداد فڕێ دەداو دووبارە هی تازە دەڕوێتەوە ، بە زۆری لە خوارووی ئاسیاو هیندستاندا دەژی . لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەوڵەمەندانی ئەورووپا گۆشتی تاووسیان بۆ ڕێز گرتن لە پێش میوان دادەنا ، لەگەڵ ئەوەی وەنەبێ گۆشتیشی خۆش بێ . بە زۆری لە کۆشک و باڵەخانەو باخ و باخاتی دەوڵەمەندان بۆ جووانی بەخێو دەکرێ ، لای هەندێ کەس ڕەمزی نالەبارییە ، دەڵێن تاووس بووە هۆی دەربەدەری ئادەم و حەووا لە بەهەشت . ڕۆیشتنی بە نازو خان و خەرمانی کچی جووان لە ناو کوردەوارییدا لەگەڵ ڕەوتی تاووس بەراووردو بەرامبەر دەکرێ .

**تاودان** : تیژ کردنی شتێک لە ڕۆیشتن و ڕاکردندا ، غارکردن بە وولاخ .

**تاها (طە)** : یەکێکە لە ناوەکانی محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان .

**تاهیر (طاهر)** : پاك .

**تەئەممول (تأمل)** : بیرکردنەوە ، خەیاڵ کردن ، ئەندێشە .

**تەئسیر (تأثیر)** : کارتێکردن ، کار لێکردن ، دەسەلات بە سەردا سەپاندن .

**تەباب** : زیان کردن ، لەناو چوون ، کەموکووڕی ، نابووتی .

**تەباهی ( تَباهی )** : (١) شانازی ، فەخر ، خۆهەڵکێشان. (٢) نابووت ، بۆگەن ، زەبوون ، سەرکز .

**تەبەسسوڕ ( تَبَصّر )** : بە قووڵی بینین ، وورد بوونەوە لە شت ، ڕوون کردنەوەی شتێك .

**تەبەسسوم (تَبَسُّم)** : بزە ، خەندە ، پێکەنینی ووردو نەرم .

**تەبەق ( طبق ) :** قاپێکی خڕ و پەلە لە دار دروست دەکرێ ، یەکێکە لە قاپ و قاجاغی ناو ماڵ .

**تەبیب (طبیب) :** پزیشـــك ، ئـــەوەی خەریـــکی زانســـتیی پزیشکییە .

**تەبیعەت :** (۱) سروشت ، خوو و ڕەووشـــت . (۲) ڕووی زەوی ، جیهان ، دونیا ، هەمـوو گۆڕڕانو دروســت کردنێـکی کـە دەسـتی ئادەمزادی تێدا نەبێ .

**تەبع (طبع) :** خوو و ڕەووشت ، سروشت .

**تەتار :** ئەو ناوەیە کە لە کۆندا لە ڕۆژئاوا بەمیللەتی مەنگۆلیان دەووت؛ ناوی میللەتێکە لە وولاتی ڕووسیە دەژی ؛ ناوی ناوچەیێکە لە ئاسیای ناوەڕاست موشکی باشی لێبووە .

**تەجەللا (تجلی) :** ڕوون بوون ، ڕووناك بوون ، دیار بوون ، تیشك؛ کینایەتـــە بـــۆ چـــوونی ڕووحی خودا بۆ نـاو دڵی سۆفیو دەروێش ئەوەی دەگاتە پایەی (فناء فی الله ) ؛ هەروەهـا کینایەتیشە بۆ دیاربوونی نـووری خودا لە کێـوی توور ئەوەی مووسـای بێ هۆشو مەدهۆش کرد .

**تەجربە (تجربە) :** تاقیکردنەوە .

**تەجرید (تجریـد) :** (۱) ڕووت کردنەوە ، جیا کردنەوەی شـتێك لە هەموو شتێکی کـە لە بنجدا لە نەژادی ئەو نەبێ ، پێسـتە لە دار کردنەوە . (۲) شـیرو خەنجـەر لە کالان هێنانــە دەر . (۳) تەنیایی ، گۆشەگیری .

**تەحەممول (تحَمُّل) :** خۆڕاگرتن لە بەر هەموو ناخۆشییێك ، ئـارام گرتن ، هێزو توانا نواندن .

**تەحتانی (تحتانی) :** ژێـــری ، ژێرین ، ئەوەی ژێرەوە .

**تەحدیس (تحدیث) :** باسکردن ، قسە کردن ، خەبەردان .

**تەحـــریر :** ( ۱ ) حازر کردن ، هێنانەدی ، ئامادە کردن . (۲) ئازاد کـردن ، ســـەربەست بـوون . (۳) نووسین ، نووسینەوە .

**تەحسیل (تحصیل) :** وەدەست خستن ، پەیدا کـردن ، وەرگرتنی زانستی .

**تەحقیر (تحقیر) :** بچووك کردن ، نزم کردن ، شتێك لە نرخی خـۆی کەمتری بـۆ دابنرێ ، کەسـێك لە پلەی خۆی نەویتر تەماشا بکرێ .

**تەخت :** (۱) شتێکە لە سـەری دادەنیشـن ، لـە دار یـا مەعدەن دروست دەکـرێ ، چـووار پـێی هەیـە ، لە کـاتی فەرمانڕەوایی‌دا پادشاهان لە سـەری دادەنیشن ، کورسی . (۲) ڕووی شت ، شتی پانو لووسو بێ گرێ ، پارچە داری پانو لووس .

**تەختە :** بڕوانە (تەخت) .

**تەختە بەند :** شـتێك کە بەتەختەو بەتی خوری یا ئاوریشم ببەسترێ ، ئەندامێکی شکاوی لەش بە تەختە بەند بکرێ .

**تەختی ئابنووس** : ئەو کورسیو تەختەیە کە لە داری ئابنووس دروست دەکرێ ، بڕوانە (ئابنووس) .

**تەختی ئاخیرەت** : ئەو کورسیو تەختەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا خودا لە سەری دادەنیشێو دادگا بۆ ئەم خەڵکە دادەنێ بۆ جیاکردنەوەی گوناهکار لە ئیماندار ؛ تەختی فەرمانڕەوایی دونیای دووەم .

**تەختی سلێمان** : تەختو کورسی سلێمان ، بڕوانە (سلێمان) .

**تەختی عەرش** : ئەو کورسیو تەختەیە کە خودا لە بارەگای خۆیدا لە سەری دادەنیشێ .

**تەخفیف (تخفیف)** : سووککردن، ئاسانکردن ، کورت کردنەوە .

**تەدارك** : : ئامادە کردن ، شتێك لە باتی شتێکی تر دابنرێ ؛ هەڵە دۆزینەوەو ڕاست کردنەوەی .

**تەدبیر (تدبیر)** : کارێك بە بیر کردنەوەی قووڵ ببرێتە سەر ، کارێك بە ڕێکوپێکی ببرێتە سەر .

**تەدقیق (تدقیق)** : لێکۆڵینەوە ، پشکنینەوە ، بە چاوێکی تیژو ووردبین تەماشای شت کردن .

**تەرا (تری)** : دەبینی ، تۆ دەبینی ( ڕستەیێکی عەرەبییە ) .

**تەرازوو** : (١) ترازوو ، ئالەتێکە لە مەعدەن یا دارو پەتو چەرم دروست دەکرێ بۆ کێشانی شت . (٢) کۆمەڵە ئەستێرەیێکە لە ئاسمان ، پەروین ، بڕوانە (پەروین) ، پێرو تەرازوو ، کۆ و تەرازوو . (٣) ناوی بورجێکە ، بڕوانە (بورج) .

**تەرەب (طرب)** : شادبوون ، سەماو هەڵپەڕین لە ئەنجامی شادیدا ، شادمانی ، شادی ، ئاهەنگو ڕابواردن .

**تەرەح ( تَرَح )** : خەم ، ئەندۆه ، بێخێری .

**تەرەف (طرف)** : لا جێگە ، کن ، کەنار ، دووایی شت .

**تەرەققی (ترقی)** : بەرز بوون ، بڵندبوون ، پێشکەوتن ، گەیشتنە پلەیێکی بەرز .

**تەرەننوم (ترنّم)** : ئاواز دەرخستن ، گۆرانی ووتن .

**تەریق (طریق)** : (١) ڕێگە ، ڕێ ، شەقام . (٢) شەرمەزار بوون .

**تەربیەت (تربیت)** : پەروەردە کردن، پێگەیاندن، خوو و ڕەووشتی چاك فێر کردن .

**تەرز (طرز)** : جۆر ، چەشن ، شێوە ، ڕوخسار ، شکل ، ڕێگەو شوێن .

**تەرزە** : تەزرە ، دڵۆپی بارانی مەیو .

**تەرك (ترك)** : دەست لێ هەڵگرتن، وازلێهێنان .

**تەڕ** : ئاودار ، تێر ئاو .

**تەردەست** : چوستو چاپوك ، پسپۆر ، ئەو کەسەیە کە شتێك بە ئاسانیو چاکی بگەیێنێتە ئەنجام ، زۆرزان .

**تەزەڕوو (تَذَرو)** : چوڕ ، ناوی باڵندەیێکە گۆشتی دەخورێ ، نێرینەی پەڕو باڵی جووانی هەیە ، لە قەراغ زەریای قەزوین دەبینرێ لە ناو جەنگەڵو کێڵکەکاندا دەژی .

**تەزیین (تزیین)** : جووان کردن ، ئارایش کردن ، ڕەونەقدان بە شتێك .

**تەسەببور (تَصَبُّر)** : سەبر کردن ، پەلە نەکردن ، ئارام گرتن .

**تەسەوور (تَصَوّر)** : وێنەی کەسێك یا شتێك بە خەیاڵ دروست بکرێ ، بیرکردنەوە ، هێنانەوە یاد ، خەیاڵ کردن .

**تەسبیح (تسبیح)** : (١) ئەو کەسەی دەڵێ «سبحان الله» ، بە پاکی یادکردنی خودا. (٢) ئەو ڕستە وورده شتەیە کە لە مووروو دەکاو لە کاتی تەسبیحاتدا لە دەست دەگیرێ .

**تەسبیحی مورغان** : تەسبیحی لە هێلکەی مریشك دروست کراو ، کینایەتە بۆ تەسبیحی دەنك درشت .

**تەسحیح (تصحیح)** : ڕاست کردنەوە ، دروست کردنی هەڵەی نووسین یا کتێب .

**تەسخیر (تسخیر)** : خستنە ژێر دەست ، ژێر دەستکردن ، بێگاری پێ کردن .

**تەسکین (تسکین)** : ئارام پێ گرتن ، بێ دەنگ کردن .

**تەسلیم (تسلیم)** : سپاردن ، دانی شتێك بە کەسێك .

**تەسوید (تسوید)** : نووسین ، ڕەشکردنەوە .

**تەسویر (تصویر)** : دروست کردنی وێنەی کەسێك یا شتێك ، گرتنی وێنەی کەسێك یا شتێك ، نەخش کردنی شێوەی کەسێك یا شتێك ، وێنەگرتن .

**تەشبیه (تشبیه)** : (١) شتێك بە شتێك بچوێنرێ ، شتێك لەگەڵ شتێکی تر بەرامبەرو بەراوورد بکرێ . (٢) زاراوەیێکی زانستیی بەدیعە .

**تەشت (طشت)** : قاپێکی خڕو فراوانە لە مەعدەن دروست دەکرێ .

**تەشریح (تشریح)** : پارچە پارچە کردن ، بڕینی ئەندامی لەش . (٢) ڕوون کردنەوە .

**تەشریف (تشریف)** : گەورە خۆپیشاندان ، خۆدەرخستن وەکو پایە بەرزو ماقووڵ .

**تەشویر (تشویر)** : شەرمەزاری ، شەرم کردن ، شەرم دروست کردن ؛ پیشاندان ، ئیشارەت کردن بۆ شتێك .

**تەشویش (تشویش)** : ئاژاوە نانەوە ، تێکدان ، بێ ئارامیو بڵاوەیی ، تێکەڵو پێکەڵ کردن .

**تەعال (تَعال)** : وەرە (ڕستەیێکی عەرەبییە) .

**تەعبیر (تعبیر)** : (١) مەبەسێك بخرێتە ڕوو ، دەرخستنی بیرو ڕا بەرامبەر شتێك ، دەرخستنی

ئەوەی لە دەروونو ناوەوەدایە بە قسە ، مەبەس بە قسەو ڕستە بە نووسین یان ئەزبەر بخرێتە پێش چاو . (٢) لێکدانەوەی خەون (خەو) .

**تەعبیە (تعبئە)** : دروست کردن ، ئامادەکردن ، ئامادەکردنی لەشکر بۆ جەنگ .

**تەعداد** : ژماردن ، ژمار کردن ، حیساب کردن .

**تەعریف (تعریف)** : (١) ناساندن ، دەرخستنی ڕاستی‌ی شتێك یا ڕووداوێك بۆ کەسێکی تر . (٢) وەسف . (٣) ناسراو ، زاراوەیێکی زانستی‌ی نەحوی عەرەبی‌یە .

**تەعزیم (تعظیم)** : گەورە کردن ، ڕێز گرتن ، بەچاوێکی بەرز تەماشا کردن ، کڕنووش بردن ، سەر دانوواندن بەرامبەر شتێکی بەرز .

**تەعمیر (تعمیر)** : ئاوا کردن ، ئاوەدان کردن ، چاك کردنەوەی خانووی ڕووخاو ، چاك کردنەوەی هەموو شتێکی کۆنو کە کەمو کووڕی هەبێ .

**تەعمیق (تعمیق)** : قووڵ کردن ، قووڵی .

**تەعن (طعن)** : نێزە لێدان ، دەرخستنی کەمو کووڕی‌ی کەسێك، سەرزەنشت کردن .

**تەعنە (طعنە)** : یەك جار نێزە لێدان ، شوێنی نێزە لە لەشدا ، قسەی سووك بە یەکێك ووتن ، بڕوانە (تەعن) .

**تەغنیە (تغنیە)** : ئاوازدەرخستن ، گۆرانی ووتن .

**تەفتیش (تفتیش)** : پشکنینەوە ، گەڕان لە دووای شتێك .

**تەفسیر (تفسیر)** : (١) ڕوون کردنەوەی ماناو مەبەسی قسەیێك ، ئاشکرا کردنی ماناو مەبەسی ڕستەیێك ، (٢) ڕوون کردنەوەی مانای ئایەتی قورئان .

**تەفریقە (تَفْـرِقە)** : جودا کردنەوە ، پەراگەندە کردن ، پەراگەندەیی ، پەرێشان کردن .

**تەفریقە نووس** : ئەو کەسەی پەرێشان دەنووسێ ، ئەو کەسەی بایەخ بە نووسین نادات ، ئەو کەسەی بە تەنگ نووسینەوەی خۆی نی‌یە .

**تەقدیر (تقدیر)** : (١) قاڵب گرتن ، (٢) خوواهیشتی خودا ، ئەو بەشەی خودا بۆ بەندەی دادەنێ . (٣) زاراوەیێکە لە زانستی‌ی نەحوی عەرەبی‌دا بە کار دەهێنرێ .

**تەقبیل (تقبیل)** : ماچ کردن .

**تەقریب (تقریب)** : نزیك کردن ، نزیك بوون .

**تەقریر (تقریر)** : خستنە ڕوو ، دەرخستن ، ئاشکراکردن ، بڕیار دان ، بەیان کردن .

**تەقسیر (تقصیر)** : کورتی کردن ، کورتی هێنان ، دەست لە کار

هەڵگرتن پێش تەواو بوونی ، کەمتەرخەمی‌کردن لە کاردا .

**تقلید (تقلید)** : لاسایی کردنەوە ، کارکردن وەکو یەکێکی تر .

**تەقویەت (تقویت)** : بەهێزکردن ، بەقەوەت‌کردن .

**تەکالیف (تکالیف)** : کاری قورس، کارێك لە تووانای ئادەمزاد نەبێ .

**تەکاندن** : شتێك لە جێی خۆیدا ببزوێنرێ بۆ مەبەسی پاك کردنەوە لە مافوورو ڕایەخو هەموو شتێك تۆزی لێ بنیشێ .

**تەکەللوم (تکلم)** : قسە ، قسەکردن .

**تەکلیف (تکلیف)** : کاری قورس‌و دژواری بە کەسێك بسپێررێ ، هەر کارێکی بە کەسێك بسپێررێ‌و پێویست بێ بیگەیێنێتە ئەنجام .

**تەکلیفی لا یوتاق (تکلیف لایطاق)** : کاری قورس کە لە ووزەی ئادەمزاد نەبێ بیگەیێنێتە ئەنجام .

**تەکیە** : (١) جێی کۆبوونەوەو حەلقە بەستنی دەروێش‌و مریدو شێخی تەریقەتە ، بە زۆری لە کوردستاندا جێی دەروێشانی تەریقەتی قادری‌یە. (٢) حوسێنی‌یە، جێی ڕەوزەخوونی‌و تازیە گرتنی عاشوورایە لە لای مەزهەبی شیعی موسوڵمانان .

**تەلار** : ژووری گەورە ، ساڵۆن ، کۆشك‌و سەرا .

**تەلەئلوئ (تلالؤ)** : درەوشانەوە ، بریقەدان ، درەخشان ، بریسکە .

**تەلەف (تلف)** : لە ناو چوون ، لە ناو بردن ، نەمان ، فەوتان .

**تەلیسم (طلسم)** : پارچە کاغەز یان مەعدەنێکە جادووگەرو فالچی‌یان جەدوەلی لە سەر دەکێشن‌و نووسینی لە سەر دەنووسن ، باوەڕیان لە سەر ئەوەیە کە ئەمە پارێزگاری‌ی خەڵکی دەکاو ئازارو خراپەیان لێ دوور دەخاتەوە .

**تەلبیس (تلبیس)** : شاردنەوە ، داپۆشین ، شاردنەوەی ڕاستی ، شاردنەوەی کەم‌وکووڕی لە خەڵکی ، فێڵ کردن‌و فریودانی خەڵك .

**تەلبیەت (تلبیت)** : وەڵام دانەوە ، جێبەجێ کردنی کارێکی داوا کراو ، ووتنی (لَبَّیْكَ) لە وەڵامی کەسێك ، ووتنی (لَبَّیْكَ) لە حەجدا .

**تەلا** : زێڕ ، یەکێکە لە مەعدەنە بە نرخەکان ، ڕەنگی زەردە .

**تەلای ئەحمەر** : زێڕی سوورکراوی چاك .

**تەلاق (طلاق)** : جودا بوونەوەی ژن لە مێرد ، ئازاد بوون لە بەندی نیکاح .

**تەلەب (طلب)** : خوواستن ، داوا کردن ، زاراوەیێکە لە دەروێشی‌دا بە کار دەهێنرێ .

**تەلعەت (طلعت)** : دیدار ، بینین ، هەڵاتن ، شتێك کە دەرکەوێ ، دیار بوون .

**تەم** : (١) پەردەیێکە لە چاو پەیدا دەبێ‌و دەبێتە هۆی کەم بینایی . (٢) تاریکی ، ڕەشی . (٣) هەڵم . (٤) تەم‌و مژ .

**تەماشا** : (١) بینین ، نواڕین ، ڕووانین ، ڕۆنین . (٢) ڕێگا گرتن ، گەشت‌و گەڕان ، بە کۆمەڵ ڕێگا گرتن .

**تەمام (تمام)** : تەواو ، هەموو ، گشت ، دروست .

**تەمەع (طمع)** : ئارەزوو ، ویستنی زۆر .

**تەمەننا (تَمَنّی)** : ئارەزوو کردن ، خوواهش کردن ، ویستن .

**تەمکین (تمکین)** : هێزو تووانادان، ڕێگە خۆش‌کردن .

**تەن** : (١) لەش ، بەدەن ، جەستە . (٢) ڕەشی مەنجەڵ .

**تەناف** : پەت ، ڕستە ، هەموو پەت یا تەلێکی کە شتی لە سەر هەڵبخرێ .

**تەنین** : چنین ، تێك هەڵکێشان بۆ بەڕە ، مافوور ، قوماش ، تۆڕو شتی تریش .

**تەنوور** : جێگەی نان برژاندن ، تەندوور ــ لە زمانی کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی‌دا بە کار دەهێنرێ .

**تەن‌بەروەری** : (١) بە تەنگەوە بوون بۆ لەش ، خۆش گوزەران . (٢) تەمەڵ ، تەنبەل .

**تەندوورە ــ تەندوور (تنور)** : (١) هەورە تریشقە ، گۆڵە گۆلی هەور . (٢) بلبل .

**تەنکیر (تنکیر)** : نە ناس کردن ، ناوێك بکرێ بە نەناسراو لە زانستی‌ی نەحوودا .

**تەنگ** : جێگەیێك کە کەسێك یا شتێك بە زەحمەت بتوانێ لە ناوی بێ ، باریك‌و تەسك ، دژی فراوان .

**تەنگانە** : سەردەمی تەنگوچەڵەمەیی ، دەست کورتی .

**تەنگی** : تەسك‌و تروسکی ، بێ دەرەتانی .

**تەنگەتاو کردن** : کەسێك بخرێتە حاڵێکەوە کە ڕێگەی ڕزگار بوونی نەبێ .

**تەنها** : تاك ، یەك ، یەکی ، تەنیا ، ئەو کەسەی هاوڕێ‌و هاودەمی نەبێ .

**تەواف (طواف)** : گەڕان بە دەوری شتێكدا ، گەڕانی شت ، سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا .

**تەواو** : بڕوانە (تەمام) .

**تەوەققوف (تَوَقّف)** : وەستان ، ڕاوەستان ، ڕاگرتن ، مانەوە لە سەر شتێك‌و بیر کردنەوەی قووڵ‌و نەگۆڕان .

**تەویل (طویل)** : درێژ .

**تەوبە (توبە)** : تۆبە ، یەکێك گوناهی زۆری کردبێ‌و بڕیار بدا ئیتر گوناه نەکا .

**تەور** : تەورداس ، ئالەتێکە

سەری ئاسنێکی تیژو دەسکی دارەو داری پێ دەشکێنرێ .

**تەوف (طوف)** : سووڕان لە دەوری شتدا ، بڕوانە (تەواف) .

**تەوق (طوق)** : تۆق ، گەردەن بەند ، چەنبەر ، هەر شتێك شتێکی تری پێ ببەسترێتەوە یان پێیەوە بەند بکرێ ، ئەوەی لە شت دەئالێ .

**تەوقی تەلیسم** : پەرژینو چەنبەری شتێکی سیحراویو ئەفساناوی ، کەوتنە ژێر کاری تەلیسمەوە ، بڕوانە (تەلیسم) — تۆقو تەلیسم : خشڵێکە لە زێڕ دروست دەکرێ .

**تەهوور (طهور)** : پاك کەرەوە ، شتێك بە شتێکی تر بشۆرێو پاك بکرێتەوە وەکو ئاو .

**تەی (طی)** : (١) پێچانەوە ، نوشتانەوە ، قەد کردن ، ڕێگا بڕین . (٢) لە زاراوەی زانستیی عەرووزدا کەوتنی تیپی چوارەمی ساکینە لە (مستفعلن) کە (مستعلن) دەمێنێتەوەو دەبێتە (مفتعلن) ، وە (مفعولات) (معولات) دەبێتە (فاعلات) .

**تەیبە (طيبة)** : ناوی شاری مەدینەیە ولە وولاتی حەجدا .

**تەییب طیّب)** : پاك ، پاکیزە ، چاك ، حەلاڵ .

**تەیکەر** : ئەوەی شت دەبڕێ . ڕێگە بڕ ، ئەوەی ڕێگە دەبڕێ ، ئەوەی شت دەپێچێتەوە .

**تیب (طيب)** : (١) عەتر ، بۆنی خۆش . (٢) خوو و ڕەووشتی چاك .

**تیپ** : (١) دستەیێکی ڕێكو پێك لە خەڵك ، بەشێك لە خەڵکی ، بەشێکی لەشکر لە زاراوەی زانستیی سوپاییدا ، ڕیز . (٢) حەرف ، دەنگ .

**تیپی زولفی تارو مار** : کۆمەڵی زولفی ئاڵۆز .

**تیپی سریشك** : دڵۆپی فرمێسك کە یەك لە دووای یەكدا دێتە خووارێ .

**تیپی شکۆفە** : کۆمەڵی خونچە .

**تیر** : دارێکە سەرێکی ئاسنی نووك تیژی پێوەیە بە هۆی کەوانەوە دەهاوێژرێ چەکێکی جەنگیی گەلێ کۆنە لە ئەدەبیاتدا لەگەڵ برژانگدا بەراوورد دەکرێ .

**تیری موژگان** : برژانگی وەکو تیر .

**تیز** : تیژ ، بڕوانە (تیژ) .

**تیژ** : (١) هەموو شتێکی کە نووکی یا دەمی زۆر ناسكو تەنك بێو شت ببڕێ یا کونی بکا وەکو : چەقۆ ، خەنجەر ، شیر ، سووژنو شتی تر . (٢) بە هێزو جوستو چالاك . (٣) هەموو شتێکی توند بێو دەم بسووتێنێ وەکو : بیبەرو بەهاراتو شتی تر .

**تیژاو** : تیزاب .

**تیشنە** : تینوو ، هەموو ئادەمزادو حەیوانێکی پێویستیی بە ئاوو خواردنەوە هەبێ .

**تیغ** : (١) شیر ، شمشیر ، هەموو

ئالەتێکی تیژو شت، بڕ ، ئەو ئالەتەی مووی سەرو ڕیشی پێ دەتراشرێ (٢) بڵندی ، بەرزی . (٣) تیشکی ڕۆژ . (٤) دڕك .

**تیفل (طفل)** : منداڵ ، بچووکی ئادەمزاد .

**تیمساح** : کرۆکۆدیل ، جانەوەرێکە لە خزۆکەکانە ، لە مارمێلك دەکا ، بەلام یەکجار گەورەیە ، پێی کورتی پەڕداری هەیە ، دەمی فراوانو گەورەیە ، نزیکەی نەوەد ددانی هەیە ، لە ئاودا مەلە دەکاو لە ووشکایی لە قەراخ زەریا هێلکە دەکا ، تیمساحی ئەفەریقی یەکجار گەورەو سامدارە .

**تینوو** : گیاندارێك ئارەزووی ئاو بکا .

**تێپەڕین** : ڕابردن بە سەر شتێکدا ، لە قەراخ شتێکدا ڕۆیشتن ، بە سەر چوونی سەردەمی شتێك .

**تێخزان** : چوونە ناو شتێکی تەنگو بەزۆر جێی خۆ کردنەوە .

**تێدا** : لە ناویدا .

**تێراو** : هەموو شینایێکی تەڕو پاراو بێ ، هەموو شتێکی ئاوی تەواوی بێ‌و پێویستی پێ‌ی نەبێ .

**تێری** : ئارەزوو نەکردنی خوواردن ، دژی برسییەتی ؛ دەوڵەمەندی‌و ژیانی خۆشی‌و بەختیاری .

**تێزان** : سەر هەڵدانەوە .

**تێغ** : بڕوانە (تیغ) .

**تێفکرین** : ووردبوونەوە لە شت ، بیرکردنەوەی قووڵ لە ڕووداو .

**تێکەڵ** : دووشت یا زیاتر بچنە ناو یەکتری‌یەوە ، چوونە ناو یەك .

**تێك شکاندن** : داپڵۆسینی شت ، ووردکردنی شت .

**تێگەیشتن** : زانینی شتێك کە لەوەوپێش نەزانرابێ یا بە ڕاستی جەوهەری نەزانرابێ .

**تێ‌یدا** : لە ناویدا ، بڕوانە (تێدا) .

**توحەف (تحف)** : کۆی (توحفە)یە ، بڕوانە (توحفە) .

**توحفە (تحفە)** : دیاری ، ئەرمەغان ، سەوقات ، هەموو شتێکی بچووکو بە نرخ ، هەموو شتێکی بە نرخ .

**توحفەیی توففاحی** : دیارییێك سێو بێ ، سێو بە دیاری .

**توخم** : تۆو ، دان ، دانە ، هێلکە، شەهوەت .

**توخودا** : ووشەیێکە تکای تێدایە کەسێك بە کاری دەهێنێ کە پێویستی‌ی بە یارمەتی هەبێ .

**تورووق (طرق)** : کۆی (تەریق = طریق)ە ، بڕوانە (تەریق) .

**توربەت (تربت)** : خاك ، گۆڕ ، گۆڕستان ، قەبر ، قەبرستان ، شتێکی پانو خڕە لە خاکی کەربەلاو نەجەف دروست دەکرێ ، پێرەوانی

مەزهەبی شیعەی موسوڵمان لە کاتی نوێژ کردندا نیوچەوانیان دەخەنــە سەری .

**توررە (طُرّة)** : (١) نێو چەوان ، ناوچەوان . (٢) قــەراخی هەمــوو شتێك . (٣) ئەو دەستە موویە کە بە سەر نێوچەوانەدا دێتە خوواریێ . (٤) چەند خەتێکی هونەری تێکشکاوە چۆتە ناو یەکەوە بریتییە لە ئایەت یا ناو یا شتی تر لە سەر مۆر یا پارە هەڵکەندراوە .

**تورف ــ تورفە (طُرْف ــ طُرْفه)**: (١) هەمــوو شــتێکی تــازەو نۆو جــووانو خــۆش . (٢) ســەیر ، بێوێنە ، نایاب .

**تورك** : (١) نەتــەوەی تــورك . (٢) کچی جووان .

**توشە** : خـــوواردنی کـــەم ، خوواردنی ڕێگەو سەفەر .

**توغرا (طُغرا)** : بڕوانە (توررە) .

**توفەیلی (طفیلی)** : نیســـبەتە بە کەســێك ناوی (توفەیــل = طفیل) بووە کە بە بێ بانگ کردن بە میوانی چۆتە سەر خەڵــکی ، میوانی بانگ نەکراو .

**توففاح (تُفّاح)** : سێو .

**تولووع (طُلوع)** : دەرکەوتــن ، دیار بوون ، هەڵاتنی ڕۆژو مانــگو ئەستێرە .

**تومەز** : ووشەیێکە لە کاتێکدا بە کار دەهێنرێ کە بە تەمای شتێك بێ کەچی ڕووداو بە پێچەوانەی ئەوەوە دەبێ .

**توند** : قایم : پــەیت ، تەنــگ ، تەبیعەت توند ، تووڕە ، خێرا .

**تونداو** : (١) ئــــاودان ، هــەر ئاســنێك یــا مەعدەنێــك ســوور بکرێتەوە ئنجــا بکرێتە ئــاوەوە بۆ ئەوەی بە هێــز بێ بەتایبەتی ئــەو مەعدەنــەی شــیرو خەنجــەری لێ دروست دەکرێ . (٢) ئاوی بە خوڕ ، ئاوی تیژڕەو .

**تونگ** : گــۆزە ، گۆزەی ئــاو یا شەراب ئەوەی لە قوڕ یا فەغفووری یا بەللوور دروست دەکرێ .

**تووانەوە** : شلبــوونی هەمــوو شتێکی توند ، بوونی بەفرو سەهۆڵ بە ئاو مەعدەنی ڕەق بە شل .

**توهمەت (تُهمَت)** : گومانی بەد . کەسێك بە شــتێك تاوانبار بکرێ ، تاوان بۆ یەکێك دروست بکرێ .

**توبا (طُوبی)** : (١) مێی (ئەتیەب = أطیب)ە ، زۆرپاك ، پاکتر ، خێرو خۆشیو بەختیــاری . (٢) نــاوی دارێکە لە بەهەشت .

**تووتی (طوطی)** : باڵنـــــدەیێکە هێنــدەی کۆترێــك دەبێ ، پــەڕی سەوزو دەندووکی کەوانی سوور یا زەردە ، باڵندەیێــــکی بە هۆشــە زمانێــکی نەرمی هەیــە ، تووانای ئەوەی هەیە لاسایی هەندێ دەنگو ووشە بکاتەوە ، بیبیمەتۆ .

**تووتن** : گیایێکی یــەك ساڵەیە ، بەرگی پانو گەورەیە گوڵی سوور یا سەوزە ، بەرگی ووشك دەکرێتەوە

بە جیگەرە یا هەر شێوەیێکی تر لە ڕێگەی سووتانەوە دەکێشرێ ، ماددەی نیکۆتینی تێدایە ، لە بنجدا لە ئەمەریکاوە کەوتۆتە وولاتانەوە .

**توور (طور)** : بڕوانە ( سەلم‌و توور ) .

**توور (طور)** : ناوی شاخێکە لە سنووری میسر لە سینا ، جێگەی موناجات‌و ڕازو نیازی مووسا بووە لەگەڵ خودادا . ئەفسانەی ناو کوردەواری ئەوە دەگێڕێتەوە کە شاخی توور لە بەر جیلوەی خودا ئاگری گرت‌و بوو بە کل .

**توول (طول)** : درێژی ، درێژایی ، دژی کورتی .

**توولانی (طولانی)** : درێژایی ، بە درێژی .

**توولە** : (١) لقی تازە پشکووتووی ناسك . (٢) بەچکە سەگ ، جۆرە سەگێکی بچووکە .

**توولە نەمام** : لقی تازە پشکووتوو .

**تووك** : پەڕ ، موو .

**تۆ** : ئەتۆ ، تو ، توو ، ، ئەتوو .

**تۆبە** : بڕوانە (تەوبە) .

**تۆران** : دلگیر بوون . عاجز بوون .

**تۆز** : (١) گەرد ، غوبار ، ووردە خۆڵ . (٢) شتی زۆر کەم .

**تۆزو گەرد** : بڕوانە (تۆز) .

**تۆفان** : لافاوی گەورە ، شۆڕشی زەریا ، هەروا هووریاو خوم شێوان .

**تۆق‌و تەلیسم** : جۆرە خشڵێکی کوردەواری‌یە لە مل دەکرێ‌و لە سەر سنگ‌و مەمك خۆی دەنوێنێ .

**تۆمار (طومار)** : نامە ، دەفتەر ، کاغەز ، هەموو شتێکی نووسراو ، قسە خستنە سەر کاغەز ، خەت .

**ترێ** : میوەیێکی ناسك‌و شیرینە ، بە ئێشوو لە لقی دارمێو دروست دەبێ ، جۆری زۆرە .

**ترس** : گۆڕانێکی سایکۆلۆجی‌یە بە سەر گیانداردا دێ لە ئەنجامی ڕووداوێکی کە کار دەکاتە سەر گیانی‌و مەترسی لە ژیانی خۆی دەکا .

**ترسان** : بڕوانە (ترس) .

**ترس‌و لەرز** : بڕوانە (ترس) .

**ترش** : هەر شتێکی تامی سرکەی هەبێ .

**ترشی** : هەموو شتێکی ترش ؛ میوەو سەوزەی کە دەخرێتە سرکەوەو تامی ترش دەبێ ، بڕوانە (ترش) .

**تف** : ئاوی دەم فڕێ بدرێتە دەرێ ــ **تف‌کردن** : بۆ نزم کردن‌و کەم کردنەوەی پلەی کۆمەلایەتی‌ی کەسێك ئاوی دەم فڕێ دەدرێتە سەر دەم‌و چاوی .

**توێ کردن** : پارچە کردن ، تو کردن .

**تیا** : تێدا ، تێ‌یدا ، لە ناو .

## ج = C

**جا** : جێگە ، جێگەی بەرز ، مەڵبەند ، مەقام ، هەموو جێگەیێك یا گۆشەیێك کە کەسێك یا شتێك تێیدا بژی یا ئۆقرەی تێدا بگرێ .

**جادوو** : ئەفسانە ، ئەفسوون ، سیحر .

**جار** : کەرەت ، نۆرە ، نۆبە .

**جازیبە (جاذبە)** : هێزی ڕاکێشان وەکو هێزی ڕاکێشانی مگناتیز یا کارەبا .

**جاریح (جارح)** : (١) ئەوەی لەش بریندار دەکات . (٢) تانە لێدان ، قسەی ڕەق و ناڕەوا .

**جارییە (جاریـە)** : مێی (جاری)یـە . (١) ڕەوان و تیژ لە ڕۆیشتندا . (٢) کچی تازە پێگەیشتوو ، کەنیز .

**جاری (جارێك)** : بڕوانە (جار) .

**جاسووس** : ئەو کەسەی دەنگ و باس و هەواڵ دەگەیێنێ ، ئەو کەسەیە کە هەواڵی نهێنی کەسێ یا وڵاتێك کۆ دەکاتەوە و دەیدا بە لایێکی تر .

**جام** : (١) پیاڵە ، بادە ، ئەو قاپەیە کە شەراب و مەی تێدا دەخورێتەوە . (٢) پارچەی شووشە کە بۆ پەنجەرە و شتی تر بە کار دەهێنرێ .

**جامی جەم** : بڕوانە (جامی جەمشید) .

**جامی جەمشید** : بە پێی داستانی کۆنی ئێرانییان جەمشید جامێکی بووە نەخشەی هەموو جیهانی تێدا بووە ، یاخود هەموو جیهانی لە ناو ئەو جامەدا دیوە ، لە بەر ئەوەیە « جامی جیهان نوما »و « جامی جیهان بین »یشیان پێ ووتووە .

**جامیع (جامع)** : (١) کۆکراوە ، گرد بوون . (٢) هەموو شتێکی تەواو بێ و کەم و کووڕی نەبێ . (٣) مزگەوتی گەورە ، ئەو مزگەوتەی نوێژی جومعەی لێ دەکرێ .

ـ **(جامیعلحورووف = جامع الحروف)** : لە زاراوەی زانستیی بەدیعدا ئەوەیە کە هەموو تیپەکانی ئەلفبا لە یەك شیعردا کۆ بکرێتەوە ، بە مەرجێ تیپێکی کەم نەبێ و دوو پارەشی تێدا نەبێ .

**جان** (١) گیان ، ڕەوان ، ڕووح ، ڕۆح . (٢) جنۆکە ، جن ، ئەجندە .

**جانان (جانانە)** : دلبەری زۆر جوان و دلسۆز ، عاشقێك کە خۆشەویستەکەی وەکو جان (گیان)ی خۆی خۆش بوێ .

**جانی جانان** : گیانی گیانان ، بڕوانە (جانان) .

**جانیب (جانب)** : لا ، نزیك ، کن .

**جانباز** : (١) لە گیان دەرچوون ، قێلباز . (٢) ئالوێرچی ، دەلال ،

ئەو کەسەی شت دەکڕێو دەفرۆشێتەوە .

**جانگ** : بڕوانە (جاو) .

**جاو** : جانگ ، تەنراوێکە ڕیسی ئەستوورەو بە خەرەك دەڕێسرێ ئنجا جۆلا دروستی دەکا .

**جاه** : پایەو پلە ، شان‌وشکۆ ، بەرزی ، قەدرو قیمەت‌و شەرەف .

**جاهیلی‌یەت ( جاهلیّة )** : (١) نەخوێندەواری ، دوواکەوتوویی. (٢) سەردەمی پێش ئیسلام لە عەرەبستان‌داو وەزعی عەرەب لەو کاتەدا ، سەردەمی بوت پەرستی .

**جەبەل** : چیا ، کێو ، شاخ .

**جەبین (جَبین)** : نێوچەوان .

**جەبر (جبر)** : (١) بەستنی ئێسقانی شکاو ، ئەندامێکی کە ئێسقانی شکابێو لە گەچ گیرابێ یا بە تەختە بەسترابێ . (٢) ناوی کۆمەلەیێکی فەلسەفی‌یە (جەبری‌یە = جبریە)یان پێ‌ووتووە بیرو ڕایان ئەوە بووە کە تەواوی کردەوەی ئادەمزاد بە فەرمانی خودایە ، بەندە هیچ جۆرە ئیختیازێکی نی‌یە ، دژی (ختیاروتفویض)ە . (٣) جەبروموقابەلە زانستی‌یێکی ماتیماتیکی‌یە کە تێیدا تیپ لە باتی ژمارە بە کار دەهێنرێ .

**جەبهە (جبهە)** : نێو چەوان ، سەرووی برۆو خوارووی مووی پێش سەر .

**جەبهەت (جبهت)** : بڕوانە (جەبهە)

**جەدەل (جدل)** : گفتوگۆی تیژ ، دوژمنایەتی .

**جەدی** : (١) ئەستێرەی قوتب ، ناوی ئەستێرەیێکە لە لای قوتبی باکووری‌یەوەیە . (٢) کاربزن ، ناوی بورجی دەیەمە ، بڕوانە (بورج) .

**جەدوەل (جدول)** : (١) چەند خەتی لە ڕاستەوە بۆ چەپ‌و لە سەرەوە بۆ خوارەوە لە سەر کاغەز بکێشرێ . (٢) جۆگەلە ، ڕووباری بچووك .

**جەر (جَرّ)** : (١) تیپی ژێردار لە زمانی عەرەبی‌دا نیشانەی «ـِ»یە ، (٢) ڕاکێشان ، درێژ کردن ، فراوان کردن .

**جەریر (جریر)** : گوناه ، تاوان ، جینایەت .

**جەرگ** : جیگەر ، یەکێکە لە ئەندامانی ناوەوەی ئادەمزادو ئاژال ڕەنگی سووری تۆخە ، سەفرا لەوەوە دروست دەبێ .

**جەرگی بریان** : جیگەری سووتاو ، جیگەری برژاو .

**جەڕاح (جرّاح)** : ئەو کەسەیە کە برین تیمار دەکا ، ئەو پزیشکەیە کە تیماری برین دەکاو هەندێ پارچە لە لەش دەبڕێ کە لە ئەنجامی نەخۆشی خراپ دەبێ .

**جەڕار (جرّار)** : (١) زۆرکێشان

سووڕانەوە لە دەوری خۆ ، لەشكری زۆرو بەهێز . (٢) جۆرە دووپشكێكی گەورەو زەردە ، ژەهری دژوارە ، زولفی دولبەر لەگەڵی بەراوورد دەكرێ .

**جەڕە** : سەبوو ، گۆزەی گەورەی قولپدار .

**جەزا (جزاء)** : سزا ، مەزد ، پاداش ، چاكی یا خراپی .

**جەزبە (جذبه)** : (١) ڕاكێشان ، بڕوانە (جازیبە) . (٢) ماوەی دوور ، ڕێگەی دوور ، ماوەی نێوان دوو جێگە .

**جەزل (جزل)** : (١) گەورەیی ، ئەستووری ، زۆری ، فراوانی . (٢) قسەی خۆش و ڕەوان و بەهێز .

**جەزم (جزم)** : (١) تیپی زەنەدار لەزمانی عەرەبیدا نیشانەی « ْ »یە. (٢) بڕین ، كەرت كردن ، ڕێك خستن .

**جەسەد (جسد)** : لەش ، بەدەن ، جەستە .

**جەستە** : لەش ، بەدەن ، جەسەد .

**جەعبە (جعبه)** : (١) سندووقی بچووك ، قوتوو ، هەموو شتێكی وەك قوتوو لە مقەبا یا هەرشتێكی تر دروست كرابێ . (٢) تیردان ، كالانی تیر .

**جەعبە نشین** : لە ناو كالان ، ئەو چەكەی لە كالان نەهاتۆتە دەرێ .

**جەفا (جفاء)** : (١) بێ هوودە ، بێ نرخ ، بەتاڵ ، هەر شتێكی كەڵكو سوودی نەبێ . (٢) دڕك . (٣) خاشاك . (٤) غەش .

**جەفیر (جفیر)** : (١) كالان ، كالانی شمشێرو خەنجەر ، تیردان . (٢) سندووقی بچووك ، قوتوو .

**جەلا (جلاء)** : (١) ڕوون و دیار ، ئاشكرا بوونی هەر شتێك . (٢) مشتوماڵ كردنی شیرو خەنجەرو ئاوێنەو شتی تر لە ژەنگ و گەڕاندنەوەی بریقەی . (٣) دوور كەوتنەوە لە نیشتمان و ماڵ .

**جەلال (جلال)** : گەورەیی، بلندی، بەرزی ، شكۆ .

**جەلب (جلب)** : ڕاكێشان، هێنان، ڕاكێشانی شتێك لە جێگەیێك بۆ جێگەیێكی تر .

**جەم (جەمشید)** : كوڕی تەهموورسە ، یەكێكە لە شاهە ئەفسانەییەكان ، چووارەمین شاهنشاهی پێشدادییانە ، بە پێی شانامە حەوسەد ساڵ فەرمانڕەوایی كردووە ، جەژنی نەورۆز لەلایەن ئەوەوە بنیاد نراوە ، جامێكی ئەفسانەیی بووە ، بڕوانە ( جامی جەمشید ) ، (جەمشاسب)یشی پێ دەڵێن .

**جەماعەت (جماعة)** : كۆمەڵێك لە خەڵك .

**جەمال ـ جەماڵ (جمال)** : جووانی ، جووانیی ڕوخسار .

**جەمیع (جمیع)** : هەموو ، تەواو ، کۆمەڵێك لە خەڵك .

**جەمجا** : جێگەی وەك جەم ، پایە بڵندی وەك جەم ، بڕوانە (جەم) ، (جا) .

**جەمشید (جەم)** : بڕوانە (جەم) .

**جەمع (جمع)** : (١) هەموو شتێکی بڵاوو پەراگەندە کۆ بکرێتەوە ، زاراوەیێکی زانستیی بەدیعە ، ئەوەیە کە شاعیر دوو سیفەت یا زیاتر لە یەك حاڵەتدا کۆ بکاتەوە . (٢) کۆمەڵێك ، تاقمێك ، کۆمەڵێك ئادەمزاد .

**جەمعیەت ( جمعیّت )** : (١) کۆبوونەوە، یەکگرتن، تەبایی‌لەناو یەکدا . (٢) کۆمەڵە کەسێك ، خەڵکێکی زۆر لە شوێنێکدا کۆببنەوە .

**جەمعو دائیرە** : کۆڕبەستنی کۆمەڵە کەسێك بۆ ڕابواردن ، کۆبوونەوەی کۆمەڵە کەسێك‌و دانیشتن بە شێوەی دائیرە بۆ ڕابواردن .

**جەمماژە (جمّازە)** : هەورە تریشقە ، ئەو دەنگەی لە ئاسمانەوە دێ .

**جەناب (جناب)** : (١) ووشەی گەورە کردنە لە پێش ناوی کەسی گەورە دەهێنرێ . (٢) هەرێم ، ناوچە ، جێگە ، دەرگا .

**جەنان (جَنان)** : (١) دڵ ، قەلب ، کاری نهێنیی ، ئەوەی لە دەروون‌دایە . (٢) شەوو تاریکی شەو .

**جەنووب (جَنوب)** : قیبلە ، نیوەڕۆ ، یەکێکە لە چوار لاکان بەرامبەر باکوورە ، لای ڕاستی کەسێکە ڕوو بە ڕووی ڕۆژهەڵات بوەستێ ، ئەو بایەی لەولاوە دێ .

**جەنب (جنب)** : نزیك ، لە کن ، لەتەنیشت ، لە لا .

**جەنگ** : شەڕ ، کوشتار لە نێوان چەند کەسێك یا لەشکرو سوپای دوو دەوڵەت .

**جەننەت (جنّة)** : باخ ، بەهەشت، فیردەوس .

**جەننەتی** : خاوەن ئیمان و باوەڕ ، ئەو کەسەی دەچێتە بەهەشت ، ئەوەی جێگەی بەهەشتە .

**جەننەتولمئوا ( جنة المأوی )** : بەهەشتی حەوتەم ، خۆشترینی هەموو بەهەشتەکان .

**جەو** : (١) ئەتمۆسفێر ، بۆشایی نێوان زەوی‌و ئاسمان ، ئەو هەوایەیە کە زەوی‌ی گرتۆتە خۆی . (٢) جۆ .

**جەواب ( جواب )** : وەڵام ، وەرام .

**جەوان (جَوان)** : ئادەمزاد یا ئاژاڵ یا دارو درەخت لە ناوەڕاستی تەمەنی خۆی بێ ، دژی پیری ، لاو ، گەنج بۆ ئادەمزاد .

**جەوت** : جەفت ، کڵاوی پەڕوو بۆ خۆش کردنی پێستە بەکار دەهێنرێ .

**جەور (جَوْر)** : (١) زوڵم کردن ، ستەم کردن ، زۆرداری کردن ، لە ڕێگەی ڕاست لادان . (٢) خەتی لێوی جام ـ پیاڵەی جەور : بادەی پڕ لە مەی .

**جەوهەر (جوهر)** : (١) نەژاد ، بنیاد ، سەربەخۆ ، بنەچ و بناوان و نویشکی شت . (٢) هەموو بەردێکی بە نرخی وەکو ئەڵماس ، یاقووت ، پیرۆزە ، مرواری و شتی تر ـ لە بنجدا « گەوهەر »ە و لای عەرەب بووە بە ( جەوهەر = جوهر ) .

**جەوهەری** : (١) ڕەسەن ، جەوهەردار ، شیر و خەنجەری ئاودار . (٢) جەواهیر فرۆش .

**جەوهەری فەرد** : هەموو شتێکی نە پارچە (تجزئـة) و نە دابەش (تقسیم) بکرێ .

**جەهوول (جهول)** : (١) نادان ، بێ هۆش ، نەزان ، خۆپەسند ، خۆهەڵکێش .

**جەهل (جهـل)** : بێهۆشی ، نەخوێندەواری ، نەزانین ، دژی زانستی .

**جەهلی مورەککەب (جهل مركّب)**: ئەو نەزانین و نادانییەیە کە ئادەمزاد خۆی هەستی پێ ناکا و خۆی بە زانا و حەکیم دادەنێ ، بەم جۆرە نەزانینی دووپارە و مورەککەب دەبێ لە ڕووی ئەوەی لە لایێک خۆی نەزان و بێ خەبەرە لە زانستی و لە لایێکی تریشەوە بێ خەبەرە لە نەزانی و جەهالەتی خۆی .

**جەیحوون** : ناوی ڕووبارێکە درێژیی (٢٥٤٠کم)ە ، لە شاخی پامیر لە هیندستان هەڵدەقوڵێ و بە ناو ئاسیای ناوەڕاستی وولاتی یەکێتی سۆڤیەت تێدەپەڕێ و دەڕژێتە ناو زەریای ئۆراڵ ، ئێستا « ئەمودەریا »ی پێ دەڵێن .

**جیفە** : کەلاك ، لاشە ، مردار ، لەشی مردوو کە خراپ دەبێ و بۆگەن دەکا .

**جیفە خوار** : کەلاك خۆر .

**جیگەر** : بڕوانە (جەرگ) .

**جیگەر گۆش** : بڕوانە ( جیگەر گۆشە ) .

**جیگەرگۆشە** : گۆشەی جیگەر ، پارچەیێك لە جیگەر ، کینایەتە بۆ منداڵی خۆشەویست .

**جیلوە (جلوە)** : (١) پیشاندان ، دەرخستن ، ئاشکرا کردن ، نوواندن . (٢) نازو عیشوە ، خۆ پیشاندان بە شێوەیێکی جوان . (٣) ئەو دیارییەیە کە زاوا لە کاتی بەیەك گەیشتندا پێشکەشی بووکی دەکا .

**جیلوەت** : بڕوانە (جیلوە) .

**جیلوەدەر** : پیشاندەر ، ئەوەی شتێك دەردەخا ، ئەوەی شتێك ئاشکرا دەکا .

**جیلوەگاه** : جێگەی خۆپیشاندان،

جێگەی خۆدەرخستن ، جێگەی خۆئاشکراکردن .

**جینان (جِنان)** : کۆی (جەننەت)ە، بەهەشت ، فیردەوس .

**جینایات (جنایات)** : کۆی (جینایەت)ە ، تاوان ، گوناهی گەورە .

**جیوار (جِوار)** : (١) نزیکی ، هاوسێیەتی . (٢) پەیمان و ئاسایش ، پەناو دالدە .

**جیهان** : گێتی ، دونیا ، عالەم .

**جێ** : جێگە ، شوێن ، جێگەی نوستن ، نوێنی نوستن .

**جێباز** : جێی یاری ، جێی یاری‌ی سێ باز .

**جێگە** : بڕوانە (جێ) .

**جودا** : دوور لە یەکتری ، تەنیا جیا .

**جوزئ (جزء)** : بەش ، پارچە لە شتێك ، بەشێك لە شتێك .

**جوزوە (جذوة)** : ئاگر ، بەشێك لە ئاگر ، بەشێك لە هالاوی ئاگر .

**جوعەل (جُعَل)** : قالۆچە ، قالۆنچە ، مووروژە ، مێش و مەگەزێکە ڕەنگی ڕەش و باڵدارە ، بە زۆری لە ناو سەرگین و شیاکەدا دەژی .

**جوفتەلی** : جووتە هاوێژ ، ئەوەی جووتە دەکا ، ئەوەی جووتە دەهاوێ .

**جوملە (جملة)** : (١) هەموو ، گشت ، پاکی . (٢) قسە ، ڕستە .

**جونوون (جنون)** : شێتی ، دێوانەیی ، نەخۆشی‌ی مێشك ، نەبوونی عەقڵ .

**جونبوش** : جوولانەوەو جموجۆڵی .

**جووت** : (١) دووان ، دوو ، دوو شتی پێکەوە وەکو ژن و مێرد ، ڕێژی تاك . (٢) جووت کردن : کێڵانی زەوی ، دوو شت بخرێتە پاڵ یەك .

**جوود** : بەخشین ، چاوتێری ، کەرەم .

**جوویا** : ئازادی ، ڕزگاری ، قورتار بوون .

**جۆ** : دانەوێڵەیێکە لە گەنم دەکا ، زیاتر بۆ خۆراکی چیوار پێیان بە کار دەهێنرێ ، نانیشی لێ دروست دەکرێ .

**جۆبار** : جۆگە ، جۆگەلە ، ڕووباری بچووك .

**جۆش** : گەرمی ، شۆرش ، کوڵانی ئاو یا هەر شلەیێکی تر ، بڕوانە (جۆشش) .

**جۆش و خرۆش** : جموجۆڵی و بانگ و فەریاد .

**جۆشش** : کوڵان ، کوڵانی ئاو یا هەر شلەیێکی تر بە هۆی ئاگرەوە ، هەڵقوڵانی ئاو لە ژێر زەوی یا سەرچاوەو کانی بۆ سەر زەوی .

**جۆگە** : ڕووباری بچووك .

**جۆگەلە** : بڕوانە (جۆگە) .

**جۆلانە** : شتێکە لە دارو تەختە دروست دەکرێ و بە گوریس

دەبەستریٚ بۆ نوواندنی منداڵ بە کار دەهێنریٚ ، لە سەردەمی جەژناندا گەورەش بە کاری دەهێنن .

**جۆیا** : بڕوانە (جوویا) .

**جۆ بوونەوە** : جـودا بوونەوە ، لە یەکتری دوور کەوتنەوە .

**جۆن** : جنێو .

**جبریل** : جبرائیل ، یەکێکە لـە سـەرۆکی فریشـتەکان ، لـە لای مەسیحی‌یان فریشـتەی مـوژدەی زەکەریـاو مریـەمە ، لـە لای موسـوڵمانان یەکێکە لـە فریشتە نزیـکەکانی خـوداو پەیـامی بۆ محەمەد پێغەمبەر هێناوە .

**جبریلی شەهپەڕ** : جبـرائیلی باڵدار ، جبرائیلی خاوەن شاباڵ ، جبرائیلی خاوەن باڵی گەورە .

**جەمو** : (۱) هاتنـە خووارەوەی شانو باهووی وولاٚخ لە ئەنجامی کار کـردنی زۆر ، لە کەڵـك کـەوتنی وولاٚخ . (۲) برینێکە لە سەر شانی وولاٚخ دەردیٚ لە ئەنجامی سـووانو گرتنی زینو کورتان .

**جل** : (۱) بەرگی ئادەمزاد ، جلك ، ئەو شـتەی ئادەمـزاد خـۆی پـیٚ دادەپۆشیٚ . (۲) ئەو پارچەیەیە کە دەدریٚ بە سەر وولاٚخدا .

**جلە** : ناوی گیاندارێـکە لە ناو ئاودا دەژی .

**جلـەو** : دەسـتە ڕەشـمە ، دانەڵغاو ، جەڵەو .

**جـلەوکێش** : کاروانچـی ، سـەرۆکی کـاروان ، جلـەودار ، ئەوەی جـلەو دەگـریٚو ڕێـگا بە کاروان پیشان دەدا .

**جنس** : (۱) ئەو شـتەیە کە لە چەند جۆرە شـتێك پێك هاتبیٚ ، وەکو جنسی گیاندار کە بریتی‌یە لە ئادەمزادو هەموو خاوەن گیانێك . (۲) لە زاراوەی زانستی‌ی مەنتیق‌دا جنس ئەوەیە کە لە (ئەنواع = انواع) پێك هاتووە ، وە نەوع لە (ئەسناف = اصناف) پێك هاتووە ، وە سنف لە (ئەفراد =أفراد) پێك هاتووە . (۳) کەل‌وپەل ، کالاٚ ، ناوماڵ .

**جوێن** : بڕوانە (جۆن) .

## Ç = چ

**چ** : چی ، ووشەی پرسیارە ، چ دەکەی ؟ چ بوو ؟ چ ڕووی‌دا ؟

**چا** : (۱) چاك ، باش . (۲) چایە ، چای .

**چاپلووس** : (۱) زمـان لووس ، کوزکێش ، چلکاوخۆر . (۲) ئەو کەسـەیە کە بـە زمانی لـووسی‌و قسەی خۆشی فریوی خەڵکی دەدا .

**چادینە** : کلاوی چووار ئاوێنە .

**چارە** : دەرمان ، تەدبیر ، تەگبیر .

**چار یار** : چووار یـار ، چووار خەلیفەی ڕاشـیدین : ئەبووبەکرو عومەرو عوسمانو عەلی .

**چـاك** : (۱) بـاش ، پەسـند . (۲) ژنی بـە ئابڕوو ، مەسـتوور ، مەسـتوورە . (۳) داوێن پـاك . (٤) شەخس ، پیاو چاك .

**چاك چاك** : پارچە پارچە .

**چاكی دامێن** : ئـەو جێیـە قەڵشیوەی كەوایە لە داوێنیدا .

**چالاكی** : چوستی ، چاپوكی ، زرنگی .

**چاڵ** : قووڵایی ، بیر ، جێگەی نەوی و نزم ، ژێر خاك .

**چاو** : دیدە ، ئەندامی بینینە لە لەشی ئادەمزادو گیانداری تردا .

**چاوە** : سەرچاوە ، ئەو جێیەی كە ئـاو لە ژێـر زەوییـەوە لێی هەڵدەقوڵێ و جۆگە دەبەستێ .

**چاوەچاو** : چـاوەڕوانی كـردنی شتێك یا كەسێك .

**چاوەزار** : (١) ئێش و ئـازارو زیانێـكە كـە لە ئەنجـامی چـاوی پیسەوە تووشی كەسێك ببێ ، بە چاو بـردن . (٢) نوشـتە یـا هەر شتێكی تر دژی چاوی پیس .

**چاوەكەم !** : بۆ خۆشەویستی بە كەسێك دەووترێ كە پیاو هێنـدەی چاوی خۆشی بوێ .

**چاوی ئاهوو** : چـاوی مامـز ، كینایەتە بۆ جوانی .

**چاو سپی بوون** : كوێر بوون .

**چاه** : بیر ، چاڵ .

**چایەر** : (١) لـەوەڕ . (٢) ئـەو جێیەیە كە كاروان لـە سـەردەمی بەهاردا هەڵی دەبژێرێ بۆ پشوودان ، بـاری وولاخ دادەگیرێ بـۆ ئەوەی وولاخـــەكان بلەوەڕێـــن و كاروانچیەكانیش چـای لێ دەنێن و خواردن دەخۆن و دەحەسێنەوە .

**چەپ** : (١) بەرامبـەر ڕاستە ، ناڕاست . (٢) ئەو كەسەی بە دەستی چەپ كار بكا .

**چەپكەن** : جۆرە جلـو بەرگێكی مەردانەیە .

**چەتر** : (١) سەیوان ، شتێكە لە پارچە دروست دەكـرێ و لە كاتی بەفرو باران یا گەرمادا لە سەر سەر هەڵدەكرێ . (٢) ئاسمان .

**چەرخ** (١) ئاسـمان ، فەلەك . (٢) هەمـوو شـتێكی كـەوانی لە دەوری خۆی بزوێ و بسووڕێتەوە .

**چەرخی ئەخزەر** : ئاسمان

**چەرخی چەپ** : ڕۆژگاری چەوت و ناڕاست .

**چـەرخی دەوران** : ڕۆژگـار ، چەرخ و فەلەك .

**چەسپانی** : چەسپ ، سـفت ، پتـەو ، شـتێك بـە شـتێكەوە بەسترێ كە جیا بوونەوەی قورس بێ .

**چەسپیدە** : چەسپاو ، چەسپیو ، شـتێك بـە شـتێكی تـرەوە بەسترێتەوە .

**چەشمە** : سەرچاوە .

**چەشمەسار** : ئـەو جێیەی كە سەرچاوەی ئاوی زۆری لێ بێ .

**چەقین** : وەستان لە جێگەیێك و نەبزووتنەوە .

**چەڵتووك** : ئەو برنجەی سپی نەكرابێ ، ئەو برنجـەی لە پێستی نەهێنرابێتە دەرێ .

**چەمەن** : سەوزایی ، مێرغوزلە ، چیمەن ، زەوی‌ی سەوزو تەڕ .

**چەمەنزار** : جێگەیێك چیمەنی زۆرو فراوانی لێ بێ .

**چەمبەرە** : دەوری دائیرە ، حەلقە ، هەموو شتێکی حەلقە بێ .

**چەند** : (١) ژمارەیێکی دیار نەکراو لە سێ‌وە تا نۆ . (٢) پرسین لە ژمارەیێك یا نرخی شتێك .

**چەندە** : بڕوانە (چەند) .

**چەنگ** : (١) چنگ ، مست ، مشت ، پەنجەی ئادەمزاد ؛ پەنجەو نینۆکی دڕندەو بالداران . (٢) قولاب‌و هەموو شتێکی چەماوەو خووار . (٣) هارپ ، ناوی ئالەتێکی مۆسیقی‌یە .

**چەهچەهە** : ئاوازی بلبل‌و هەموو بالندە دەنگ خۆشەکان ، کینایەتە بۆ دەنگی خرخاڵ .

**چی** : بڕوانە ( چ ) .

**چیت** : قوماشێکی گوڵداری ڕەنگاوڕەنگە لە لۆکە دروست دەکرێ .

**چیللە (چلە)** : چلە ، چل ڕۆژە ، ڕۆژی چلەمینی مردنی کەسێك ، چل ڕۆژی کە دەروێش‌و عابید لە خانەی ڕیازەت‌و عیبادەتدا گۆشەگیر دەبن ، چلەی زستان .

**چیللە گوزین** : چلەگر ، ئەو کەسەی گۆشەگیری دەکاو بۆ ماوەی چل ڕۆژ خەریکی ڕیازەت‌و عیبادەت دەبێ .

**چیم** : تیپی « چ » .

**چیمەن** : بڕوانە (چەمەن) .

**چین** (١) ڕیز ، ڕیزێك لە شتێك . (٢) ناوی شار یا ووڵاتێکی بەناوبانگە لە ڕۆژهەڵاتدا ، چینستان بریتی‌یە لە ووڵاتیانی تورکستان‌و تبتی کۆن .

**چین‌و خەتا** : چین ، بڕوانە (چین) — (١) خەتا : شارێکە لە ووڵاتی چین ، ناوچەکانی باکووری چین کە بریتی‌یە لە مەنشووریاو مەنگۆلستان‌و تورکستانی ڕۆژهەڵات‌و بەشێکی سیبیریا ، ناوی تیرەیێکی مەنگۆلەکانە ، ناوی هەموو ناوچەکانی ئاسیای ڕۆژهەڵات‌و ناوەڕاست بوو . (٢) زولف‌و خەت‌و خاڵی یار .

**چین‌و ماچین** : بڕوانە ( چین‌و خەتا ) .

**چینی** : جۆرە قاپێکی قوڕە لە قوڕێکی تایبەتی دروست دەکرێ ، وە لە بەر ئەوەی خۆڵی ئەم قوڕە لە سەر دەمی کۆندا لە ووڵاتی چین دەست دەکەوت بە ناوی ئەوەوە ناو نراوە .

**چینی ماچین** : بڕوانە ( چین‌و خەتا ) .

**چین چین** : ڕیز ڕیز ، ڕیز لە سەر ڕیز .

**چیە** : بڕوانە ( چ ) .

**چێژ** : تام ، خواردن .

**چێژتن** : تام کردن ، خواردن ، خواردنەوە .

**چورووك** : قەڵپ ، بێ سوود ، ناتەواو ، ناساز ، چەوت ، نادروست ، پووچ ، بێ نرخ .

**چوزانی** : چۆن دەزانی ؟ لە کوێوە دەزانی ؟

**چوست** : چالاك ، چاپۆك ، توندو بەهێز ، سفت و جووان .

**چون** : (١) وەکو ، وەك . (٢) چونکە ، لە بەر ئەوەی .

**چونکە** : لە بەر ئەوەی .

**چووار ـ چوار** : ژمارە « ٤ » پاش سێ و پێش پێنج ، چار .

**چووار چێوە** : چووار گۆشە ، شتێکە لە چووار دار دروست کراوە و چووار سووچی هەیە دەرگاو پەنجەرەو ئاوێنەو وێنەو شتی تری تێدا دەپارێزرێ .

**چووزەرە** : لاسکی ناسکی گیا ، لاسکی ناسکی ڕێواس .

**چوون** : ڕۆیشتن ، وون بوون .

**چوونەوە** : (١) سپی بوونەوە ، کاڵ بوونەوە ، نەمانی ڕەنگ . (٢) گەڕانەوە بۆ شوێنێك .

**چۆپی** : جۆرە شایی و هەڵپەڕینێکە .

**چۆڵ** : بیابان ، سارا ، جێگەیێك ئاوەدانی تێدا نەبێ .

**چۆڵی سەلم و توور** : بڕوانە ( سەلم و توور ) .

**چرا** : ئالەتێکە ڕووناکی دەدا و بۆ تاریکی بە کار دەهێنرێ وەکو لامپا ، لەمپە ، مۆم ، قوتیلە ، فانۆس ، کارەبلو شتی تر .

**چزوو** : ئەو نووکە تیژەیە لە کلکی دووپشك و هەنگو جانەوەری تردا هەیە بۆ پێوەدان و زەهر تێ کردن بە کار دەهێنرێ .

**چزوودار** : خاوەن چزوو ، ئەو جانەوەرەی چزووی هەیە .

**چشت** : شت .

**چشتومەك** : شتومەك ، ئەشیا .

**چلۆن** : چۆن .

**چنار** : درەختێکی بێ میوەیە بەکجار بڵندە ، بەرزیی دەگاتە سی مەتر ، بەرگی پانەو قەدی زۆر ڕێکە .

**چنوور** : گیایێکی بۆن خۆشە لە شوێت دەکاو بە زۆری لە کوێستاناندا شین دەبێ .

**چیا** : شاخ ، کێو .

## ح = H

**حاجات** : کۆی (حاجەت)ە ، پێویستی ، ئاتاجی ، موحتاجی ، نیاز ، شتێك کە پێویست بێ .

**حاجی** : ئەوەی حەجی کردووە ، ئەوەی چۆتە حەج ، ئەوەی مەککەی دیوەو پێویستییەکانی حەجی هێناوەتە دی .

**حادی** : (١) ووشترەوان ، ئەو

کەسەیە کە ووشتر لێ دەخورێ بە گۆرانییەوە . (٢) ناوی ئەستێرەیێکە .

**حادیس (حادِث)** : (١) تازە ، نۆ ، نەمام ، ئەوەی تازە پەیدا بووە . (٢) ڕووداو ، کارەسات ، ئاشووب .

**حاریس (حارِس)** : پاسەوان ، دەرگاوان .

**حازیر (حاضِر)** : ئامادە ، لە ناوەوە بوو .

**حاسیل (حاصِل)** : (١) بەرهەم ، بەر . (٢) ئەوەی دەمێنێتەوە ، ئەنجامی شت .

**حاسیلات (حاصلات)** : کۆی ( حاسیل )ە ، بڕوانە (حاسیل) .

**حاشا** : بێ ، جگە ، بێجگە ، ووشەی جیا کردنەوەیە لە کارێکی خراپ . ـ **حاشا کردن** : ئینکار کردن ، بێ بەری بوون .

**حاکم** : دادوەر ، قازی ، فەرماندە ، فەرماندار ، فەرمانڕەوا .

**حاکی** : ئەوەی قسە دەکا ، ئەوەی حیکایەت دەگێڕێتەوە ، ئەوەی سەربردەو ڕووداوی ڕابردوو دەگێڕێتەوە .

**حاڵ** : (١) سیفەت و بوونی شتێک ، چۆنیەتی شتێک . (٢) ئێستا ، ئەم سەردەمە .
**حاڵات** : کۆی (حاڵ)ە ، بڕوانە (حاڵ) .

**حاڵیزار** : زمانی حاڵ ، زمانی دڵ ، هەستی ناوەوەی ئادەمزاد کە دەبێتە قسەو دێتە دەرێ .

**حاڵی کردن** : تێگەیاندن ، ڕوون کردنەوە .

**حامیل (حامِل)** (١) زگ پڕ . (٢) کەسێک بار هەڵبگرێ بە دەست یا لە سەر پشت .

**حەبەش** : (١) میللەتێکی پێست ڕەشە لە ئەفەریقادا دەژی ، کەسی پێست ڕەش . ـ **حەبەشی** : یەکێکی بە نەتەوە حەبەش بێ ، کەسێکی پێست ڕەش ، کەسێکی خەڵکی حەبەشە ( ئەثیووبیا ) بێ . (٢) کینایەتە بۆ ڕەنگی ڕەش . (٣) وولاتی زەنگ یا زەنگبار کە خەڵکی ئەوێ ڕەنگیان ڕەشە ، لە شیعردا لەشکری حەبەش یا غولامی حەبەش کینایەتە بۆ شەو ، وە لەشکری ڕۆم یا غولامی ڕۆم کینایەتە بۆ ڕۆژ .

**حەبیب (حبیب)** : یار ، دۆست ، مەعشووق ، مەحبووب ، خۆشەویست ، دڵدار .

**حەبیبە (حبیبة)** : (١) دۆستو دولبەرو خۆشەویستو دەسگیران یا ژنی نالی بووە ، شیعرە دڵداریەکانی بۆ ئەو ووتووە . (٢) مێی ( حەبیب )ە ، بڕوانە ( حەبیب ) .

**حەبیبی پاکی سوبحانی** : خۆشەویستی خاوێنی خودا ، محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان .

**حەبیبی حەق** : خۆشەویستی خودا ، محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان .

**حەببە (حبّة)** : یەکی (حەبب)ەیە ، دانە ، دانەی گەنم ، دانەی نۆکو دانەوێڵەو شتی تر .

**حەببە بە حەببە** : دانە بە دانە .

**حەبس (حبس)** : گرتن ، بەند کردن ، گرتنی کەس‌و خستنی‌یە ناو بەندیخانە ، ئازادی لە سەر هەڵگرتن .

**حەتتا** : تا .

**حەج** : (١) زیارەت کردنی کەعبە ، زیارەت کردنی ماڵی خودا . (٢) مەبەس ؛ بە بەڵگە سەرکەوتن بە سەر کەسێکدا .

**حەجلە (الحَجَلَة)** : ژووری ڕازاوەی بووکو زاوایە ، ئەو ژوورەی کە بووکو زاوا شەوی یەکەمیان تێدا دەبەنە سەر ، بە عەرەبی ( حَجَلَة ) لە کوردی‌و فارسی‌دا بە شێوەی ( حەجلە ) لە شیعری کلاسیکی‌دا هاتووە .

**حەداسەت (حَداثة)** : تازە بوون، سەرەتای هەموو شتێك ، سەرەتای جووانی .

**حەدیس (حدیث)** : (١) قسە ، هەواڵ ؛ قسەکانی پێغەمبەر . ـ زانستی‌ی حەدیس : زانستی‌یێکە خەریکی هەواڵ‌و قسەو کردەوەکانی پێغەمبەری موسوڵمانانە . (٢) تازە ، نۆ ، شتی تازە .

**حەدد (حدّ)** : (١) شتێك بکەوێتە نێوان دوو شت‌و لە یەکتری جیایان بکاتەوە ، قەراخی هەموو شتێك ، دووایی‌و کۆتایی هەموو شتێك ، سنوور . (٢) تیژی‌و توندی ، تیژی‌ی شیرو خەنجەر ، تاڵی‌ی شەراب‌و مەی . (٣) جەزای گوناهکارو تاوانبار لە جەلدە لێدان.

**حەددی چی‌یە** : توواناای نی‌یە .

**حەرارەت (حرارت)** : گەرمی ، گەرما .

**حەرارەت نوما** : پیشاندەری گەرمایی ، ڕەمزی گەرمایی ، گەرمایی نوێن .

**حەرام (حرام)** : ناڕەوا ، کارێکی کە گوناه بێ ، ئەو شتەی نابێ بخورێ .

**حەرەکات** : کۆی (حەرەکەت = حرکة)ە ، بڕوانە (حەرەکەت) .

**حەرەکەت (حرکة)** : بزووتنەوە .

**حەرەم (حَرَم)** : (١) ناوەوەی خانوو و ژوور . (٢) هەر جێگەیێکی کە پیاو دەبێ بیپارێزێ ، ئەو ژوورو جێگەیەی کە ژن‌و منداڵی لێدەژی لە ماڵدا . (٣) ناو کەعبە ، دەورو بەری کەعبە . ـ **حەرەمەین** : مەککەو مەدینە .

**حەریر (حریر)** : ئاوریشم ، قوماشی ئاوریشمین ، جل‌و بەرگی ئاوریشمی .

**حەزیرە (حظیرة)** : پەچە ، مۆڵگە، چووار دیواری ، ئەو جێ‌یەی

تەویلە ، جێگەی ژیانی چوار-پێیان .
خورمای لێ ووشك دەكرێ ،

**حەریف (حَریف)** : هاوكار ، هاوپیشە ، لایێك لەو دوو كەسەی یاری دەكەن یا زۆرانبازی دەكەن .

**حەریق (حریق)** : سووتاو ، ئەو كەسەی بە ئاگر دەسووتێ ؛ ئاگر سووتاندن ، هالاو ، گڵپە .

**حەربا (حَرْباء)** : جانەوەرێكە لە مارمێلكە دەكات ، لە بەر تیشكی هەتاودا ڕەنگی بنچینەیی دەگۆڕێ بە ڕەنگی تری جیاواز خۆی دەنوێنێ لە بەر ئەوەیە بووە بە ڕەمزی ئەو كەسەی زوو زوو بیرو ڕای خۆی دەگۆڕێ .

**حەرف (حرف)** : (١) تیپ ، یەكێك لە تیپەكانی ئەلفبا . (٢) ووشە ، ڕستە ، قسە .

**حەزەر (حَذَر)** : (١) دانیشتنێكی كە بزووتنەوەی تێدا نەبێ . (٢) ترسان ، ئاگا لە خۆبوون ، زیرەك .

**حەزین (حزین)** : خەمبار ، دڵتەنگ ، گرژ .

**حەزرەت (حضرت)** : (١) نزیكی ، دەربار . (٢) ووشەیێكە بۆ ڕیزگرتن پێش ناوی كەسی گەورەو مەزن دەووترێو دەنووسرێ .

**حەزرەتی مووسا** : بڕوانە (مووسا) .

**حەزز (حظ)** : بەخت ، نەسیب ، بەهرە ، كامەرانی .

**حەسات (حصاة)** : (١) لم ، زیخ ، خیز ، ووردەی بەرد . (٢) هۆش ، بیروڕا .

**حەسار (حصار)** : دیوار ، دیواری قەڵا ، قەڵا ، كۆمەڵە خانوویێك دیوارێكی گەورەو بەرز دەوری هەمووی دابێ .

**حەسانەوە** : ماندوو دەرهاتن ، نەمانی ماندوویی ، ئاسایش بوون ، ئاسوودە بوون ، ئاسوودەیی .

**حەسەن (حَسَن)** : چاك ، باش ، جوان .

**حەسیر (حصیر)** : (١) ڕایەخێكە لە قامیش یا بەرگو گەڵای دار خورما دروست دەكرێ . (٢) جێگەی تەنگ ، بەندیخانە ، زیندان .

**حەسوود (حسود)** : ئەو كەسەیە كە نەتووانێ دەوڵەمەندیو بەختیاریی خەڵكی تر ببینێو ئارەزووی لەناوچوونی بكا .

**حەسرەت (حسرت)** : ئەفسووس ، داخ كێشان ، ئاخو داخ كێشان ، درێغ .

**حەسنا (حسناء)** : مێی (حەسەن = حسن)ە ، ژنی جوان .

**حەشیش (حشیش)** : گیا ، گیای ووشك .

**حەفیر ـ حەفیرە (حفیرة)** : چاڵ ، كەند ، پێچاڵ ، گۆڕ ، قەبر ، بیر ، قووڵایی .

**حەق (حق)** : (١) ڕاست ، دروست ، کارێك کە ڕوو بدا . (٢) یەکسانی . (٣) بەش لە سامانو پاشماوەو میرات . (٤) خودا .

**حەقق** : بڕوانە (حەق ).

**حەقیقەت (حقیقت)** : نەژادی شت ، بنجو بناوانی شت ، ڕاستیو دروستی .

**حەقیقی (حقیقی)** : ڕاستو دروست ، ڕەسەن ، نەژاد پاك .

**حەل (حل)** : (١) کردنەوە ، ئازاد کردن ، بەرەڵلا کردن . (٢) گەیشتنە ئەنجام . (٣) تێکەڵ کردنی شتێك لەگەڵ ئاودا .

**حەلاوەت (حلاوت)** : شیرین بوون ، شیرین کردن ، شیرینی .

**حەلق (حلق)** : گەروو ، ئەو ئەندامەیە کە خواردنی پێدا دەڕوا لە دەمەوە تا وورگ .

**حەلقە (حلقە)** : (١) چەمبەر ، هەموو شتێکی خوواری کەوانی ، شتی خڕو کەوانی وەکو حەلقەی ئەنگوستە یا حەلقە ڕیزی دەرگا یا حەلقەی گو . (٢) کۆڕ ، کۆ بوونەوە ، ئەنجومەن .

**حەلقە حەلقە** : زولفی گرژی بە گوریزە ، ئەو زولفەی چەماوەتەوەو خووارو خێچی تێدایە .

**حەلقە دەر گوش** : حەلقە لە گو ، کینایەتە بۆ بەندەو عەبدو غولامو پێش خزمەتو خزمەتکار .

**حەلقەیی زیکر** : ڕیزی دەروێشان بۆ زیکرو تەهلیلە .

**حەلال (حلال)** : ڕەوا ، بەپێی شەرع ، دژی حەرام .

**حەمامات (حمامات)** : کۆی (حەمام = حمام)ە ، کۆتر ، قومری .

**حەمایل (حمایل)** : بریتییە لە کیفێکی چەرمین نوشتەی دەخرێتە ناو و ڕستەیێکی چەرمی پێوەیەو ڕاستو چەپ لە مل دەکرێ .

**حەمدولیللا (حمدلله)** : ستایش بۆ خودا ، سوپاس بۆ خودا .

**حەمرا (حمراء)** : مێی (ئەحمەر = احمر)ە ، (١) ژنی ڕوو سووری جووان . (٢) سالی سەختو قاتو بێ بەرهەمو گەرما .

**حەمل (حمل)** : (١) زگ پڕی . (٢) بار . (٣) بەری دارو درەخت .

**حەنا (حنا)** : خەنە ، دارێکی بچووکە بلندی تا دوو مەترەیە ، گەلای وەکو گەلای دار هەنارە ، گولی سپیو بۆن خۆشو لە شێوەی هێشوودایە ، گەلای خۆش دەکرێو ژنان مووی سەرو دەستو پێیان پێ ڕەنگ دەکەن . ـ **گولی خەنە** : جۆرە گولێکە لە باخ شین دەبێ .

**حەنایی** : خەنەیی ، ڕەنگی خەنە ، سووری خەنەیی .

**حەننان (حنّان)** : (١) یەکجار دلسۆز ، یەکجار میهرەبان . (٢) یەکێکە لە ناوەکانی خودا .

**حەوادیس (حوادث)** : کۆی (حادیس = حادث)ە ، بڕوانە (حادیس) .

**حەوز (حوض)** : چاڵاو ، ئـەو جێیەی ئاوی لێ کۆ دەبێتەوە .

**حەوزی پەری** : ڕەنـگە نـاوی حەوزێك بوو بێ لەو مەدرەسەیەی کە شاعیر یادی دەکاتەوە .

**حەوش** : دەوری خانوو ، ناوەوەی ماڵو خانوو بێجگە لە ژوور .

**حەوشە** : بڕوانە (حەوش) .

**حەووا (حوآ)** : ژنی ئادەمـە ، بڕوانە (ئادەم) .

**حەی (حیّ)** : (١) زینـدوو ، گیاندار ، نەمر ، خودا . (٢) مار . (٣) گونـد ، ئاوایی ، ئـاوەدانی ، گەڕەك ، قەوم ، عەشیرەت .

**حەیـا (حیـاء)** : شـەرم ، خۆپاراستن لە تانە .

**حەیات (حیاة)** : ژیان، زیندەگانی، زیندوویی .

**حەیی ئەکبەر** : زینـدوویی گەورەتر ، خودا .

**حەیدەر (حیدر)** : (١) یەکێکە لە نـاوەکانی خەلیفـەی چـوارەمی ڕاشیـدین عەلی‌ی کـوڕی ئەبـوو تالیب ، بڕوانە (عەلی) . (٢) شێر ، شێری قەد باریك .

**حەیران** : سەر گەردان ، ئاوارە ، دەربەدەر .

**حـەیف (حـیف)** : زۆرداری ، ستەم ، ئاخو داخ .

**حەیفە** : بڕوانە (حەیف) .

**حەیی ـ حەیە (حیّة)** : مار .

**حیجاب (حجاب)** : پەردە ، ڕوو پۆش ، ڕوو بەند .

**حیجاز (حجاز)** : (١) نـاوی ناوچەیێکە لە عەرەبستان ، مەککـەو مەدینەو جێگە پـیرۆزەکانی ئایینی موسوڵمانی لێیە ، ڕۆژگارێکی درێژ کەوتبووە ژێر دەسـەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی ، لە ساڵی ١٩١٩ لە ژێر بـاری دەوڵەتی عوسـمانی ڕزگاری بوو و لـە پاش شۆڕشو ئـاژاوە مەملـەکەتی عـەرەبی سـوعوودی لێدروست بوو ، پایتەختی شـاری (ریـاز = ریـاض)ە . (٢) نـاوی ئاهەنگێکی مۆسیقایە .

**حیدەت (حِدّة)** : تیـژی ، توندی ، تووڕەیی ، نواندنی زەبرو زەنگی .

**حیرەت (حیرة)** : سـەرگەردانی ، ئاوارە ، دەربەدەر .

**حیرەت زەدە** : سـەرگەردان ، ئاوارەیی ، دەربەدەری .

**حیرس (حرص)** : ئارەزووی بە هێز ، ویستنی بە هێز ، مەیلی زۆر بۆ شتێك ، تەماع ، چاوبرسیەتی .

**حیز** : نامـەرد ، چـاو شـۆر ، قوونەدەر ، قەحبە .

**حیساب (حِساب)** : ژمـاردن ، ژمارە کردن ، ژمارە ، ئەندازە .

**حیفز (حِفظ)** : (١) پاراسـتن ، پاسەوانی ، ئاگابوون لە شتێك تا تێك نەچێ . (٢) ئەزبەرکردن ، لە بەرکردنی شیعر یا هەر نووسینو قسەیێکی تر .

**حیکایات (حِکایات)** : کـــۆی (حیکایەت = حِکایة)ە ، داستان ، ســەر گوزەشــتە ، ســەرو ســەر گوزەشتە ، ســەرو سەر بــردەی پێشینان ، گێــڕانەوەی هــەواڵ لە بابەت هەر شتێکەوە بێ .

**حیکەم (حِکَم)** : کۆی (حیکمەت = حکمة) ، بڕوانە (حیکمەت) .

**حیکەم پەروەری** : خۆشویستنی حیکمەت ، بڕوانە (حیکمەت) .

**حیکمەت** : فەلســەفە ، قســەی بەجێ ، ڕاستیو دروستی لە هەموو شتێك ، داد پەروەری ، زانستی ، ژیریو دووربینی .

**حیلم (حِلم)** : لە ســــەرخۆیی ، هێمنی ، دژی توندو تیژی .

**حوب (حُبّ)** : دۆستی ، عیشق، دڵداری .

**حوججەت (حُجّة)** : بەڵـــگە ، دەلیل ، بورهان .

**حوجرە (حجرة)** : (١) دوکـــانی بەزاز ، جێگەی قوماش فرۆشتن . (٢) ژوور . (٣) حوجرەی مزگەوتو دەرز خوێندن ، ژوورو دوکانی دەرز خوێندن . (٤) کەعبە .

**حوجــرەی ڕەوزە** : ئارامـــگای محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان لە شاری مەدینە .

**حورمەت (حُرمت)** : ئابـــڕوو ، ڕێز ، ئەرجومەندی .

**حوزوور (حضور)** : (١) ئامـــادە بـــوون ، ئامادەکـــردن ، لـــە نزیك کەسێکدا بوون . (٢) ووشەی ڕێز گرتنە لە پێش ناوی کەسی گەورە دەووترێو دەنووسرێ .

**حوسن (حُسن)** : چاکی ، باشی ، جووانی .

**حوققە (حُقّة)** : قوتـــــوو ، ســـندووقی بچـــووکی جـــووان کە جەواهیری لە ناو دەپارێزرێ .

**حوکەما (حکماء)** : کۆی (حەکیم = حکیم)ە ، زانا ، دانا ، خـــاوەن حیکمەت .

**حوور** : بڕوانە (حۆری) .

**حووری عین** : بڕوانە (حۆری) .

**حۆری (حووری)** : (١) چـــاو ڕەش ، چاو جووان ، ژنی یەکجـــار جـــووان . (٢) ژنـــانی جـــووانی بەهەشت ، (حووری عین = حور العین)یشیان پێدەڵێن .

## خ = x

**خائیب (خـــائب)** : نائومێـــــد ، دڵشکاو ، بێبەهرە ، مەئیووس .

**خاتەمی شان** : مـــۆری شـــان ، نیشـــانەی شان ، گۆیـــا محـــەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان نیشانەیێك لە ناو شانیدا بووە ، ئەوە نیشـانەی پێغەمبەری بووە .

**خاتیر (خاطِر)** : ئەندێشـە ، دڵ ، دەروون ، خەیاڵ .

**خاتیم (خاتِم)** : (١) دوواییـــی ،

پایان ، کۆتایی ، دووایی هەر شتێك .
(۲) ئەموستیلە . (۳) مۆر .

**خاتیمە (خاتمە)** : مێی (خاتیم)ە ، بڕوانە (خاتیم) .

**خاتیمی ڕەسول (خاتم الرسل)** : دووا پێغەمبەر ، ئەو پێغەمبەرەی پێغەمبەری تری لە دوواداً نی‌یە ، محەمەد پێغەمبەری موسولمانان .

**خادیم (خادم)** : خزمەتکار ، نۆکەر .

**خار** : دڕك ، تیغی دارو دەوەن .

**خارا** : (۱) گرانیت ، جۆرە بەردێکی یەکجار ڕەق و لووسە . (۲) جۆرە قوماشێکی ئاورێشمی‌یە .

**خاریج (خارج)** : دەرەوە ، دیوی دەرەوەی هەموو شتێك ، ڕووکەشی هەموو شتێك ، ئەوەی دیارە لە هەموو شتێك .

**خاریق (خارق)** : پارچەکەر ، ئەوەی شت دەدڕێنێ ، ئەوەی لە ناو شت دەچێتە دەرەوە ، ئەوەی خوو و ڕەووشتی کۆمەڵایەتی لە یەکتری دەدا .

**خاس (خاص)** : تایبەتی ، تەنیا ، هەڵبژێرراو .

**خاسیر (خاسر)** : زیان کردن ، دۆڕاندن ، لە دەست چوون .

**خاسیەت (خاصیة)** : خوو و ڕەووشت ، تەبیعەتی کەسێك یا شتێك ، سوودی شت .

**خاسسە (خاصة)** : هێزو تووانای تایبەتی‌ی ناوەوەی کە لە شتدا هەیە ، دژی گشتی .

**خاقان** : شاه ، لە کۆندا لەقەبی پاشایانی چین و تورکستان بووە .

**خاقانی** : (۱) ئەفزەلوددین بەدیل کوڕی عەلی‌ی خاقانی لە نێوان ساڵانی (۱۱۰٦ ـ ۱۱۹۸ز)دا ژیاوە ، لە گەورەترین شاعیرانی سەدەی دووازدەمی ئێرانە . شاعیری دەرباری خاقانی ئەکبەر مەنووچەهر کوڕی فەرەیدوون شیروانشا بوو ، ناز ناوی لەم شایە وەرگرتووە ، یەکێکە لە مامۆستایانی غەزەلی فارسی . (۲) شاهی ، سەربەشا .

**خاك** : (۱) خۆڵ ، ڕووی زەوی ، ئەو بەشە دیارەی زەوی‌یە کە دارو درەخت و گیای لێ شین دەبێ . (۲) نیشتمان ، وڵات .

**خاکی** : (۱) دەبێ نازناوی شاعیرێکی کورد بێ ، بەڵام مێژووی ئەدەبی کوردی ناوی وای دەور نەکردووە لە سەردەمی ژیانی نالی‌دا ، هەروەها شیعریشی لە ناوەوە نی‌یە ، زۆر سەیریش نی‌یە شاعیرێکی مەزنی وەکو نالی شانازی بە شاعیرێکی نەناسراوی وەکو خاکی کردبێ ، چونکە لە پێش ئەودا شاعیرێکی ناسراوو گەورەی وەکو حافزی شیرازی شانازی بە خواجۆی کرمانی (۱۲۹۰ ـ ۱۳۵۲ز) کردووە . (۲) نیسبەتە بە خاك ، سەر بە خاك ، ئەوەی لە خاك دروست بووە یا ڕەنگی وەکو ڕەنگی خاك وایە ،

کینایەتە بۆ کەسی خوواروو زەلیلو سەر شۆڕ .

**خاکو خۆڵ** : گوندێکە لە ناو جەرگەی شارەزوور نزیکی ڕووباری تانجەرۆیە ، ماوەی ٢٥ کیلۆمەترەیێك کەوتۆتە لای خوواروی ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە ، ئەمە مەڵبەندی تیرەی مکایلی هۆزی گۆران بووە ، نالی کەسێکی ئەم تیرەو هۆزە بووەو لەم « خاکو خۆڵ »ەشدا لە دایك بووە ، ئەم خاکو خۆڵو شارەزوورە بەم فرزەندە بلیمەتە سەربلندو بەختیارە ، لەو ڕۆژەی بووە ڕۆڵەی وای نەبووە تا ئەمڕۆ .

**خاکستەر** : خۆڵەمێش ، مشکی ، ئەو خاکەیە کە لە ئەنجامی سووتانی دارو دەوەن دروست دەبێو ڕەنگی بۆرە .

**خالیس (خالص)** : پاکو خاوێن ، بێگەرد ، بێغەش .

**خاڵ ــ خال** : (١) نوختەیێکی ڕەشە لە سەر پێستدا دەبێ ، پەڵەیێکی بچووکە یا نوختەیێکی ڕەشە لە سەر ڕووی شت پەیدا دەبێ . (٢) برای دایك .

**خالی ــ خالی** : (١) بەتاڵ ، بێ ناووك . (٢) تەنیا ، مێردی بێژن .

**خام** : (١) خاو ، نەگەیشتوو ، نەگەیو ، هەر شتێکی کە دەستکاری نەکرا بێو لە سەر تەبیعەتی خۆی مابێتەوە . (٢) پێستی دەباغ نەکراو (٣) کەمەند .

**خامە** : (١) قەڵەم ، پێنووس ، هەموو شتێکی کە پێی بنووسرێ ، ئەو قامیشەیە کە دەکرێ بە قەڵەم . (٢) ئاوریشمی خاو . (٣) نویشك ، کەرە ، چەوریی ڕووی شیر .

**خامەك** : قوماشێکی نەرمو ناسکی ئاوریشمییە جلو بەرگی ژنانی لێ دروست دەکرا ، وە بە زۆری لە کوردستاندا دەکرا بە کۆبەی ناوەوەی کەوای ژنان .

**خامۆش** : بێ بزووتنەوە ، بێ دەنگ ، ئارام ، کەسێکی لێوی نەجوولێتەوەو قسە نەکا ، چرا یا هەر ئاگرێکی کە گلپەو گەرمی نەمابێو بەرەو نەمان ڕۆیشتبێ .

**خان** : (١) ماڵ ، خانوو . (٢) کاروانسەرا . (٣) دوکان . (٤) جێگەی حەسانەوەی میوانان . (٥) سەرۆك ، میر ، سەرۆکی خێڵ . (٦) بۆ ڕێز گرتن لە پێش یا لە پاش ناو دەووترێو دەنووسرێ ، لە ناو کوردەواریدا هەیە .

**خانە** : خانوو ، ژوور ، سەرا ، جێگە ، ماڵ ، چووار دیواری کە بنمیچی هەبێ ، ئەو جێیەی کە ئادەمزاد تێیدا دەژی .

**خانەدان** : ئەسڵ زادە ، ئۆجاغ زادە ، خانەوادەی پاك نەژاد ، کوڕی ماڵە گەورە .

**خانەقا** : جێی کۆبوونەوەی دەروێشو مریدو شێخی تەریقەتە ، بە زۆری لە کوردستاندا جێی دەروێشانی تەریقەتی نەقشییە .

**خانومان** : (١) خێزان ، خانەوادە، بنەماڵە ، ماڵ ، خەڵکی ناو ماڵ ، ژنو منداڵ ، هەموو شتێکی زیندەگانی . (٢) شۆخو شەنگ ، چەلەنگ ، جووان ، لە بار .

**خانم** : خاتوون ، بانوو ، ژنی گەورە ، ووشەی ڕێز گرتنە بۆ ژنان بە کار دەهێنرێ .

**خاو** : (١) بڕوانە (خام) . (٢) گیایێکی بەرزو زۆر نەرمە لە کوێستانان‌دا شین دەبێ .

**خاوەر (خاوَر)** : ڕۆژهەڵات .

**خەبایا (خبایا)** : کۆی (خەبیئە = خبیئە)یە ، داپۆشراو ، شارراوە ، نادیار ، پەنهان ، نهێنی .

**خەبەر (خَبَر)** : ئاگاداری ئاگا ، قسە ، ئەوەی لە بابەت قسەو کرداری کەسێك بووترێ ، هەر شتێکی لە بابەت ڕووداو بووترێ یا بنووسرێ .

**خەت (خط)**: (١) نووسین ، شوێنی قەڵەم لە سەر ڕووی کاغەز یا شتێکی تر ، دێڕی نووسین ، دێڕی شیعر . (٢) ڕێگەی ڕاست . (٣) ماوەی نێوان دوو نوختە . (٤) تاڵ ، تەل ، تاڵی ڕووناکی ، تەلی ڕووناکی .

**خەتا** : ناوی کۆنی ناوچەکانی باکووری چینە کە موشکی ئەو ناوە بە ناوبانگ بووە ، بڕوانە ( چین‌و خەتا ) .

**خەتا (خطا)** : تاوان ، سووچ ، نادروست ، ناڕاست ، تاوان‌و گوناهێکی بە ئانقەست نەکرابێ .

**خەتەر (خطر)** : (١) نزیك بوونەوە لە کارەسات ، ئەوەی دەبێتە مایەی لە ناو چوونی کەسێك یا شتێك . (٢) گەورەیی‌و جێگەی بڵند ، پلەی بەرزی کۆمەڵایەتی .

**خەتی بەیاز** : هەموو خەتێکی ڕەش بە سەر سپی‌دا هاتبێ ، نووسینی دەفتەری شیعر ، دێڕی شیعر لە بەیازدا .

**خەتیر (خطیر)** : گەورە ، مەزن ، پلەی بڵند ، خاوەن قەدرو قیمەت ، شەریف .

**خەتی سەبز** : (١) ئەو خەتەیە کە تازە لە ڕوخساری مێرد منداڵ‌و لاو و گەنج دەردێ ، (٢) ئەو نووسینەیە کە لە عالەمی غەیبەوە دێ ، واتە کەس نازانێ لە کووە هاتووە یا کێ نووسیویەتی .

**خەتی شکستە** : جۆرە خەتێکە بە زۆری لە نووسینی کۆنی فارسی‌و کوردی‌دا بە کار دەهێنرا .

**خەت‌و خاڵ** : کینایەتە بۆ برژانگ‌و چاو و برۆ .

**خەت بە خەت** : خەت لە دووای خەت ، ڕەنگ لە دووای ڕەنگ ، دێڕ لە دووای دێڕ .

**خەتت (خطّ)** : بڕوانە (خەت) .

**خەت زەنگی** : خەتی ڕەش ، خەت‌و خاڵی ڕەش .

**خەتمی ( خطمی )** : هێرو ،

**خەتمە** ، ناوی گیاییکە قەدی ئەستوورو بلندە ، گەڵای پانو گوڵی درشتی سپیو سووری هەیە ، گوڵو دەماری بۆ دەرمان بە کار دەهێنرێ ، یەکێکە لە گوڵە ڕەنگاوڕەنگە ماڵییە جووانەکانی کە لە باخچەدا دەڕوێنرێ .

**خەتمی ڕوسول** : بڕوانە (خاتیمی ڕوسول) .

**خەجاڵەت** : شەرم ، شەرمنی ، شەرمەزاری ، حەیا .

**خەجلەت** : شەرم کردن ، شەرمنی .

**خەدەنگ** : (١) دارێکی سەختو قورسو پتەوە ، تیرو نێزەو زینی ئەسپی لێ دروست دەکەن . (٢) دارگەز ، درەختی گەز (٣) تیری ڕاستو درێژ .

**خەد (خد)** : ڕوومەت ، گۆنا ، ڕوخسار ، چەهرە .

**خەرابات** : مەیخانە ، شەرابخانە، قومارخانە ، لە بنجدا بە عەرەبی (خَرِبات)ە ، کۆی (خەربە = خَربە)یە بە مانای وێرانەو کاوولگە هاتووە .

**خەرابە** : بڕوانە (خەراپ) .

**خەراپ** : وێران ، زەبوون ، بۆگەن ، وون بوو ، بێ کەڵكو مانا بۆ کارو کردەوەو قسە ، دژی چاك .

**خەراج (خَراج)** : باج ، ئەو ماڵەیە کە لە باتی بە کار هێنانی زەوی لە بەرهەمی کشتوکاڵو شتی تر وەردەگیرێ .

**خەراجات** : کۆی (خەراج = خراج)ە ، بڕوانە (خەراج) .

**خەرامیدەن(خرامیدن)** : بە نازو لە خۆ بایی لە ڕێگا ڕۆیشتن .

**خەرەف (خَرَف)** : کەودەن ، دەبەنگ ، خەڵەفاو ، خرفاو ، کەسی کەم عەقل ، تێك چوونی عەقل لە ئەنجامی بە ساڵدا چوونو پیری .

**خەرەك** : (١) ئالەتێکە بۆ ڕستنی خوری یا لۆکە بە کار دەهێنرێ . (٢) شتێکە چووار پێی هەیە لە دارو چەرم دروست دەکرێ بە شێوەی هەیکەلی کەر لە وەرزیندا بە کار دەهێنرێ بۆ بازدان لە سەری .

**خەریك** : کەسێکە بە کارێکەوە ئالابێو مەبەسی جێبەجێ کردنی بێ .

**خەرج (خَرج)** : باج ، دژی دەسکەوت ، بڕوانە (خەراج) .

**خەرزیە** : کێر ، کیر ، ئەندامی پیاو .

**خەرقە** : تیلمە ، پارچەی جل ، پارچەییکی بچووك لە قوماش ، جلێك لە پارچەی بچووك بچووکی جۆراو جۆر دروست کرابێ ، جلێك پینەی زۆری پێوە بێ ، جلو بەرگی دەروێشان .

**خەرقەیی ئەزرەق** : پەڕۆکی شین ، کینایەیە لە بۆ فێڵ ، فێڵبازی ، ساختەچییەتی ، فریودان .

**خەرقە پۆش** : دەروێش .

**خەرکوڕە** : جاش ، جاشوولکە ، جاشك .

**خەرگۆر ـ گۆرخەر** : کەری کێوی .

**خەرمان** : بەرو بوومی شت ، بەرهەمی گەنم یا جۆ کە لە جۆخیندا کۆ دەکرێتەوە ، بەرهەمی دانەوێلە ئەوەی نەکوتراوەو لە کا جیادا نەکراوەتەوە .

**خەرمانە** : هالە ، ئەو هێلە کەوانەیی‌یەیە کە لە دەوری مانگدا خۆی دەنوێنێ .

**خەرمەن** : بڕوانە (خەرمان) .

**خەز** : (١) ئاوریشم ، پارچەی ئاوریشمی ، پارچەی لە ئاوریشم دروست کراو . (٢) ناوی جانەوەرێکی بچووکو کولکنە لە سمۆرە دەکات ، پێستی قاوەیی یا خۆڵەمێشی‌یە، گەلێ گرانو بەنرخەو جلی لێ دروست دەکرێ .

**خەزان** (١) بڕوانە (پاییز) . (٢) کۆی (خەز)ە ، بڕوانە (خەز) .

**خەزینە** : گەنج ، گەنجینە ، خەزنە .

**خەزرا (خضراء)** : مێی (ئەخزەر = أخضر)ە ، سەوز ، ڕەنگی سەوز ، کەسك ، گیای سەوز ، سەوزە .

**خەس** : (١) دڕك ، کا ، ئالیك . (٢) ناکەس ، کەسی پەست .

**خەسارات** : کۆی (خەسارەت = خسارة)ە ، زیان ، لە دەست چوون ، وون بوون ، دۆڕاندن .

**خەسەکزار** : دڕکەلان ، ئەو جێیەی دڕکی زۆری لێ بێ .

**خەستە** : نەخۆش ، دەردەدار ، بیمار ، زامدار ، ماندوو لە ئەنجامی کاری زۆر .

**خەسف (خسف)** : خستن ، هێنانە خووارەوە ، قووت دان ، شاردنەوە ، گوم کردن .

**خەسفەلقەمەر (خَسَفَ القمر)** : مانگ گیرا .

**خەسم (خصم)** : دوژمن .

**خەشین** : (١) زبر ، درشت . (٢) هەموو شتێکی ڕەنگ نیلی ، ڕەنگی تۆخ ، ڕەنگی سپی .

**خەشین‌پۆش** : پۆشینی جلوبەرگی زبر .

**خەفی (خَفِيّ)** : شاراوە ، نادیار ، پەنهان .

**خەلات ( خِلعَت ـ خَلعَت )** : جل یا هەر شتێکی تر کە لە لایەن کەسێکی گەورەوە بە ناوی پاداشو دیاری پێشکەشی کەسێك بکرێ .

**خەلاس (خلاص)** : ڕزگار بوون ، قورتار بوون ، ئازاد بوون .

**خەلاسی (خلاصی)** : ڕزگاری ، ئازادی .

**خەلەف (خَلَف)** : نەوە ، نەوەی چاك ، بەدەل ، داهاتوو ، کەسێکە لە دووای کەسێکی ترەوە بێ ، جێ نشین .

**خەلیفە (خليفه)** : (١) جێ‌نشینی پێغەمبەر یا ئیمام . (٢) جێ‌نشین ، ئەو کەسەیە کە لە جێی کەسێکی تر

دادەنیشێ . (٣) ناوی سەرۆکی دەوڵەتە ئیسلامییەکان بوو لە پاش محەمەدەوە تا ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی .

**خەڵووز** : ڕەژوو ، پشکۆی ئاگری کوژاوە .

**خەڵعەت ـ خیلعەت** : پۆشین ، بڕوانە (خەڵات) .

**خەلق (خلق)** (١) داهێنان ، دروست کردن . (٢) خەڵک ، مەردوم ، کەس .

**خەلقی** : بڕوانە (خەلق) .

**خەلوە** : بڕوانە (خەلوەت) .

**خەڵوەت (خلوت)** : تەنیایی ، جێی بەتاڵ .

**خەڵوەت نشین** : دەروێش ، گۆشەگیر ، ئەوەی دەستی لە دونیا هەڵگرتووە .

**خەڵوەنشین** : بڕوانە (خەڵوەت نشین) .

**خەم** : خووار ، کەچ ، پێچ ، دژی ڕاست ، بۆ زولف و گیسوو و کەوان و پەیکەکردنی مار و خووارێی مانگ و تاقی هەیوان و دەرگاو خانوو بە کار دەهێنرێ .

**خەمی هیلال** : پێچی مانگی تازە ، کەوانەیی مانگی یەک شەوە ، خوواریی مانگی نۆ .

**خەمۆش** : بڕوانە (خامۆش) .

**خەملاندن** : جووان کردن ، ئارایش کردن .

**خەملین** : بڕوانە (خەملاندن) .

**خەنە** : بڕوانە (حەنا) .

**خەندە** : بزە ، پێکەنین ، کرانەوەی لێو لە ئەنجامی شادیو گوشادیدا .

**خەو** : (١) نوستن . (٢) خەون ، خەوبینین .

**خەوف (خوف)** : ترس .

**خەوفناك** : ترسناك .

**خەیال ـ خەیاڵ (خیال)** : ئەندێشە ، گومان ، وەهم .

**خەیاڵات** : کۆی (خەیال = خیال)ە ، بڕوانە (خەیال) .

**خەیرولبەشەر (خیرالبشر)** : چاکترینی خەڵك ، پاکترین ئادەمزاد ، محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان .

**خەیمە (خیمة)** : (١) ڕەشماڵ ، چادر ، دەوار . (٢) ئاسمان .

**خیتاب (خطاب)** : قسەی ڕوو بە ڕوو ، ئەو قسەیەی ڕوو بە ڕوو بە کەسێك دەووترێ ، ئەو قسەیەی کەسێك بە یەکێکی تر بڵێ و ئەو وەڵامی بداتەوە .

**خیتتە (خطة)** : (١) پارچەیێك ئەرز ، ئەو زەوییەیە کە خەتی کێشراوەو بۆ خانوو دروست کردن ئامادە کراوە ، زەویی خەت کێشراو . (٢) شاری گەورە .

**خیرەدوون** : سەرکێش ، بێ شەرم ، بێ پەروا ، نزم ، هەرزە .

**خیرەدمەند** : زانا ، دانا ، هوشیار ، بە هۆش ، عاقل .

**خـیرس (خِـرس)** : وورچ ، هەرس .

**خیلال** : چیلکەی ددان ئاژنین ، ئـەو گیایەیـە کـە لـە بەهـاردا دەڕوێو ووشـك دەکرێتـەوەو بۆ ددان پاك کردنەوە بە کار دەهێنرێ ، بە کـوردی لە ناوچـەی هەولێـر (خلتـانە)و لـە ناوچەی سـلێمانی (خەلیلە)ی پێ دەڵێن .

**خیلعەت** : پۆشـین ، بڕوانـە (خەڵات) .

**خێر (خَیر)** : چاکی ، باشی .

**خێل** : ئـەو کەسەیە کـە چاوی خووار بێ ، ئەو کەسەیە ڕەشیەی چاوی لە جێی خۆی نەبێ ، ئەو کەسـەیە تـرازووی چـاوی تێك چووبێ .

**خێوەت** : بڕوانە (خەیمە) .

**خوتەن** : ناوی کۆنی بەشێك لە تورکستانی ڕۆژهەڵات یا تورکستانی چینە کە مامزی موشکی ئەوێ بە ناو بانگ بووە ، بڕوانە (موشك) .

**خوتووت (خطوط)** : کۆی (خەت = خط)ە ، بڕوانە (خەت) .

**خوتوور (خُطور)** : هاتنەوە بیر ، یاد ، شتێك لە بیر کـرابێو بێتەوە بیر .

**خود** : خۆ ، کەس ، نەفس .

**خودا** : (۱) خـووا ، ئەڵـلا ، پەروەردگاری بێ هاوتا ، خوداوەند ، یەزدان . (۲) خاوەن ، خاوەند .

**خوداگرتن** : ئازار دان لە لایـەن خوداوە ، کەوتنە بەر دادگای خودا ، سـەندنی تۆڵـە لـە بەندەیێـکی گوناهکار .

**خودایا !** : ئەی خودا ! .

**خودایە !** : بڕوانە (خودایا !) .

**خوداوەند** : بڕوانە (خودا) .

**خود بە خود** : خۆ بە خۆ .

**خودبین** : خۆبین ، ئەو کەسەیە کە تەنیا خـۆی ببینێو بایـەخ بە خەڵکی تر نەدا ، لە خۆبایی ، لووت بەرز .

**خود پەسند** : خۆ هەڵکێش ، ئەو کەسـەی کە کـردەوەو ڕەفتـارو قسەی خۆی پەسند دەکا .

**خودام (خدّام)** : کـۆی (خادیم = خادم)ە ، بڕوانە (خادیم) .

**خود نما** : خۆ نوێن ، ئـەوەی خۆی دەنوێنـێ ، ئـەوەی خـۆی پیشان دەدا ، ئەو کەسەیە کە خۆیو کاری خۆی بە باشی دەنوێنێو چاکی خۆی دەگەیێنێتە خەڵکی تر .

**خورافات (خُرافات)** : کـۆی (خورافە = خرافة)یە ، قسەی بێ مانا ، قسـەی پووچو بێکەڵـك ، ئەفسانە .

**خورووج (خُروج)**: (۱)دەرچوون، چوونـە دەرەوە ، دەرپـەڕین . (۲) لـە قافیەی شـیعردا تیپێـکی نەرمە لە پـاش « هێ »ی وەسڵدا دێ . (۳) سـفرێکە لە سـفرەکانی تـەورات . (٤) ڕۆژی قیامـەت . (٥) ڕۆژی جەژن .

**خورووس** : کەڵەشێر، کەڵەباب.

**خوردە ساڵ** : منداڵ ، بە تەمەن بچووك .

**خورسەند** : شاد ، گوشاد ، شادمان ، دڵخۆش .

**خورشید** : ڕۆژ ، خۆر .

**خورشیدی تابان** : ڕۆژی ڕووناك.

**خوڕ** : دەنگی ئاو ، ڕۆیشتنی ئاو.

**خوڕەم (خرّم)** : (١) شاد ، گوشاد ، شادمان ، دڵخۆش . (٢) تەڕو تازەو ئاودار .

**خوسووسەن (خصوصاً)** : بە تایبەتی .

**خوسووسی (خصوصی)** : تایبەتی ، بەڕادان دان ، شتێك بە ڕاسپاردن دروست بکرێ .

**خوست** : (١) هەست ، دەنگ . (٢) دوڕگە ، جزیرە ، پارچە زەوییێکی ووشك لە ناو زەریا . (٣) ڕێگەی خراپو ڕووخاو .

**خوسر (خسر)** : زیان ، زیان کردن، دۆڕاندن ، لە دەستچوون .

**خوسرەو** : خوسرەوی دووەم یا خوسرەوی پەرویز ، ئەوەی نەوشیروانی دادپەروەرە ، لە سەردەمی ئەودا پێغەمبەری موسوڵمانان محەمەد پەیدا بوو ، خوسرەو پادشاییکی خاوەن شکۆ بوو ، دەوڵەمەندیو گەنجینەکانی بوون بە ئەفسانە ، دڵداریی لەگەڵ شیرین بووە بە سەرچاوەی چیرۆکی شیعری لە ئەدەبیاتدا .

**خوسرەوی خاوەر** : ڕۆژ، خۆر .

**خوشا** : ئەی خۆشی ! ، چی خۆشە ! بە عەرەبی (طوبی) .

**خوشك** : هەموو مێینەییکی کە لە دایكو باوکت بێ ، ئەگەر لە یەکێکیان بێ بە تایبەتی دایکت « زڕ خوشك »ی پێ دەڵێن .

**خوفتە** : نووستوو ، خەو لێ کەوتوو .

**خوفیە (خفیە)** : شاردنەوە ، داپۆشین ، پەنهان کردن ، لە چاو وون کردن ، بە دزی .

**خولاسە (خلاصە)** : نویشکی هەموو شتێك ، جەوهەری هەموو شتێك .

**خولق : (خلق)** : خوو ، ڕەووشت ، خووڕەووشت ، تەبیعەت .

**خولقی باتین** : خوو و ڕەووشتی ناوەوە ، خوو و ڕەووشتی شارراوە .

**خوم** : (١) کووپە ، کووپەڵە ، سەبوو ، شتێکە لە قوڕ دروست دەکرێو سوور دەکرێتەوە ، سرکە یا شەرابی لە ناو دەگیرێتەوە . (٢) خم ، هەش ، هەژ ، ڕەنگێکی شینی تێرە بەنو قوماشو شتی تری پێ ڕەنگ دەکرێو هەر لە ناو ئەو کووپانەش دەگیرێتەوە ، ڕەنگی خومی نیلی لە ناو کوردەواریدا ڕەمزی مردنو تەعزیەو کارەساتە .

**خونکار** : خۆنڕێژ ، ئەوەی خۆن دەڕێژێ ، ئەوەی کەسێك دەکوژێ .

**خـــوار ـ خـــووار** : (١) لای خووارەوە ، جنـووب ، نیوەڕۆ . (٢) بن ، ژێر ، دژی ڕاست .

**خواری ـ خوواری** : (١) خەم ، کەچ ، دژی ڕاستی . (٢) سووکی ، سووکایەتی .

**خواردن** : (١) خـۆراك ، ئـەو شـتەی دەخـورێ ، تەعـام . (٢) مەسدەری : دەخۆم ، دەخۆی . . .

**خوواستە** : هیـوا ، ئامانـج ، ئاوات ، ئـەوەی دڵ دەیخـوازێ ، ئەوەی دڵ دەیەوێ .

**خوان ـ خووان** : سفرە ، ئـەو شتەی نانی لە سەر دەخورێ .

**خوواهش** : خوواستن ، ویستن ، داوا کردن .

**خووبان** : کـۆی (خـــووب)ە ، (١) چـاك ، بـــاش ، پەسـند . (٢) جووان ، ڕەنگین .

**خـۆ** : (١) بـــروانە (خـود) . (٢) ووشەیێکە بۆ ســەر سوڕمانو سەرزەنشت کردن بە کار دەهێنرێ لە کاتێکدا تۆ چاوەڕووانی شتێك یا ڕووداوێـك دەبی کـەچی ئامانجت نایێتە دی : خۆ تۆ نەهاتی ! . خۆ من کفرم نەکرد ! .

**خۆر** : ڕۆژ .

**خۆڕایی** : بەلاش ، شتی بێ پارە ، شتی بێ بەدەل .

**خۆزگی** : بریا ، خۆزگە ، خۆزگا .

**خۆش** : (١) چـاك ، بـاش . (٢) شیرین ، بە تام . (٣) سووك ، زوو . (٤) جـــووان بـۆ خـەتو نووسینو خەتوخاڵ .

**خۆشە چـین** : ووڵاتی چـین خۆشە .

**خۆش بی** : بژی ، تۆ بژی .

**خۆش خۆش** : زوو زوو ، خێرا خێرا ، یەك لە دووای یەك ، بە بێ برانەوە ، بە بێ پسانەوە .

**خۆش ڕەفس** : چلکاوخـــۆر ، قوزکێش ، ماسـتاو سارکەرەوە ، ئەو کەسەی مەرایی بۆ یەکێکی تـر دەکا .

**خۆش ڕەو** : ڕەوان ، ڕەهوەن ، ووڵاخی خێرا .

**خۆش موروور** : خـــۆش ڕەو ، ڕەوان .

**خۆکردی** : جەڵەبی ، شتێکی لە لایـەن ناشارەزاییـکەوە دروست کرابێ .

**خۆڵ** : گڵ ، خاك ، قوڕ .

**خۆ** : کلۆریدی سۆدیۆم ، شتێکی سپی بەللووریە ، تامی سۆرە ، بۆ خواردن بە کار دەهێنرێ .

**خۆن** : شتێکی شلە ڕەنگی سوورە لە ناو هەموو ڕەگو دەماردا هەیە ، تامی هەندێ سۆرەو مایەی ژیانە .

**خۆنـــاو** : خـــۆنو ئـــاو ، خۆنی تێـکەڵ بە ئاو ، فرمێسـکی خۆنین .

**خوێنی خۆ :** ئەوەی دەکوژرێو خوێنی وەردەگیرێ .

**خوێنین :** خوێناوی ، لە خوێن وەردراو ، ڕەنگی خوێن .

**خوێندن :** موتالا کردنی کتێب یا ڕۆژنامە یا هەر شتێکی نووسراو .

**خوێن ڕژان :** ڕژاندنی خوێن ، کوشتن .

**خدر (خضر) :** (١) ناوی نالی‌یە (١٨٠٠-١٨٥٦ز)- خدری کوڕی ئەحمەد شاوەیسە خەڵکی گوندی خاکو خۆڵی ناوچەی شارەزوورە ، خاوەنی ئەم دیوانو فەرهەنگەیە . (٢) ناوی یەکێکە لە پێغەمبەران ، گوایا لە سەردەمی موسا پێغەمبەردا ژیاوەو هاوڕێی بووە ، لە ئەفسانەی سامی‌یاندا ئاوی ژیانی خواردۆتەوە هەتا هەتایە نامرێ ، لە کوردەواری‌دا « خدری زیندە »ی پێ‌دەڵێن ، ناوی ئالیا یا ئیلیا یووهەن بووە ، وە لە بەر ئەوەی هەمیشە لە جێگەی تەڕو سەوزی‌دا دانیشتووە «خضر»یان پێ ووتووە ، هەر وەها دەڵێن لەگەڵ ئەسکەندەری گەورە لە ئاوی ژیاندا گەڕا لە خاکی زوڵماتدا سەرچاوەی ئەو ئاوەی دۆزی‌یەوەو لێی خواردەوە بەمە گەیشتە ژیانی نەمری‌و لە هەموو دەورو زەمانێکدا لە بیابانان‌دا بە هانای وون بوو و تینووان دەگاو یارمەتی‌یان دەدات . لە لای موسوڵمانان‌دا پێغەمبەرێکە هاوڕێی مووسا بووە ، قورئان باسی کردووە ، لە کن دەروێش‌و سۆفی‌یان‌دا پایەیێکی بڵندی هەیە ، هەموو وەسفەکانی لەگەڵ ئیلیا پێغەمبەر ڕێک دەکەوێ .

**خدری زیندە :** خدر پێغەمبەر ، بڕوانە (خدر) .

**خدمەت (خدمت) :** کار کردن بۆ کەسێکی تر ، نۆکەری ، خزمەتکاری .

**خریدار :** کڕیار .

**خرۆش :** بڕوانە ( جۆش‌و خرۆش ) .

**خرچە :** کاڵەک ، گندۆرە ، جۆرە کاڵەکێکی شیرینە .

**خرخاڵ :** خلخاڵ ، خشڵێکە لە زێڕ یا لە زیو دروست دەکرێ ژنان لە پێی دەکەن .

**خڕ :** (١) گرد ، هەمووشتێکی لە شێوەی تۆپدا بێ . (٢) دۆڵ ، دەربەند ، شیو ، دەرە .

**خزین :** چوونە ناو شتێکی تەسك ، لە سەر زگ ڕۆیشتن ، ڕۆیشتنی جانەوەری بێ پێ .

**خزمەت :** بڕوانە (خدمەت) .

**خستن :** (١) بەردانە خووارەوە ، هێنانە خووارەوە . (٢) سووك کردن ، سەر کز کردن ، شکاندن .

**خنکان :** مردنی گیاندار بە هۆی کپ بوونی هەناسەی .

**خوێش :** خۆیی ، خۆ ، کۆی (ئەوان) .

**خوێن :** بڕوانە (خۆن) .

**خیابان :** شەقام ، جادە ، ڕێی

خۆش‌و ڕاست‌و فراوان له ناو شار یا باخ‌دا .

## د = D

**دا** : تا ، هه‌تا ، تاکو .

**دائیره (دائرة)** : چه‌نبه‌ر ، حه‌لقه ، چووارچێوه ، هه‌موو خه‌تێکی گرد که ده‌وری شتێکی دابێ ، خه‌تێکی گرد که به پرگاڵ بکێشرێ هه‌ر دوو سه‌ری بکاته‌وه یه‌ك .

**دائیره‌ی په‌روین** : بڕوانه (په‌روین) .

**دائیم (دائم)** : هه‌میشه ، هه‌رده‌م نه‌مر ، پایه‌دار .

**دائیما** : بڕوانه (دائیم) .

**داپۆشین** : شاردنه‌وه ، گوم کردن ، شتێك به شتێك دابدرێ بۆ ئه‌وه‌ی نه‌بینرێ .

**داخ** : خه‌فه‌ت ، خه‌م ، بڕوانه (ئاخ) .

**داخیل (داخِل)** : نێو ، له نێو ، ناو ، له ناو ، ناوه‌وه ، ژووره‌وه ، دژی ده‌ره‌وه .

**داخیل بوون** : چوونه ناو ، چوونه ناوه‌وه ، چوونه ژووره‌وه .

**داخۆ** : بڕوانه (داخوا) .

**داخستن** : (۱) ڕاخستن . (۲) قایم کردنی ده‌رگای هه‌ر شتێك به قفڵ‌و کلیل ، پێوه‌دان . (۳) گه‌رم کردنی ته‌نوورو گه‌رماو . (٤) پێوه‌دانی کتێب‌و ده‌فته‌ر .

**داخوا** : ئایا ؟ ده‌شێ ؟ ده‌بێ ؟ ئاخۆ ؟

**داد ڕه‌س** : قازی ، حاکم ، ئه‌و که‌سه‌یه که به‌فریای لێ‌قه‌وماو ده‌که‌وێ ، ئه‌و که‌سه‌یه له دادپه‌روه‌ری ده‌گه‌ڕێ‌و له زۆرو سته‌می جودا ده‌کاته‌وه .

**دار** : (۱) دره‌خت ، پارچه‌یێکی ڕاست‌و درێژ له دره‌خت ، کاریته‌و ئالیدارو به‌رچیخ ئه‌وه‌ی بۆ بن میچی خانوو یا شتی تر به کار ده‌هێنرێ . (۲) قه‌ناره ، سێ داره . (۳) ماڵ ، خانوو ، سه‌را ، جێگه‌ی ژیان . (٤) گوند ، عه‌شیره‌ت ، شار ، وولات ، نیشتمان .

**دارا** : (۱) ناوی پادشایێکی به ناوبانگی ئێرانی کۆنه به دارای گه‌وره یاداریۆشی گه‌وره ناوی ده‌رکردووه ، له سه‌رده‌می ئه‌سکه‌نده‌ری گه‌وره‌ی مه‌کدۆنی‌دا کوژراوه ، دارای بچووك کوڕی ئه‌وه . (۲) خاوه‌ن ، ده‌وڵه‌مه‌ند .

**داری زه‌رد ـ داره‌زه‌رد** : کانی‌و ئاوێکی ساردو فێنکه له ناوچه‌ی قۆپی قه‌ره‌داخ له وولاتی سلێمانی له نزیك به‌رز ترین لووتکه‌یێکی شاخه‌وه‌یه ، یه‌کێکه له دیمه‌نه جووانه‌کانی ته‌بیعه‌تی کوردستان .

**داری هیند** : دره‌ختی عوود ، داری عوود ، عوودی هیندیشی پێ ده‌ڵێن ، بڕوانه (عوود) .

**دارو بار** : (١) بڕوانــە ( دارو دەوەن ) . (٢) قەوارەو قیافەت .

**دارو دەوەن** : درەختو بنــە دار بەڕوو و مازوو کە بۆ سووتاندن یا بە کار هێنانی تر بڕرا بێو دووبارە هەڵی دابێتەوە .

**دارولعیلم ( دار العلم )** : جێگەی زانستی ، ئامۆژگا .

**دار بە دار** : درەخت لــە دووای درەخت ، دار لە دووای دار .

**داغ** : (١) زۆر گەرم ، سووتان ، هەموو شتێکی کە زۆر گەرم بــێو دەست بسووتێنێ . (٢) نیشانە ، لەککە ، ئەو جێیەیە کە لە ئەنجامی پێوەنانی ئاسنێکی داغ کراو بە لەشی ئادەمزاد دیار دەبێ .

**داغات** : داغ کراو ، سوور بوو ، سوورەوە بوو ، سوور کراو .

**داك** : بڕوانە (دایك) .

**داکی مەسیح** : دایــکی عیســا ، مریەم ، کچی یەواکیمو حەننایە لــە نەوەی یەهوودای بنەماڵەی داوودە ، لە ناسیرە ژیاوە ، جبرائیلی بۆ هاتو مژدەی زگ پڕی بە کچێنی بۆ هێنا ، بە پێی باوەڕی گاووری بە گیــانو لەش چووە ئاسمان .

**داگرتن** : (١) بــڵاو بوونــەوە لە هەمــوو لایێــك ، گرتنــی هەمــوو جێگەیێك . (٢) هەموو شتێك لــە جەواڵو گوونیەو بار کردن .

**داڵ** : (١) بڕوانە ( دڕكو داڵ ) .

(٢) باڵندەیێــکی گەورەی گــۆشت خۆرە .

**دام** : (١) داو ، کەمەند ، تەڵە ، بەند ، هــەر ئالەتێکی تری کــە بۆ ڕاوو شــکار بــە کــار بهێنــرێ . (٢) حەیوانی ماڵــی وەکو مەڕو گاو ئەسپو هی تــر . (٣) بنج ، دامو دەستگا .

**داماد** : زاوا ، بڕوانە (زاوا) .

**دامان** : بڕوانە (دامەن) .

**داماو** : ئەو کەسەیە کە کاری بۆ نەکــرێو پەکــی لە ســەر شــتێك کەوتبێ ، ئەوەی نەزانێ چۆن ســەری لە کارێك دەربکا .

**دامەن** : داوێــن ، دامێـــــن ، قەراخی جل ، بناری شاخو چیــاو گــــرد . ــ **داوێن گرتــن** : داوای یارمەتی کردن ، پێ گرتن .

**دامەنی پاك** : داوێن پاك ، ئــــەو کەسەیە کە سووکایــەتی نەکردبێو لێی نەوەشێتەوە .

**دامەنگیر** : ئەو کەســـەیە کـــە گرفتاری کارەســـاتێك یا کارێــکی گەورە دەبێو ڕوو دەکاتە کەسێكو هانای دەباتــە بەر بۆ ئەوەی لــەو تەنگو چەڵەمەیە ڕزگاری بکات .

**دامێن** : بڕوانە (دامەن) .

**دامێنگیر** : بڕوانە (دامەنگیر) .

**دانان** : جێگیر کردنی شتێك لە جێگەیێکدا .

**دانایی** : هوشیاری ، دانا بوون .

**دانە** : دەنك ، دانەی دانــەوێڵە.

دانەوێڵە .

ئەوەی بۆ باڵندە دادەنرێ ، دەنکی

**دانەی گەنم** : دەنکە گەنم .

**دانە بەرشەق** : شەق تێ هەڵدان، شەق لێدان .

**دانی** : نزیك ، نێـزیك ، نزیـك بوو ، دژی (قاسی = قاصی) .

**دانیشتن** : ڕوونیشتن ، قنگدانەوە ، قوون دانەوە .

**دانش** : زانین ، ئاگاداری ، زانینی کارێك یا شتێك، زانستیو هونەر .

**دانگ** : (۱) بەش ، پەش ، پارچە لە شتێك ، هەندێ لە شتێك . (۲) شەش یەکی شت ، بەشێك لە تاقم کە لەشەش پارچە پێك‌هاتووە.

**داو** : بڕوانە (دام) .

**داوا ـ دەعوا (دعوی)** : ناکۆکی ، شەڕ، لە یەکتری دان، داد خوایی.

**داوا کردن** : ویستن .

**داوێن** : بڕوانە (دامەن) .

**دایە** : (۱) دایك . (۲) ئەو ژنەیە شیر بداتە مندالی تر ، ئەو ژنەیە مندالی تر پەروەردەو بەخێو بکا . (۳) بە عەرەبی بە ماما‌ن دەڵێن .

**دایك** : ئـەو ژنەیـە کە منـدالی هەبێ .

**دەئب (داب)** : خوو و ڕەووشت ، عادەت ، ئوسوول ، ڕەسم .

**دەئبی زیـارەت** : ئوسـوولی پرسـین ، ئوسـوولی چوونـە لای کەسێك بۆ زانینی هەوالی .

**دەبێ** : پێویستە .

**دەبوور (دَبُور)** : بایێـکە لە لای ڕۆژئـاوادا هـەڵدەکا ، بەرامبـەر شەماڵو سەبایە .

**دەبستان (دَبِستان)** : حوجرەی خوێنـدن بـۆ منـداڵانی بچـووك ، قوتابخـانەی ئەو منـداڵانەی تـازە دەسـت بـە خوێنـدن دەکـەن ، قوتابخانەی سەرەتایی .

**دەججال (دَجّال)** : (۱) کەسێکی ئەفسانەیی درۆزنە ، دەڵێن لە پێش پەیدا بوونی محەمەدی مەهدی واتە پێش دووایی جیهان دەردەکەوێ بە سووارێ کەرەوە ، گەلێ کەس باوەڕی پێ دەکاو بە دووایدا دەکەوێ. (۲) درۆزنـی گـەورەو فێڵبـازو ئاژاوەچی .

**دەججالی ئەعوەر** : دەججـالی یەك چاو ، دەججالی کور ، بڕوانە (دەججال) .

**دەخل (دَخل)** : (۱) سـوود ، قازانج لە کشتوکاڵ یا بازرگانی یا ماڵو خانوو و شتی تـردا ، دژی خەرج . (۲) چـوونە ناو هەمـوو شتێك ، دەست تێوەردان لە هەموو شتێك .

**دەخیل (دخیل)** : (۱) پەنا بردن ، داوای یارمەتی کردن ، داوا کردن لە گونـاه و تاوان خۆش بـوون . (۲) چوونە ناوەوە ، بێگانەیێك بچێتە ناو کۆمەڵێكو ئاشنایەتییان لەگەڵدا پەیدا بکات . (۳) ئەو کەسەی کـە دەست لە ئیشو کـاری خەڵکی تر دەدا .

**دەدەمێنی** : گەش دەکاتـــەوە ، دەگەشـــێنێتەوە ، فرمـانی تـاکی شەخسی سێیەمە لە مەســدەری (دەماندن) : گەش کردنەوەی ئاگر بە مووشە دەمە .

**دەر** : (١) جێـــگە ، دەشـــت ، دەرەوە . (٢) دەرگـا ، دەرگـە ، دەرکە . (٣) دەروون .

**دەراتوو** : دەرهاتوو ، دەرچوو .

**دەرەقسێ** : سەما دەکا .

**دەرەك** : دووایی و بـن و ناخـی هەموو شتێك ، ناخی دۆزەخ ، بنی زەریا .

**دەری ڕەحمەت** : دەرگای سۆزو میهرەبانی ، بڕوانە (ڕەحمەت) .

**دەرو دەشت** : ناوەوەو دەرەوە ، تەبیعەت ، ئاوەدانی .

**دەروون** : نـــاوەوە ، ژوورووو ، نـاخ ، ناوەنـدی شـت ، دژی دەرەوە .

**دەربان** : دەروان ، دەرگـەوان ، دەرگـاوان ، پاســەوان ، ئـــەو کەســەیە لـە دەرگـای ســـەراو باڵەخانەدا دەوەستێ .

**دەربەدەر** : ئاوارە ، بێ مـاڵ و خانوو ، ئەو کەســەیە کە لە ماڵ و خانووی خۆی دوور خرابێ و ئاوارە کرابێ .

**دەرج (دَرْج)** : (١) پێچینـــــی شتێك بخرێتە ناو شتێکی ترەوەو پـێی بپێچرێ . (٢) نووســینی شتێك لە کتێب یا ڕۆژنامە .

**دەرحەق** : لە بابەت ، لە لایەن ، لە بارەی .

**دەرخستن** : ئاشـکرا کـردن ، پەردە هەڵگرتن لـە سەر شـتێك ، پیشاندان .

**دەرد** : نەخۆشی ، برینـداری ، بیماری ، زامداری ، ڕەنج .

**دەردان** : دەرخیســتنی هەمـوو شتێکی شل لە شوێنی خۆی ، وەکو : ئاو ، پیسایی ، کیمی برین ...

**دەردی سەر** : تەنگوچەڵـەمە ، گیرو گرفت ، سەرئێشە ، ژیـانی ناهەمـــوار ، هەمـــوو ئاگـــاو ڕووداوێـــکی دەرد بۆ ســـەر پەیدا بـکا .

**دەردی سەری** : نیسبەتە بـۆ (دەردی ســـەر) ، بڕوانـــە (دەردی سەر) .

**دەردی غوربەت** : ئـــــازاری ئاوارەیی ، ئازاری دووری .

**دەرزی** : شـــێشتێکی مەعـــدەنی بچووکی باریـکی نـووك تیـژە ، سەرەکەی تری کونێـکی بچووکی تێدایە ، داوی پێوە دەکرێ و بـــۆ دروومان بە کار دەهێنرێ . کـونی دەرزی ڕەمزی کونی هەرە بچووکەو کونی لەو بچووکتر نی‌یە .

**دەرس (دَرْس)** : (١) ئـــــەو زانیاری‌یەیە کە مامۆستا لە ڕووی کتێبەوە دەیدا بە قوتابی ، هەموو بەشێکی کتێب کە بە یەك جار فێری قوتابی بکرێ . (٢) ڕێی نهێنی .

**دەرك** : دەرگا ، دەرکە .

**دەرکەوتن** : (١) ئاشکراو دیار بوون . (٢) چوونە دەرەوە .

**دەرکراو** : ئەو کەسەیە کە لە جێگەیێك دوور دەکرێتەوە ، ئەو کەسەی کارێکی لێ دەسەندرێتەوە.

**دەرگا** : دەمی هەموو شتێك ، ئەو شتەی دەمی هەموو شتێکی پێ دادەخرێ ، وەکو : دەرگای ماڵ ، دەرگای خانوو ، دەرگای سندووق .

**دەرگووش (درگوش)** : لە گۆ ، ڕستەیێکی فارسییە .

**دەرمان** : چارە ، تیمار ، هەموو شتێکی نەخۆشی پێ چاك بکرێتەوە یا برینی پێ تیمار بکرێ .

**دەرمانده** : بێ چارە ، بێ توواناو هێز ، کز ، عاجیز .

**دەروێش** : (١) ئەو کەسەیە کە پێرەوی بیروڕای تەریقەتی سۆفی (سۆفیزم) دەکا . (٢) دەست کورت ، بێ پووڵو پارە ، بێ ماڵ ، بێ چارە ، هەژار ، فەقیر ، قەلەندەر ، گۆشەنشین ، گۆشەگیر .

**دەرهاتن** : هاتنە دەرەوە .

**دەرهەم** : پەرێشان ، خەمگین ، نالەبار .

**دەریا** : زەریا ، بەحر ، ئاوێکی زۆری وەستاو کە کەشتیو پاپۆڕ بتوانێ مەلەی تێدا بکا ، گەلێ سوورو تاڵە .

**دەریای عوممان** : خەلیجی عوممان ، خەلیجی بەسرە ، ئەو خەلیجەی کە دەکەوێتە نێوان جزیرەی عەرەبو وولاتی ئێران .

**دەس** : بڕوانە (دەست) .

**دەسبازی** : دەست کراوەیی ، چاو تێری ، بەخشندەیی ، سەخاوەت ، ئەو کەسەیە هەر شتێکی هەبێ خەرجی دەکاو دەیبەخشێتە خەڵکی تر .

**دەس بەند** : (١) بازن . (٢) کەلەپچە .

**دەست** : (١) ئەندامێکی لەشە لە شانەوە تا سەری ئەنگوست ، یا لە سەری ئەنگوستەوە تا مەچەك . (٢) دەستوور ، قانوون ، توانا دەسەڵات . (٣) شتێکی تەواو ، تاقمی تەواو ، وەکو : دەستێ جل ، یا دەستێ فەخفووری . (٤) نۆبەت. کەرەت لە قوماردا .

**دەستار** : (١) سەرپێچ ، پێچی سەر ، شەدە ، مەندیل ، عەمامە ، هەموو شتێکی لە سەر بپێچرێ . (٢) دوو بەردی پانی خڕی گردە بۆ هاڕینی دانەوێڵە بە کار دەهێنرێ .

**دەستان** : (١) کۆی (دەست)ە ، بڕوانە (دەست) . (٢) مەکرو فڕوفێڵو تەزویر .

**دەستە** : (١) دەسك ، ئەو شتەیە وەکو یا هێندەی دەستە . (٢) شتێکە شتێکی تر تەواو دەکا یا کۆمەڵێکی لێ کۆ دەکاتەوە : دەستەی شیر ، دەستەی گۆزە ، دەستەی گوڵ ، دەستەی گیا ،

دەستەی کاغەز . (٣) تیپ ، کۆمەڵێك خەڵك پێكەوە بڕۆن ، کۆمەڵێك یاریکەر ، کۆمەڵێك مۆسیقاژەن .

**دەستەمۆ** : کەوی ، کەیی ، ڕام ، ئەو گیاندارەیە کە ماڵی بووەو ڕاهاتووە هەر دەستی بۆ ببرێ دەگیرێ . (٢) ژێر دەست ، بێ دەسەڵات ، زەعیف .

**دەستوبرد** : یەکسەر ، یەکجار ، بە پەلە ، زوو .

**دەست ڕەس** : شتێك بە ئاسانی دەست بکەوێ ، شتێك دەستی بگاتێ .

**دەستکوژی** : کوژراوە ، ئەوەی کوژراوەتەوە ، سەر بڕاو ، ئەوەی سەری بڕاوەتەوە .

**دەستگرۆیی** : دەست گرتن ، یارمەتیدان ، یاریدەدان .

**دەستیار** : دەست گرتن ، یاریدەدان ، بە هانا گەیشتن ، کۆمەکدان ، یاریدەدەر .

**دەسرازە** : پەتێکی هۆنراوەیە بە زۆری لە خوری دروست دەکرێو منداڵی پێ دەپێچرێ لە ناو لانکدا .

**دەسرۆکە** : (١) پارچە قوماشێکی ئاوریشمی چووار سووچیی تەنکە ژنان لە سەری دەپێچنو لمچەکی دەکەن . (٢) دەستەسر ، دەسەسر ، دەسماڵ .

**دەسرۆکەیی هەوری** : بڕوانە (دەسرۆکە) .

**دەسیسە** : فێڵ ، حیلە، کارێ کە بە نهێنیو دزی ڕێك بخرێ لەڕووی فێڵبازییەوە بۆ لێدانو زیانو ئازار گەیاندن بە کەسێك .

**دەسماڵ** : (١) کۆڵەوانە ، جۆرە قوماشێکی سێ سووچییە ژنان دەیکەنە کۆڵیان . (٢) دەستەسر ، دەسەسر .

**دەشت** : چۆڵ ، بیابان ، سارا ، زەویی پانو بەرینو ڕاست .

**دەشتی فەقێکان** : جێگەیێك بووە لە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانی لە بەر گردی سەیوان ، پردێکی بچووکی لێبووە کە لە شیوەکە دەپەڕیتەوە دەچوویە ئەو شوێنە . فەقێیانی سلێمانی ئێوارانی هەینیو سێ شەمووان کە ڕۆژانی حەسانەوەیان بووە ، بە تایبەتی لە بەهاراندا لەو جێگەیە یاریو سەیرانیان کردووە ، ئێستاکە دەشتەکە بووە بە خانوو و بەرەو تێکەڵی شار بووە .

**دەعوا (دعوی)** : شەڕ ، جەنگ ، شەڕو شۆڕ ، وەستان بەرامبەر .

**دەعوەت (دعوت)** : داوا ، بانگ کردن ، بانگ کردنی کەسێك بۆ میوانی یا بۆ کارێك .

**دەف (دف)** : ئالەتێکی مۆسیقییە بریتییە لە چەمبەرێکی دار بە چەرمێکی تەنكو ناسك داپۆشراوە ، لە ناوەوە دەوری چەمبەرەکە هەمووی بە حەڵقەی ئاسنی بچووك ڕایەڵ کراوە بۆ ئەوەی لەکاتی بزووتنەوە دەنگی لێوە بێ ، بە سەری



١

ئەنگوست لە چەرمەکە دەدرێ‌و دەنگ‌و ئاوازی لێ دەردێ .

**دەفتەر** : دەستەیێك کاغەزی سپی‌یە جزووبەند کراوە شێوەی کتێبی وەرگرتووە ، بۆ نووسینی شیعر یا حیساب یا هەر شتێکی تر بە کار دەهێنرێ .

**دەفتەری ئەعمال** : لە ئایین‌دا ئەو دەفتەرە ئەفسانەیی‌یەیە کە گۆیا کردەوەو چارەنووسی چاك‌و خراپی ئادەمزادی تێدا تۆمار کراوە .

**دەفع (دَفع)** : (١) دوور کردن ، دووخستن ، ڕەت کردنەوە ، دوور خستنەوە لە خۆ . (٢) لابردن ، لە سەر هەلگرتن .

**دەقیق (دقیق)** : (١) باریك ، نەرم ، وورد . (٢) ئارد . (٣) کارێك پیاو سەری لێ دەرنەکا .

**دەقیقی** : باریکی ، نەرمی ، ووردی .

**دەلاقە** : پەنجەرە ، تەرەجە ، کونی گەورە لە دیواردا ، بۆشایی لە دیواردا بۆ دانانی شتومەك .

**دەلیل (دَلیل)** : ڕابەر ، بەلگە ، هەموو حوجەتێك بۆ ڕوون کردنەوەی شت .

**دەل** : سەگی مێ ، دەلە سەگ ، دێلە سەگ .

**دەلەك** : جانەوەرێکی گۆشت خۆرە ، لە سمۆرە دەکاو هێندەی پشیلە یا تۆزێ گەورە ترە ، پێ‌ی کورتە پێستی یەکجار نەرمە ، ڕەنگی زەردو قاوەیی‌ی هەیە ، ژێر گەردەن‌و سنگی سپی‌یە ، پێستی بە نرخە لە کوردستان‌دا پەیدا دەبێ .

**دەم** : (١) زار ، دەو ، قەراخی هەموو شتێك . (٢) سەردەم ، کاتێکی کەم ، وەختێکی کەم . (٣) نووك ، هی چەقۆو خەنجەرو دەرزی‌و شتی تر . (٤) خۆن ، هەناسە ، ژیان .

**دەم دڕاو** : زۆر بلێ ، چەنەباز ، دەم شڕ ، ئەو کەسەی قسە لە دەمی‌دا نەوەستێ .

**دەما دەم** : دەمدەم ، دەم بە دەم ، لەحزە بە لەحزە ، پەی دەر پەی ، هەر دەم ، یەك لە دووای یەك .

**دەماغ** : مێشك ، شتێکی نەرم‌و ڕەنگ بۆری کالە لە ناو قاپی سەر « جومجومە » دایە .

**دەمێکە** : ماوەیێکە ، بەینێکە .

**دەمدەم** : بڕوانە (دەما دەم) .

**دەم نۆش** : ئەوەی ماچ دەکا ، ئەوەی دەم دەمژێ .

**دەندان** : ددان ، بڕوانە (ددان) .

**دەندووك** : دەنووك ، دەمی باڵندە ، دوو ئێسقانی باریك‌و درێژو ڕاست‌و هەندێ جار خووارە لە باڵندەدا خوواردنی پێ دەخووا .

**دەنگ** : ئەو ئاوازەیە کە لە ئەنجامی لە یەك دانی دوو شت دروست دەبێ .

**دەنی (دَنیء)** : سووك ، ناکەس ، بێ‌نەژاد ، زەعیف ، پەست .

**دەوات** : مەرەکەبدان ، شووشەی مەرەکەب .

**دەوان** : خۆشڕەو ، ڕەوان ، ئەوەی بە تیژی لە ڕێگەدا دەڕوا .

**دەور** : (١) گەڕان ، گەردش ، بزووتنەوە ، شتێك لە دووای شتێکی تر بێ ، گەڕانی ساڵو ڕۆژگار . (٢) لا ، قەراخ ، ناو .

**دەوران** : ڕۆژگار ، زەمان ، چەرخو فەلەك .

**دەورانی** : سەر بە (دەوران) ، بڕوانە (دەوران) .

**دەورە** : سووڕان ، سووڕاندن ، ڕۆژگار .

**دەوردان** : سووڕانەوە ، گەڕان .

**دەوڵەت ( دولت )** : (١) دەوڵەمەندی ، سامان ، ماڵ ، ئەو شتەیە کە لە پاش یەکێك بە جێ بمێنێو بۆ یەکێکی تر بمێنێتەوە ، سووڕانەوەی کار بە پێی ئارەزووی کەسێك . (٢) لە زاراوەی سیاسیدا سەڵتەنەت، حوکوومەت، سەرەك وەزیر ، وەزیر .

**دەوام (دَوام)** : پایە دار ، هەمیشە ، هەمیشەیی ، مانەوە .

**دەهەن ــ دەهان** : دەم ، زار .

**دەهر (دهر)** : ڕۆژگار ، زەمان ، زەمانە ، ڕۆژگاری بێ پایان .

**دەهری** : خودا نەناس ، کافر ، مولحید ، ئەو کەسەیە کە باوەڕی بە بوونی خودا نییەو وا دەزانێ کە دونیا هەمیشەییەو بووەو هەر دەبێو دروستکەرو داهێنەری نییە .

**دەی** : (١) مانگی دەیەمی ساڵی خورشیدی ئێرانییە ، یەکەم مانگی زستانە کە سەردەمی بەفرو بارانو سەرماو سەختییە ، ناوی ڕۆژی هەشتەمی هەموو مانگێکی ئێرانییە ، ناوی ڕۆژانی هەشتەمو پازدەمو بیستو سێیەمی مانگی دەی یەکە جەژنێکی تایبەتیی مەجووسییانە . (٢) ووشەیێکە بۆ هاندانی کەسێك بە کار دێ کە زوو کارێك بکا .

**دەیبەیە** : دەیبیستی ، تۆ دەیبیستی ، گوێت لێی دەبێ ، لە مەسدەری ( بیستن ــ بیە biye )وەیە .

**دومێنیش** : ئەو چزووەی ئازار دەدا .

**دی** : تر ، بێگانە ، جار ، سەر ، سەر لە نۆ ، بێجگە .

**دیبا** : جۆرە قوماشێکی ئاوریشمییە ، قوماشی ئاوریشمیی ڕەنگاو ڕەنگ ، لە عەرەبیدا بووە بە « دیباج » .

**دیتن** : بینین ، تەماشا کردن ، چاو پێ کەوتن ، ڕووانین ، نوواڕین.

**دیجلە (دجلة)** : ناوی ڕووبارێکە لە شاخەکانی کوردستانی تورکیای ئێستا هەڵدەقوڵێ بە دیاربەکرو مووسڵو بەغدادا تێدەپەڕێ ، لە قوڕنە لە خوارووی عیراقدا لەگەڵ ڕووباری فوراتدا تێکەڵ دەبێ ، ڕووبارەکانی زێی گەورەو زێی

بچووك‌و سیروان‌و خازرو عزێم له دیجله ده‌که‌ن .

**دیدار** : (١) بینین ، دیتن ، ڕوو دیار بوون ، ڕووی دیار . (٢) ڕوو ، ڕوخسار . (٣) چاو ، بینایی .

**دیده** : (١) چاو ، ئینسانی چاو ، دیار . (٢) دره‌ختی بڵند ، شاخی بڵند .

**دیده‌باز** : چاو باز ، چاو بزێو .

**دیده‌جۆ** : چاو ئازاد ، بڕوانه (دیده‌باز) .

**دیده‌یی بێدار** : چاوی نه‌نوستوو ، ئه‌و چاوه‌ی نه‌چێته خه‌و ، چاوی بێ خه‌و .

**دیده‌یی ده‌رزی** : کونی ده‌رزی ، کینایه‌ته بۆ بچووکی .

**دیسان** : جارێکی تر ، دووباره .

**دیققه‌ت (دِقّة)** : باریکی ، نه‌رمی ، ووردی ، وورد بینی .

**دین** : ئایین ، باوه‌ڕ ، مه‌زهه‌ب .

**دیوار** : ئه‌و شته‌یه که له خشت‌و گڵ یا به‌رد یا که‌رپووچ یا شتی تر له ده‌وری زه‌وی دروست ده‌کرێ بۆ ژیان یا هه‌ر شتێکی تر به کار ده‌هێنرێ .

**دیوان** : (١) دادگا ، باره‌گا ، باره‌گای خودا ، باره‌گای شاهنشا ، سه‌رای ده‌وڵه‌ت ، دیوه‌خانه . (٢) ده‌فته‌ری شیعر ، ئه‌و کتێبه‌ی که به‌رهه‌می شیعری تێدا چاپ کرابێ . (٣) ده‌فته‌ری حیساب .

**دێر** : دوور ، دره‌نگ ، له سه‌رخۆ ، ماوه‌یێکی زۆر ، دژی زوو .

**دێر سوڵح (دیر صلح)** : دره‌نگ ئاشت بوونه‌وه ، ئه‌و که‌سه‌ی ماوه‌ی تۆرانی درێژه ده‌کێشێ ، دژی زوود جه‌نگ .

**دێمی** : ئه‌و کشتوکاڵه‌ی که به‌بێ ئاودان پێ بگا ، ئه‌و کشتوکاڵه‌ی ته‌نیا له سه‌ر ئاوی باران بژی ، کینایه‌ته بۆ ووشکی .

**دێوانه** : (١) نیسبه‌ته بۆ دێو ، وه‌کو دێو ، دێو ئاسا ، بێ هۆش ، شێت، ئه‌وه‌ی هۆشی وون کردووه. (٢) ئه‌ندامی نێرینه‌یی پیاو . (٣) ناوی ڕووبارێکه له ناوچه‌ی قه‌ره‌داخ له ووڵاتی سلێمانی .

**دو ـ دوو** : ژماره « ٢ » ، ژماره‌ی پاش یه‌ك .

**دوو تا** : دووکه‌ڵ ، دوو تاڵ ، دوو لا .

**دوچه‌ندان** : دوو ئه‌وه‌نده .

**دوخوول (دُخُول)** : چوونه ناوه‌وه ، نزیك بوونه‌وه له شتێك یا که‌سێك .

**دوخته‌ر** : کچ ، کیژ ، منداڵی مێ‌ینه‌ی ئاده‌مزاد .

**دوڕ (دُرّ)** : کۆی (دوڕ=دُرّ)ه ، بڕوانه (دوڕ) .

**دورووج (دروج)** : کۆی (دورج = دُرْج)ه بڕوانه (دورج) .

**دورج (دُرْج)** : سندووقی بچووك ، ئه‌و قوتووه‌ی بۆ پاراستنی

جەواهیرو خشڵو گوڵاو و شتومەکی تایبەتی‌ی ئارایش کردنی ژنان بە کار دەهێنرێ .

**دوڕ ـ دورر (دُرّ)** : مرواری‌ی درشت .

**دوڕی بەحرەین** : کینایەتە بـۆ فرمێسکی دوو چاو .

**دوڕی یەکدانە** : مـرواری‌ی بێ هاوتا ، مرواری‌ی یەکتا ، مرواری‌ی بێ وێنە .

**دوڕدانە** : دانەی مرواری ، دەنکی مـرواری ، مـرواری‌ی یەکتـا ، مرواری‌ی بێ هاوتا .

**دوڕدانەیی ناسوفتە** : دانـە مرواری‌ی کون نەکراوە ، کینایەتە بۆ ئەندامی مێ‌ینـەی کچ ، ئەنـدامی مێ‌ینەی کـون نەکراوو دەست لێ نەدراو .

**دوژمنی خوێن** : ئەو دوژمنەیە کە لە ئەنجامی کوشتنی کەسێك پەیدا دەبێ‌و ئەم دوژمنایـەتی‌یە بە خوێن نەبێ کۆتایی نایێ .

**دوعا (دُعاء)** : نیاز ، خوواستن ، نیاز کردن لە خودا ، خوواستن لە خودا .

**دوکان (دُکّان)** : دوکان ، سەکۆ ، جێگەیێکە لە ژووری خانوو دەکا ، لە کۆڵان یا شەقام یا بازاڕ دروست دەکرێ‌و شتی لێ دەفرۆشرێ .

**دوگمە** : گرێ‌یێکە لـە ئاوریشم دروست دەکرێ لە باتی قۆپچە بـۆ داخستنی سوخمەی ژنان .

**دوگمەی سینە** : گرێ‌ی سوخمە، دوگمەی سوخمە ، دوگمەی سنگ ، دوگمەی سوخمە بکرێتەوە سنگ‌و مەمك دیار دەبێ .

**دولبەر ـ دلبەر** : ئـەوەی دڵ دەبا ، کەسـێك بە جووانی‌و نـازو عیشوەی فریوی کەسێکی تر بـدا‌و دڵـی داگـیر بـکا ، مەحبـووب ، مەعشووق .

**دولبـەری** : وەکـو دولبـەر ، نیسبەتـە بـۆ (دولبـەر) بڕوانـە (دولبەر) .

**دونیا (دُنیا)** : جیهان ، گیتی ، عالـەم ، ژیـانی ئێـستا ، دژی ئاخیرەت .

**دووەم** : نیسـبەتە بـۆ (دوو) ، ئەوەی کە دەکەوێتـە پلەی دوو ، دووەمین .

**دوو : بڕوانە (دو) .**

**دووباڵ : بە خوەوە ، تێك سمراو ، وولاخی قەڵەوو بە هێز .**

**دووبارە** : دووجـار ، جـاری دووەم ، جارێکی تر ، کارێك کە بۆ جاری دووەم بکاتە سەر .

**دووبەر** : (١) دوو لا ، قوماشی بەرین . (٢) درەختێ دوو جار بەر بدا .

**دووخ** : (١) ئـەو شیشـە مەعدەنی‌یەیە کە بـە خەرەکەوەیەو ڕێسراوی لە سەر هەڵدەکرێتەوە . (٢) گیایێکە لە قامیش دەکا ، لقی ووشـکی حەسـیرو پـەردەی لـێ دروست دەکرێ .

**دوود** : (۱) دووکەڵ . (۲) گرم .

**دوود ڕەنگ** : ڕەنگی وەکو ڕەنگی دووکەڵ ، ڕەش .

**دوور** : شتێکی لە ژێر دەستماندا نەبێ‌و ماوەیێکی زۆر لە نێوانماندا هەبێ ، ڕێگەیێك کە ماوەیێکی زۆری بوێ بۆ بڕینی ، دژی نزیك .

**دووری** : نیسبەتە بۆ (دوور) ، بڕوانە (دوور) .

**دوور خستن** : لابردنی شت لە خۆت کە ماوەیێکی زۆر لە نێوانتاندا پەیدا دەبێ .

**دوو ڕوو** : دوو ڕەنگ ، ئەو کەسەی لەگەڵتدا جۆرێك‌و لە پاش ملە جۆرێکی تر بێ .

**دوو زمان** : دوو ڕوو ، بڕوانە ( دوو ڕوو ) .

**دوو سەد** : ژمارە « ۲۰۰ » .

**دووکەڵ** : شتێکی ڕەش‌و تاریکە لە هەڵم دەکا ، لە ئەنجامی سووتانی شتێك لێی جودا دەبێتەوەو لە هەوادا بڵاو دەبێتەوە .

**دووکەڵی قانگ** : کەسێ ئەگەر گۆی بێشێ یا هەر جێگەیێکی لەشی پەنما بێ یا ئازاری هەبێ دووکەڵ لە دەوری ئەو جێیە دروست دەکرێ ، ئەمە دووکەڵی قانگی پێ دەڵێن ، بڕوانە (قانگ) .

**دوو لانە** : دوو لایە ، ئەو شتەی لە دوو لا پێك هاتبێ .

**دوون** : (۱) خوارەوە ، نزم ، دژی سەرەوە . (۲) خوڕی ، سەرسەری ، نزم‌و خەسیس .

**دۆزەخی** : نیسبەتە بۆ (دۆزەخ) ، ئەوکەسەی جێی دۆزەخە ، گوناهبار ، **جەهەننەمی ـ دۆزەخ**: جێی زۆر گەرم ، جێی گوناهکاران لە قیامەتدا ، جەهەننەم ، سەقەر .

**دۆست** : یار ، هاودەم ، هاوڕێ ، دژی دوژمن .

**دۆشەك** : ڕایەخێکە لە پارچە دروست دەکرێ ناواخنی لۆکە یا خوری یا پەڕۆیە بۆ لە سەر نوستن بە کار دەهێنرێ .

**دۆشیزە** : کچ ، کیژ ، کچی گەنجی شوو نەکردوو ، مێ بینەی نەسمراو .

**دۆشیزەگان** : کۆی (دۆشیزە)یە ، بڕوانە (دۆشیزە) .

**دوێنێ** : ڕۆژی ڕابردوو ، دووا ڕۆژی پێش ئەمڕۆ .

**ددان** : هەر یەك لەو ئێسقانانەی کە بە ڕیز لە ناو دەمی ئادەمیزادو حەیوان ڕوواوون بۆ جوینی خواردن بە کار دەهێنرێن .

**دراو** : درهەم ، پارە ، پوول ، نەقد .

**درەخت** : دار .

**درێژ** : پان ، بڵند ، دژی کورت .

**درێغ** : ئەفسووس ، مخابن ، پەشیمانی ، حەسرەت ، داخ ، داخی گران .

**درۆ** : قسەی ناڕاست ، ووتەیێك کە ڕاستی تێدا نەبێ ، دژی ڕاستی.

**درز** : قەلیش ، قلیش .

**درهەم** : پارەیزیو ، پووڵ ، لە ووشەی « دراخم »ەی گریکیەوە وەرگیراوە ، سککەیێکی کۆنە لە پێشاندا یەك قران بووە .

**دڕاندن** : دڕین .

**دڕك** : تیغی دارو دەوەن .

**دڕکو داڵ** : بڕوانە (دڕك) .

**دز** : کەسێك ماڵی خەلکی بە پەنهانیو بێ ئەوەی ئاگادار بن بۆ خۆی ببا ، ئەو کەسەی شتی خەلکی تر بۆ خۆی ببا .

**دزین** : دزی کردن .

**دڵ** : قەلب ، ئەندامێکی ناوەوەی لەشە جێگەی سووڕانەوەی خۆنە ، ناوەڕاستی هەموو شتێك ، دەروون .

**دڵاوێژ** : دڵپەسند ، دڵخوا ، دڵخواز ، کەسێك یا شتێك کە دڵ مەیلی بکا .

**دڵارام** : دڵ ئارام : ئەوەی ئارام دەداتە دڵ، مەعشووق، مەحبووب، دلبەر .

**دڵی خۆنین** : دڵ بریندار ، دڵی دەردەدار ، دڵی نەخۆش ، دڵی خۆناوی .

**دڵی زار** : دڵی ئازار دراو ، دڵی شکاو ، دڵی بێ توانا .

**دڵۆپە** : قەترە ، دانەیێکی باران ، دەنکێکی فرمێسك .

**دڵتەنگی** : خەمناکی ، مەلوولی ، پەژمردەیی ، دلگیری .

**دڵجۆ** : دڵخوا ، دڵخواز ، ئەوەی دڵ پەسندی دەکات .

**دڵخواه** : ئەوەی دڵ دەیەوێ ، ئەوەی بە ئارەزوو و خواهشتی دڵ دەبێ .

**دڵدار** : (١) بە دڵ ، خاوەن دڵ ، دلاوەر ، ئازا . (٢) دلبەر . مەعشووق ، خۆشەویست .

**دڵدەر** : عاشق، ئەوەی دڵ دەدا.

**دڵ ڕەوشەنی** : دڵ ڕووناك .

**دڵڕفێن** : ئەوەی دڵ دەبا ، ئەوەی دڵ دەڕفێنێ ، کەسێك یا شتێك بە هۆی جووانیی خۆی دڵی کەسێکی تر دەڕفێنێ وای لێ دەکا خۆشی بوێ .

**دڵ شکاندن** : نائومێد کردن ، عاجز کردن ، ئازار دانە خەلك .

**دڵ شکێن** : ئەوەی دڵ دەشکێنێ ، ئەوەی خەلکی نائومێد دەکا ، ئەوەی ئازاری خەلك دەدا .

**دڵ شکستە** : دڵ شکاو، نائومێد، ئازار دراو ، بێهیوا .

**دڵفریب** : ئەوەی فریوی دڵ دەدا ، ئەوەی دڵ دەبا ، ئەوەی دڵ دەڕفێنێ .

**دڵکەش** : بڕوانە (دڵکێش) .

**دڵکێش** : ئەوەی دڵ ڕادەکێشێ ،

ئەوەی دڵ دەبا ، ئەوەی فریوی دڵ دەدا .

**دڵنەواز** : دڵارام ، ئەوەی خۆشی دەگەیێنێتە دڵ .

**دڵنشین** : ئەوەی لە ناو دڵ دادەنیشێ ، دڵپەسند ، خۆشەویست .

**دمدم** : دەبێ ناوی کانیو گۆماوێك بێ .

**دنن (دنّ)** : کووپەی گەورە ، سەبوو .

**دیار** : (١) کۆی (دار)ە ، خانوو ، ماڵ ، جێگەی ژیان ، شار ، عەشیرەت ، وڵات ، نیشتمان . (٢) بینراو ، ئاشکرا ، ئەوەی دەبینرێ .

**دیارە** : (١) رەنگە ، بە ڕاستی ، لەوانەیە . (٢) دەبینرێ .

## R = ڕ

**ڕابیت (رابط)** (١) پێوەند ، پێوەندی نێوان دوو شت یا دوو کەس . (٢) ڕەبەن ، زاهید ، سۆفی .

**ڕابردن** : تێپەڕین ، تێپەڕبوون .

**ڕاجیع (راجع)** : (١) ئەوەی گەڕاوەتەوە ، دووبارە هاتنەوە ، سەر بە کەسێك یا شتێك . (٢) ئەو ژنەی مێردی دەمرێو دەگەڕێتەوە ماڵی باوکی .

**ڕاچەنین** : ڕاچڵەکین ، مووچرك بە لەشدا هاتن .

**ڕاح** : (١) مەی ، شەراب . (٢) شادمانی ، سەرخۆشی ، هێزو تەندروستی . (٣) دەست .

**ڕاحەت (راحت)** : ئاسایش ، ئاسوودەیی ، دژی ماندوویی .

**ڕاحی ڕەیحانی** : مەیو شەرابی ڕەیحانی ، شەرابێك بە ڕەیحان پەروەردە کرابێ یا بۆن خۆش بێ ، بڕوانە (عەمار) .

**ڕاز** : نهێنی ، قسەی نهێنی ، ئامانجی داپۆشراوو پەنهان ، ئارەزووی ناوەوەی دڵ .

**ڕازانەوە** : خۆ جووان کردن ، ئارایش کردن ، جلی جووان لەبەر کردن .

**ڕازی (راضی)** : شاد ، شادمان ، دڵشاد .

**ڕازو نیاز** : دەرخستنی ئەوەی لە دڵدایە ، دەرخستنی ئەو نهێنیو ئامانجەی لەدڵدایە .

**ڕاست** : (١) لای ڕاست ، ئەوەی لە لای ڕاست دەبێ ، دژی چەپ . (٢) قسەی دروستو بێ درۆ ، دژی درۆ . (٣) ڕێك ، بێ پێچو پەنا ، دژی خووار . **ڕاست ئاوێتن** : لە نیشاندان .

**ڕاستی** : نیسبەتە بۆ (ڕاست) .

**ڕاغ** : مێرغوزار ، زەویی ڕاست ، بناری شاخ ، ئەرزی داوێنی شاخ .

**ڕاغیب (راغب)** : ئارەزوومەند ، مایل .

**ڕاکێشان** : لە خۆ نزیك کردنەوەی شتێك بە زۆری .

**ڕاکردن** : ڕۆیشتنی بە تاو ، هەلاتن .

**ڕاو** : شکار ، نێچیر .

**ڕاوەستان** : نەبزووتنەوە لە جێی خۆ .

**ڕاوی** : حیکایەت خوێن ، گۆیندە ، ئەوەی ڕووداو دەگێڕێتەوە ، ئەوەی ئاگاو ڕووداو لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەبا .

**ڕاوی‌یە (راویە)** : (١) بڕوانە (ڕاوی) . (٢) ئەوەی ئاو بە مەشکە یا دەولك دەکێشێ ، حەیوانی ئاوکێش . (٣) ئەوەی ئاو دەداتە خەڵکی ، ئەوەی ئاو دەداتە تینوو .

**ڕاووشکار** : بڕوانە ( ڕاو ) .

**ڕاه** : ڕێ ، بڕوانە (ڕێ) .

**ڕایاڵ** : بڕوانە (ڕایەڵ) .

**ڕایەڵ** : کۆمەڵە تاڵە ڕیسێکە لە تەنیشت یەکتری کۆ کراوەتەوە بۆ ئەوەی ڕاستو چەپ تاڵە ڕیسی تری بچێتە سەرو بتەنرێ .

**ڕایج (رائج)** : ڕەوان ، ڕەوا ، برەو ، هەر شتێکی کڕیاری زۆر بێ .

**ڕەئیس (رئیس)** : سەروەر ، سەردار ، سەردەستە ، پێشەوا ، گەورەی میللەت .

**ڕەئس (راس)** : سەر .

**ڕەئیولعەین ( رای العین )** : ئەو شتەی کە بە چاو دەبینرێ ، شتی ڕووداوی کە بە چاو دەبینرێ .

ـ شاهیدی ڕەئیولعەین : ئەو شاهیدەیە کە ڕووداو بە چاوی خۆی دەبینێو لە خەڵکی نەبیستووە .

**ڕەبیع ( ربیع )** : بەهار ، کەژی بەهار .

**ڕەجا ( رجاء )** : تکا کردن ، ئومێد کردن .

**ڕەجم (رجم)** : بەرد هاویشتن ، بەردە باران کردن ، سەنگەسار کردن ، نەفرەت لێکردن ، لەعنەت لێدان ، بە سووکی تەماشا کردن ، لە خۆ دوور خستنەوە . بە زۆری بۆ شەیتان بە کار دەهێنرێ .

**ڕەجول (رجل)** : پیاو ، مێرد .

**ڕەحیق (رحیق)** : (١) نوێشك ، خولاسە . (٢) شەرابی بێ غەش .

**ڕەحیم (رحیم)** : میهرەبان ، دڵسۆز ، دڵنەرم ، ئەوەی لە خراپەی خەڵك خۆش دەبێ ، ئەوەی ڕەحم بە خەڵکی دەکا .

**ڕەحراح (رحراح)** : (١) فراوان ، ژیانی فراوان . (٢) ئەوەی نەگاتە ئەنجامی شت ، خۆگرتن لە قسەو شاردنەوەی .

**ڕەحم (رَحم)** (١) میهرەبانی ، دڵسۆزی ، دڵنەرمی . (٢) مندالدان ، جێگەی منداڵ لە ناو زگی دایکیدا . (٣) کەس‌وکار .

**ڕەحمەت (رحمت)** : سۆز ، میهرەبانی ، لێبوردن ، چاکەکردن ، بەخشین ، دڵ نەرمی ، شەفەقەت .

**ڕەحمەتی فەتتاح** : میهرەبانی‌ی

خودا ، ڕەحمەتی خودا ، بڕوانە (ڕەحمەت) و (فەتتاح) .

**ڕەخش** : (١) ناوی ئەسپی ڕۆستەمە ، ئەسپی ڕەسەنو خۆشڕەو . (٢) ڕووناکی ، ڕۆشنی پرتەو .

**ڕەخشان** : درەخشان ، درەوشانەوە ، ڕۆشن ، ڕووناك .

**ڕەدیف** : (١) ئەو کەسەی لە پشت کەسێکی ترەوە سوواری وولاخ بێ . (٢) ئەو سەربازە یا یاریکەرەیە کە ئیحتیاتەو هێشتا نەچۆتە جەنگ یا یارییەوە . (٣) زاراوەیێکی زانستیی عەرووزە، ئەو تیپە یا ووشەیەیە کە لە دووایی شیعردا تیکرار دەبێتەوە .

**ڕەزا (رضاء)** : شادی ، شادمانی، دڵشادی .

**ڕەزیع (رضیع)** : منداڵی ساوای شیرەخۆر .

**ڕەسووڵ (رسول)** : نێرراو ، ئەو کەسەیە کە لە لایەن کەسێکی ترەوە بنێرریٚ بۆ گەیاندنی پەیامێك یا هەواڵێك ، پێغەمبەر ، قاسید ، پەیك ، نێرراو لە لایەن خوداوە ، محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان .

**ڕەسمی ئولفەت** : ئوسووڵی هۆگری .

**ڕەشاش** : کۆی ( ڕەشش = رشّ )ە ، بڕوانە (ڕەشش) .

**ڕەشاو** : ئاوی ڕەش ، ئاوێکی ڕەشە پیاو کوێر دەکا ، ئاوێکە لە خەڵووزی هاڕاو دروست دەکریٚو دارتاش خەتی پێ دەکێشێ .

**ڕەشبەڵك** : ئەو شاییو هەڵپەڕکێیەیە کە ژنو پیاو پێکەوە دەیکەن ، شایی ڕەشبەڵك ، مێگەلی ڕەشبەڵك .

**ڕەشش (رشّ)** : ڕشاندن ، ئاو پێدا کردن ، نمنمەی باران ، بارانی کەم .

**ڕەشك** : غیرەت ، حەسادەت ، چاو لە بار .

**ڕەشمار** : ماری ڕەش ، جۆرە مارێکە ڕەنگی ڕەشە .

**ڕەعد (رعد)** : هەورە تریشقە ، گۆلە گۆڵ ، دەنگی هەور .

**ڕەفیق (رفیق)** : یار ، دۆست ، هاوڕێ ، هەواڵ .

**ڕەفرەف (رَفرَف)** : (١) جلو بەرگو ڕایەخی نەرمو ناسكو جوان . (٢) داوێنی سەراپەردەو ڕەشماڵی گەورەو جوان . (٣) ڕایەخ ، مافوور ، فەرش ، هەموو شتێکی بۆ ڕاخستن بە کار بهێنریٚ .

**ڕەفع ( رفع )** : (١) تیپی بۆردار لە زمانی عەرەبیدا نیشانەی « ُ »یە . (٢) هەڵگرتن ، بڵند کردن .

**ڕەفعەت (رَفعت)** : بڵندی جێگە ، پلەی بڵند ، گەورەیی ، مەزنی .

**ڕەق** : شتی توندی سەخت ، ئەو

شتەی ئامادەی شكان بێ ، دژی نەرم .

**ڕەقی** : نیسبەتە بۆ (ڕەق) ، دژی نەرمی ، بڕوانە (ڕەق) .

**ڕەقیب (رقیب)** : (١) دوو كەس مەیلیان بۆ شتێك یا كەسێك هەبێو عاشقی بن هەر یەكەیان ڕەقیبی ئەویتریانە . (٢) پاسەوان ، دەرگاوان ، ئەوەی قسەو كردەوەو بزووتنەوەی خەڵكی هەڵدەگرێ یا تۆمار دەكا .

**ڕەقس (رقص)** : سەما ، بزووتنەوەی ڕێكوپێك لە سەر ئاوازی مۆسیقا .

**ڕەگ** : دەمار، لوولەیێكی باریكە لە لەشی ئادەمزادو حەیواندا خوێن لە ناویدا دەبزوێتەوە .

**ڕەگوتار** : بڕوانە (ڕەگ) .

**ڕەم (رَم)** : (١) ڕاكردن ، هەڵاتن، دوور كەوتنەوە ، ڕاكردن لە ترسان ، ڕەو ، ڕەوینەوە . (٢) پەلامار ، هێرش ، بەسەردادان .

**ڕەمی ئاهوو** : ڕاكردنو ڕەوینەوەی مامز .

**ڕەمەق (رمق)** : (١) ماوەی گیان . (٢) خواردنی كەم ، نەمرو نەژی لە خواردندا . (٣) مێگەل .

**ڕەمز (رَمز)** : ئیشارەت ، ڕازی نهێنیی دانپۆشراو ، ئەو بزووتنەوەیە كە لە ئەنجامیدا ئادەمزاد دەركی مەبەس دەكا ، هەموو شتێكی كە ڕوونو ئاشكرا نەبێو پێویستی بە بیرێك هەبێ ڕوونی بكاتەوە .

**ڕەنج (رنج)** : ئازار : دەرد ، ئازار داری ، ئازار بینین .

**ڕەند** : زیرەك ، چاپووك، فێڵباز، بێ باك ، زۆرزان ، ئەو كەسەی بۆ ئێستای بژیو بیر لە سبەینێ نەكاتەوە .

**ڕەندان** : بڕوانە (ڕەند) .

**ڕەندی** : نیسبەتە بۆ (ڕەند) ، بڕوانە (ڕەند) .

**ڕەنگ** : (١) ئەوەیە كە بە ڕووكەش دێتە بەر چاو و دەبینرێ لە سەوزیو سووریو زەردیو سپیو هی تر . (٢) فێڵ ، كەڵەكە . (٣) ڕەنجو میحنەت . (٤) پارچە پەڕۆ . (٥) بزنە كێوی . (٦) ووشترێك بۆ زاوزێ دانرابێ .

**ڕەنگە** : لەوانەیە ، دەشێ ، دەبێ .

**ڕەنگین** : ڕەنگدار ، ڕەنگاوڕەنگ .

**ڕەنگ ڕەز** : بڕوانە (ڕەنگ ڕەژ) .

**ڕەنگ ڕەژ (رنگرز)** : ڕەنگرێژ ، ئەو كەسەیە كە پیشەی ڕەنگ كردنی داو و پارچە قوماشو جلو شتی ترە .

**ڕەواج (رواج)** : برەو ، بازاڕی گەرم ، دژی كەسادو بێ بازاڕی ، بڕوانە (ڕایج) .

**ڕەواق (رَواق)** : پێشخانە ، پێشماڵ ، هەیوان ، پەردە ، ئەو پەردەیەی كە لە ماڵ دەگیرێتەوە بۆ

بەرگری هەتاو ، هەموو جێگەیێکی ناو ماڵ جگە لە ژوور .

**ڕەوان (رَوان)** : (١) خۆش ڕەو ، ڕەهەوەن ، بە چاپوکی لە ڕێگە ڕۆیشتن . (٢) گیان ، جان ، ڕووح، نەفس . (٣) ڕێك .

**ڕەووش** : (١) ڕەووشت ، خوو و ڕەووشت ، ڕەفتار ، عادەت . (٢) بەدخوو ، توند خوو ، بەد ئەخلاق .

**ڕەوح (رَوح)** : (١) ئاسایش ، هێمنی . (٢) بۆنی خۆش ، بای شەماڵ . (٣) شادی ، گوشادی ، ڕەحمەت .

**ڕەوزە (روضە)** : باخ، گولستان ، گولزار ، سەوزایی ، شینایی ، مێرغوزار .

**ڕەوزەی موتەهھەرە ( روضە مطهرە )** : گولستانی پاكو بێ گەرد کینایەتە بۆ ئارامگای محەمەد پێغەمبەری موسولمانان .

**ڕەوغەن** : ڕۆن ، ڕوون ، شتێکی شل یا نەرمو چەورە لە کەرە یا دووگ یا بەزی مەڕو ماڵات یا دەنکی بادامو گەرچەكو زەیتوونو لۆکەو شتی تر دەردەهێنرێ .

**ڕەوشەن** : ڕووناك ، درەوشان، ئاشکرا ، دیار ، ڕوون ، دژی تاریك.

**ڕەوم** : جۆرە شەرابێکە .

**ڕەهرەو** : (١) ڕێرەو ، دەروێش ، مرید ، ئەوەی لە ڕێگەدا دەڕوا ، ئەوەی ڕوو دەکاتە گوندو شارێکی تر ، ئەوەی ڕێگەی دەروێشیو زوهد دەگرێ . (٢) هەیوان ، بن داڵان ، ئەو ڕێگەیەی لە ناو خانوودایەو ژوورەکان لە جێی تری ناوماڵ جیا دەکاتەوە ، کوریدۆر .

**ڕەهزەن** : ڕێگر ، ئەو دزانەیە کە لە دەرەوەی گوندو شاردا ڕێ بە خەڵکی دەگرنو ڕووتیان دەکەنەوەو ماڵیان تاڵان دەکەن .

**ڕەهن** : بریتییە لەو شتەی کە دەدرێتە کەسێكو پارەی لێ قەرز دەکرێ ، نرخی ئەو شتە هێندەی پارەکە دەبێ ، قەرزار شتەکەی وەردەگرێتەوەو لە پاش ئەوەی قەرزەکە دەداتەوە .

**ڕەیاحین** : کۆی (ڕەیحان)ە ، بڕوانە (ڕەیحان) .

**ڕەیحان** : گیایێکی بۆن خۆشە ، سەوزو ڕەشو مۆری تۆخی هەیە ، بۆ خوواردنیش بە کار دەهێنرێ .

**ڕەیحانی** : (١) نیسبەتە بۆ (ڕەیحان) ، بڕوانە (ڕەیحان) . (٢) جۆرە خەتێکی نووسینە .

**ڕیبەت (ریبت)** : گومان ، شك ، بێئارامی ، وەسواسی ، دوو دڵی .

**ڕیبقەت (ربقت)** : زنجیرو پێوەندی دیل ، کۆتو زنجیری کە لە مل دەکرێ .

**ڕیبقەتی گەردەن** : کۆتو زنجیری گەردەن .

**ڕیتن** : گوو کردن .

**ڕیح** : با ، بای شەماڵ .

**ڕیزوان (رضوان)** : (١) شادی، شادمانی ، بەختیاری .

(٢) بەهەشــت . (٣) دەرگـــەوانی بەهەشت .

**ڕیسوا (رسوا)** : بێ ئابڕوو ، بەد نـاو ، ، فێڵباز ،، ســاختە کار ، بێ شەرم .

**ڕیش** : (١) ڕدێـــن ، مـــووی ڕوومەتو چەناگەی پیاو. (٢) برین، جەراحەت .

**ڕیشوەت (رِشوَت)** : شتێك بە کەسێك بدرێ لەپارەو ماڵ بۆ ئەوەی کارێکی وا بکا کە دژی دەستوورو قانوون بێ بەڵام چاکەی ئەو کەسەی تێدا بێ کە شتەکەی داوە .

**ڕیققەت (رِقّت)** : ناســـکی ، نەرمی ، تەنك .

**ڕیققەتی دڵ** : ناســکیو نـەرمی دڵ .

**ڕیققیەت (رِقّیّت)** : لە (ریقق = رِقّ)ەوەیە ، عەبدایەتی ، بەندەیی ، کۆیلەیی .

**ڕیققیەتی تەن** : بەندەیی لەش ، ئەو لەشەی بەندەو کۆیلەیە .

**ڕیك** : زیخ ، خیز ، لم ، قوم .

**ڕیکی ڕەوان** : لمی بیابــان ، ئەو لمەیە کە با لێی دەداتو دەبزێویو وەکو ئاو شــەپۆل دەداو گردۆڵــکە دروست دەکا .

**ڕێ** : ڕێگە ، ڕێگا .

**ڕێز** : (١) ڕیز ، چین . (٢) تاقم ، کۆمەڵ ، بەش . (٣) حورمەت .

**ڕێ کوتان** : ڕێگە گرتن، بە ڕێگەدا ڕۆیشتن .

**ڕێگە** : شەقام ، جادده ، کۆڵان ، جێگەی پەڕینەوە ، هەموو جێیێکی سەر ڕووی زەوی کە خەڵکی هاتو چۆی بە سەردا بکا .

**ڕێگەو سەفەر** : بڕوانە (ڕێگە) .

**ڕێگەی عەدەم** : ڕێگەی مردن .

**ڕێواس** : گیایێکی گەڵا پانە ، لە کوێستانانو ناوچــە شاخاویەکانی کوردستاندا زۆرە ، نێرکێکی خڕو ناسكو تام مـــزری خۆشی هەیە ، چووزەرە .

**ڕێوی** : گیاندارێکی چووز بێیە، کێویەو ماڵی ناکرێ ، تووکنو کلك فشو گۆ قوتە ، ڕەمزی فێڵبازییە لە پێستی ڕایەخی بچووك دروست دەکرێ .

**ڕێی حاجیان** : (١) ئـــەو ڕێیەیە کە حاجییان دەیبڕن بەرەو مەککـــەو مەدینــە بــۆ حــەج . (٢) کەهکەشـان کۆمەڵە ئەستێرەیێکی بێ ژمارەیە لە نزیك یەکەوە خەتێکی سپی لە ئاسماندا دروست دەکەنو بە شەو دیارە ، لە شەقامێك دەکا کە کای پێوەر کرابێ ، لە بەر ئەوەیــە ڕێی کافرۆشانی پێ دەڵێن .

**ڕوتاب (رُطَب)** : خورمای تازە ، فەریکە خورما .

**ڕوتبە (رُتبە)** : پایە ، پلە، جێگە ، نیشانە .

**ڕوخ** : (١) ڕوو ، چەهـــرە ، ڕوومەت ، کولم ، گۆنا . (٢) جلەوی ئەسپ .

**ڕوخسار** : چەهـرە ، سـیما ، شکڵ ، وێنە .

**ڕوخسارە** : بڕوانە (ڕوخسار) .

**ڕوخسـەت ( رُخصـت )** :
(۱) دەستوور ، ئیجازە ، ڕێگەدان .
(۲) هەرزانیو سووکیو ئاسانی .

**ڕوسول (رُسُل)** : کۆی (ڕەسووڵ = رسول)ە ، بڕوانە (ڕەسووڵ) .

**ڕوعوون** : بڕوانە (ڕوعوونەت) .

**ڕوعوونەت (رُعُونت)** : نادانی ، سستی ، بێعـەقلی ، کەریەتی ، ترن .

**ڕوقەبا (رُقباء)** : کۆی (ڕەقیب = رقیب)ە ، بڕوانە (ڕەقیب) .

**ڕوقوود (رُقُـود)** : نوسـتن ، خەوتن ، پاڵ کەوتن ، درێژ بوون .

**ڕوقعە (رُقعـة)** : (۱) نامـە ، نووسـین ، نووسـراو ، پارچـە کاغەزێك بۆ نووسـین ئامادە بێ . (۲) جـۆرە خەتێـکی نووسـینە . (۳) پینەی جلو بەرگ . (٤) پارچەی هەموو شتێك .

**ڕومان (رُمّان)** : هەنـار ، دار هەنار .

**ڕومانی** : هەناری ، سـووری وەك هەنار .

**ڕومووز (رموز)** : کۆی (ڕەمز = رمز)ە ، بڕوانە (ڕەمز) .

**ڕووان** : شـین بوون ، سـەوز بوون .

**ڕوو** : دەمو چـاو ، ڕوومـەت ڕوخسـار .

**ڕووبار** : زێ ، چەمی گەورە .

**ڕووپاکی** : گوناه نەکردن ، داوێن پاکی ، ڕوو سـپیەتی ، کـردەوەی چاك .

**ڕووت** : بێ بەرگ .

**ڕووتو قووت** : شتی یەکجـار ڕووتو بێ بەرگ .

**ڕوو ترش** : ڕوو گرژ ، ئادەمزادی مۆنو بێ بزە ، دژی ڕوو خۆش .

**ڕووح** : (۱) گیـان ، جـان ، ڕەوان . (۲) فەرمانی خودا ، وەحی خودا ، فریشتە .

**ڕووحی ڕووح** : گیـانی گیـان ، ناخی دڵ .

**ڕوودبار** : (۱) ڕووبـار ، زێ ، چەمی گەورە . (۲) ناوی شـارێکە لە ناوچەی مازەندەران لە ئێراندا ، هەندێ شۆنو ئـاوەدانیی تـریش هەیە بەم ناوەوە . (۳) ناوی گوندێکە لە هەورامانی دیـوی ئێران ، لەوێ (ڕووار)ی پێدەڵێن .

**ڕوو ڕەش** : کینایەتـە بۆ کەسی تاوانبارو گوناهکارو بەدو بێئابڕوو .

**ڕوو ڕەشـی** : تاوانبـاریو گوناهکاریو بەدیو بێ ئابڕوویی .

**ڕوو ڕەش کـردن** : تـاوان بـار کردن ، ئابڕوو بردن .

**ڕووزەرد** : (۱) شـەرمەزار ؛

خەجاڵەت بوو ، ترساو . (٢) لەڕو لاواز ، خەمگین .

**ڕووزگار** : ڕۆژگـار ، گیتـی ، دونیا ، جیهان ، چەرخ ، زەمـان ، سەردەم ، کات ، کەژ .

**ڕووسیا** : بڕوانە (ڕووڕەش) .

**ڕووسیاه** : بڕوانە (ڕوو ەش) .

**ڕووسیەه** : بڕوانە (ڕوو ڕەش) .

**ڕووسپی** : کینایەتە بـۆ ژنی بێ ئابڕوو، بەدکار، فاحیشە ، قەحبە، **- ڕوو سپی زادە** : حەرامـزادە ، زۆڵ ، بیژوو ، بیژی . **- ڕوو سپی باز** : مێباز ، ژنباز، پیاوی زیناکار .

**ڕوو گەنم** : ڕووی وەکـو گەنم ، گەنم ڕەنگ ، ئەسمەر ، سەوزە .

**ڕووم** : نــاوی مەملەکەتێـکی بەناوبانگە لە سەر سنووری شام ، لە بنجدا ناوی شارێکە (Rôma) کـە لە سـالی (٧٥٣-٧٥٤) پێش زایین دروست کراوە ، بە ناوی ئەم شارەوە ئیمپراتۆری‌یەتێکی فـراوان دامەزرا ، شاری ناوبراو پایتەختی بوو ، ئەم ئیمپراتۆری‌یەتە لە سالی ٣٩٥ز بەولاوە بوو بە دوو بەش ، ڕوومی ڕۆژهـەڵات یـا دەوڵـەتی بیزانس ( پایتەختی قوستەنتەنیە )و ڕوومی ڕۆژئاوا ( پایتەختی شـاری ڕۆمـای کۆن) ، لە کـوردەواری‌دا ڕووم یا ڕۆم بە وولاتو نەتـەوەی تورکی عوسمانی دەڵێن .

**ڕوون** : ڕۆن ، ڕووناك ، شتی بێ گەرد ، ساف .

**ڕووناکی** : ڕۆشنایی ، ڕووناهی، تیشك .

**ڕوونەبـوون** : ڕوو نەهاتـن ، ئەوەی شـەرمەزار بێو نەتـووانێ داوای شتێك یا کارێك بکا .

**ڕوونما** : شاباش ، پارە یا هەر دیاری‌یێکی تر لە کاتی بینینی بووك یا سـاوای تـازە لە دایـك بـوو پێشکەش بکرێ .

**ڕۆژ** : لە کاتی ڕۆژ هەڵاتەوە تـا ڕۆژ ئاوا ، خۆر ، دژی شەو .

**ڕۆژی بەدر** : جەنگی بەدر ، بەدر ناوی گوندێکە کەوتۆتە خوارووی ڕۆژئاوای مەدینە لـە نێوان مەککەو مەدینە ، جەنگی موسوڵمانان لە ژێر فەرماندەی محەمەد لەگەڵ گاووران لە مانگی ڕەمەزانی سالی (٢ه/٦٢٤ز) لەو جێگەیە ڕووی‌دا ، لە ئەنجامدا موسوڵمانان سەرکەوتن‌و دەسەڵاتی محەمەد بەهێز بوو .

**ڕۆژی جەزا** : بڕوانـــە ( ڕۆژی قیامەت) .

**ڕۆژی قیامـــــەت** : ڕۆژی هەڵسانەوە ، بە پێی ئەفسانـەی ئایین کە دونیا کۆتایی دێو ئادەمزاد لە سـەر ڕووی زەوی نامێنـێ ، هەموو مـردووان هەڵدەسـتنەوەو دەخرێنە پێش دادگا ، لە ئەنجامدا گوناهکار بۆ دۆزەخو ئیماندار بـۆ بەهەشت دەچن ، ژیانی هەر دوو لایان هەتا هەتایە .

**ڕۆژی ویســاڵ** : ڕۆژی سپی ،

ڕۆژی خۆشی ، ڕۆژی ڕووناك ، ڕۆژی بە یەکتری گەیشتن .

**ڕۆژوو** : خۆگرتن لە خواردن‌و خواردنەوە لە پێش ڕۆژهەڵاتەوە تا پاش ڕۆژ ئاوا ، لای موسوڵمانان مانگی ڕەمەزان مانگی ڕۆژووە ، ڕۆژی .

**ڕۆژپەرست** : ئەوەی ڕۆژ دەپەرستێ .

**ڕۆستەماسا** : وەکو ڕۆستەم ، ڕۆستەمانە .

**ڕۆشەن** : بڕوانە (ڕەوشەن) .

**ڕۆم** : بڕوانە (ڕووم) .

**ڕۆیشتن** : چوون ، کۆچ کردن ، دژی هاتن .

**ڕجا (رَجاء)** : ئومێدەوار بوون ، ئومێدەواری ، تکا ، ویستن .

**ڕدین** : ڕیش .

**ڕدێنی ماش‌و برنج** : ڕیشێکی موەکانی ڕەش‌و سپی بێ .

**ڕژان** : بڵاو بوونەوەی شتی شل یا دانەو دانەوێڵە .

**ڕژاندن** : بڵاو کردنەوەی شتی شل یا دانەو دانەوێڵە .

**ڕوسووم (رُسُوم)** : (١) کۆی (ڕەسم = رسم)ە ، وێنە ، شکڵ ، نیشان ، شوێن ، عەلامەت ، شوێنێ لە سەر ڕووی زەوی یا شتی تر بمێنێ . (٢) ئایین ، مەزهەب ، خوو و ڕەووشت .

**ڕست** : ڕستە ، داو ، تاڵ ، ڕیزێك شتی هۆنراوەی وەکو مرواری ، تەناف .

**ڕشانەوە** : هێنانەوەی خواردەمەنی پێش حەل بوونی لە مەعیدە ، بۆ گیاو گوڵیش بە کار دێ .

**ڕشتە** : بڕوانە (ڕست) .

**ڕشتەی عومر** : درێژایی عومر ، ماوەی تەمەن ، ئەو ماوەیەی کە ئادەمزاد تێیدا دەژی لە لەدایك بوونەوە تا مردن .

**ڕشتن** : بڕوانە (ڕژاندن) .

**ڕفاندن** : قەپاندن ، شتێك بە زۆر وەربگیرێ .

**ڕق** : ڕك ، کین .

**ڕوانین — ڕووانین** : تەماشا کردن ، ڕۆنین ، نوواڕین .

**ربیح (ربح)** : قازانج ، سوود ، دەست‌کەوت .

**ڕیش بەلم** : ڕیش‌سپی .

**ڕیا (ریاء)** : بە درۆ خۆ پیشان‌دان بە کەسێکی باش‌و داوێن پاك ، خۆ پیشان‌دان بە خێرخوواو لە ڕاستیش‌دا وا نەبێ .

**ڕیاز (ریاض)** : کۆی (ڕەوزە = روضە)یە ، بڕوانە (ڕەوزە) .

**ڕیازەت (ریاضت)** : وەرزین ، هەڵگرتنی ئێش‌و ئازار لە پێناوی بەرزکردنەوەی گیان‌و وەرگرتنی خوو و ڕەووشتی چاك ، گۆشەگیری

بۆ بیرکردنەوەو عیبادەتو باوەڕ بە
هێز کردن .

## ز = z

**زائیقە (ذائقە)** : چێــژ ، تــام
یەکێکە لە پێنــج حاسـسەکەو زمان
ئالەتیەتی .

**زابیتە (ضابطە)** : دەســـتوور ،
قاعیدە ، حوکمی کوللی کە لە سەر
جوزئیات تەتبیق دەکرێ .

**زات (ذات)** : خــاوەن ، خــۆ ،
نەفس ، جەوهەری هەموو شتێك .

**زادە** : نەوە ، منداڵ ، لە دایك
بوو .

**زار** : (١) بــێ توانــا ، لــەڕ ،
باریك ، خووار ، ڕەنجوور ، زەعیف.
(٢) دەم ، دەو .

**زاری** : ناڵە ، گریان ، خوواری ،
پاڕانەوە .

**زاڵــــم (ظــــالم)** : زۆردار ،
ستەمکار ، دڵڕەق ، بێ ڕەحم .

**زاناندن** : (١) مەسدەری تێپەڕی
فرمــانی تێنــەپەڕی ( زانــین )ە .
ئەم دوو سیغەیە دروست کراوون .

**زانین** : مەسـدەری زانـــایی‌و
ئاگایی‌و دانایی .

**زاوا** : (١) ئەو پیاوەی تازە ژنی
هێنابێ . (٢) مێردی کچ یا خوشك
یا هەر ژنێکی نزیك .

**زاهید (زاهد)** : تۆبــەکار ،
تۆبەکەر ، ئەو کەسەی وازی لە دونیا
هێنابێ‌و خەریکی عیبادەت بێ .

**زاهیر (ظاهر)** : دیار ، ئاشکرا ،
پەیدا ، نوێنراو .

**زایین** : منداڵ بــوون ، منــداڵ
بوونی ئاژاڵ‌و حەیوانات .

**زایع (ضائع)** : بێ‌کار ، بێ‌سوود ،
واز لێ هێنراو ، وون بوو ، بزر بوو.

**زەبانی‌یە (الزبانیة)** : دەرگاوانی
دۆزەخ ، ئــەو مەلائیــکەتانەن کــە
گوناهــکاران دەخەنــە ئـــاگری
دۆزەخەوە .

**زەبوون** : خووار ، ژێردەست ،
بێ‌چارە ، بێ توانا .

**زەجر (زَجر)** : دەرکــــردن ،
ڕاکــردن ، وەســـتاندن ، جنێــو
پێدان ، تووڕە بوون .

**زەححاك (ضحاك)** : ئەژدەهاك ،
ئەم ناوە لــە ئاوێستادا بەشـێوەی
ئەژی دەهاك هاتووە ، لە دوو ووشە
پێك هاتووە « ئەژی » بە مانای مار ،
« دەهاك » مەخلووقێکی ئەهریمەنی
ناپاك‌و خــوو و ڕەووشتی دێــوی
بــووە . ئەژدەهـــاك یەکێکە لــە
شاهنشاهە ئەفسانەیی‌یە بــە هێزو
تواناکان ، سامی نەژادو خەڵــکی
بابل بووە ، گۆیا دوو مار لە سەر
شانی ڕوواوون‌و خۆراکیان مێشکی
ئادەمــزاد بووە ، هەمــوو ڕۆژ دوو
کەس سەر بڕاوون‌و مێشکیان کراوە
بە خۆراکی مارەکان . لە ئاوێستادا

باسی شەڕو شۆڕی ئاژەرو ئەژدەهاك کراوە ، شانامە هەندێ ئەفسانەی تر لەم بابەتەوە دەگێڕێتەوە .

**زەحمەت** : ڕەنج ، قورس ، هێزو توواناى زۆر خەرج کردن لە ڕێگەی شتێك .

**زەخیرە (ذخیرە)** : هەموو شتێکی هەڵبگیرێ‌و لە کاتی پێویستدا بە کار بهێنرێ .

**زەخم** : برین .

**زەدە** : شکان ، برینداربوون ، درز تێ‌کەوتن .

**زەرب (ضرب)** : (١) لێدان . (٢) سککە ، پارە لێدان ، پارە دروست کردن .

**زەرتار** : پارچەی سیمدار ، پارچەیێك داوی زێڕ لە چنینیدا بە کار هێنرابێ .

**زەرد** : هەموو شتێکی کە لە ڕەنگی زێڕ یا ڕەنگی زەعفەران بێ .

**زەردی** : نیسبەتە بۆ زەرد ، کینایەتە بۆ خەم‌و پەژارە ، پیری‌و دووایی ژیانی ئادەمزادو تەبیعەت .

**زەرق (زَرق)** : (١) لێدان بە نێزە ، چاو هەڵتەکاندن . (٢) دەرزی لێدان ، بردنی دەرمانی شل بۆ ناو خوێن بە هۆی دەرزی‌یەوە . (٣) دوو ڕوویی ، فێلبازی ، ڕیاکاری ، تەزویر . (٤) شین ڕەنگ .

**زەرقا (زرقاء)** : (١) مێی (ئەزرەق = ازرق)ە ، بڕوانە (ئەزرەق) . (٢) ژنی چاو شین . (٣) ئاسمان . (٤) شەراب . مەی .

**زەریف (ظریف)** : زیرەك ، جووان ، خوو و ڕەووشتی پاك .

**زەڕ** : (١) زێڕ ، مەعدەنێکی زەردی بە نرخە خشڵ‌و پارەو شتی هونەری نایابی لێ دروست دەکرێ . (٢) پیر ، پیری کەوتوو .

**زەڕات** : کۆی (ذرّة = زەڕرە)یە ، بڕوانە (زەڕڕە) .

**زەڕاق ( زرّاق )** : دوو ڕوو ، ڕیاکار . شین‌ڕەنگ

**زەڕرە (ذرّة)** : (١) شتی یەکجار بچووك . (٢) هەر یەکێك لەو شتە بچووکانەی لە هەوادا بڵاوون‌و لە بەر تیشکی ڕۆژ دیار دەبن .

**زەڕین** : زێڕین ، شتی وەکو زێڕ ، یا لە زێڕ دروست کراو .

**زەعیف (ضعیف)** : (١) لەڕ ، لاواز ، سست ، بێ‌تووانا . (٢) بۆ ئەو حەدیسانەی پێغەمبەر بە کار دێن کە گومانیان تێدا هەبێ .

**زەفافەتگاه** : ژووری بووك ، ئەو جێ‌یەی کە بووکی لێ دەڕازێننەوە .

**زەفەر (ظفر)** : بە مراز گەیشتن ، هیواو ئامانج هاتنەدی، سەرکەوتن.

**زەقووم (زَقّوم)** : (١) گیایێکە لە بیابانان شین دەبێ ، قەد بلندو گەڵای وەکو گەڵای دار هەنارە ، گوڵی وەکو یاسەمین‌و ڕەنگی زەردو بەری ڕەشە . (٢) بەپێی ئەفسانەی ئاینی ناوی درەختێکە لە دۆزەخدا ، بەری یەکجار تاڵە گوناهکارانی ئەوێ

دەیخۆن . (٣) هەمــوو خواردنێکی تفت و تاڵ و ژەهراوی و کوشندەبێ .

**زەلالەت (ضلالت)** : لــە ڕێــگەی ڕاست لادان ، ڕێــگە وون کردن ، گوم بوون ، بزر بوون .

**زەلزەلە (زلزلە)** : بوومەلەرزە ، ئەرز لەرزین .

**زەم (ذمّ)** : بەد گۆیی ، خەوش ، عەیب ، دژی ستایش و مەدح .

**زەمان (زمــان)** : کــات ، دەم ، سەردەم ، ڕۆژگار .

**زەمانە** : بڕوانە (زەمان) .

**زەمزەم (زمــزم)** : (١) نــاوی بیرێکە لە مەککە لە نزیك کەعبەوەیە ، قوولایی (٤٢م) بـۆ پیرۆزی حەجاج لێی دەخۆنەوە ، گۆیا جبرائیل ئەم بیرەی کردۆتەوە بۆ ئەوەی هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی لــێی بخۆنەوە ، لە بەر ئەوەیە بــیری ئیسماعیلیشی پێ دەڵێن ، لــە سەردەمی کــۆندا شــۆنی وون بوو بــوو بــەڵام عەبدولموتتەلیبی باپــیری پێغەمبــەر دۆزی‌یەوە . (٢) ئاوی زۆر .

**زەمزەمە** : (١) ئاوازی خۆندن ، دۆعا خۆندن بە دەنگ ، قسەکردن و خۆندن بە لێو بزواندن . (٢) هەورە تریشقە ، نەڕەی شێر . (٣) دوعاو نوژی زەردەشتی‌یە ئاگر پەرستەکان لە کاتی موناجات و پەرستنی ئاگرو غوسل دەرکردن و نان خواردندا .

**زەمزەمەی میزاب** : دەنـــــگی سولاوکە .

**زەمیر (ضمیر)** : (١) نــاوەوەی ئادەمزاد ، ناخــی دڵ ، ئەندێشــەو ڕازی ناو دڵ . (٢) لە دەستووری زماندا ئەو ووشەیەیە کە جێ گری ناوەو شەخس دەگەیێنێ وەکو : من ، تۆ ، ئەو ، ئێمە ، ئێوە ، ئەوان .

**زەمین** : بڕوانە (ئەرز) .

**زەمهەریر (زمهریر)** : زۆر سارد ، سەرمای سەخت ، جێگەی یەکجار سارد .

**زەن (ظنّ)** : گومان ، شك . ــ **زن بردن** : گومان کردن ، شك کردن .

**زەنابیــل (زنابیــل)** : کــۆی (زەنبیل = زنبیل)ە ، (١) سەبەتە ، سەبەت ، هەر قاپێکی لە قامیش یا لە دار خورمــا دروست کــرابێ . (٢) هەگبە ، توورەکە ، خورج .

**زەنەخدان** : چەناگــە ، ژێــــر چەناگە .

**زەنبور (زنبور)** : (١) زەردەوالە . (٢) لە نەحوی عــەرەبی‌دا « المسالة الزنبورية » هەیە ئەمە لە ووتــەی ( قد كنتُ اظنُّ ان العقربَ اشدُّ لسعةً مــن الزنبور فإذا هــو هي ) خــۆی دەردەخــا ، هــەر وەهــا ووتوویانە ( فإذا هو إيّاها ) ئەمە لە نێوان سیبەوەیهی (٧٦٥ ــ ٧٩٦ز)و کیسائی (٨٠٥ز مردووە)دا بووە ، بیرو ڕای سیبەوەیهی لە سەر ئەوە بووە کە (فــإذا هو هي) ڕاســتەو نەسب (نصب) جایــز نی‌یە ، بەڵام کیسائی لای وابوو کە ڕەفع و نەسبە هەردووکیان هەن ، لە پاش گفتوگۆو کێشمە کێشێکی دوورو درێژ قسەی

کیسائی دەرچوو ، ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی سیبەوەیهی لە داخانا بەسرە بەجێ بهێڵێ .

**زەند و زەندە** : دوو دارن بە لەیەك خشاندنیان ئاگر پەیدا دەبێ ، بڕوانە ( عەفار ) و ( مەرخ ) .

**زەنگ** : (١) بڕوانە (زەنگۆڵە) . (٢) ژەنگ ، ئەو شتەیە کە لە ئەنجامی هەواو تەڕایی لە سەر ئاسن پەیدا دەبێ ، کارکردنی ئۆکسجین لە ئاسن . (٣) تیشکی مانگ و ڕۆژ . (٤) کەسی خەڵکی زەنگبار کە ناوی وولاتێکە لە ئەفەریقا دانیشتووانی ئەوێ پێستیان ڕەشە ، هەموو پێست ڕەشێك ، زەنگی ، زەنج .

**زەنگی** : نیسبەتە بۆ (زەنگ) ، ڕەشی .

**زەنگۆڵە** : قاپێکی مەعدەنی بچووکی قووڵە لە ناوەوەی‌دا پارچە مەعدەنێکی درێژی سەر خڕ هەیە ، بە سەرەو ژێری لە ملی چوارپێیان دەکرێ ، کە لە ڕێکە دەڕۆن دەنگی لێوە دێ .

**زەوء (ضوء)** : ڕۆشنایی ، ڕۆشنی ، ڕووناکی .

**زەوق (ذوق)** : (١) چەژ ، چێژ ، تام . (٢) خوو و ڕەووشت . (٣) خۆشی ، دونیایی ، زەمینی .

**زەوی** : بڕوانە (ئەرز) .

**زەهر (زهر)** : (١) دەرمانی کوشندە ، هەر دەرمانێکی گیاندار بکوژێ ، شتێکە لە مارو دووپشك و زەردەواڵەو شتی تردا هەیە . (٢) بڕوانە (گوڵ) .

**زەهرا (زهراء)** : (١) مێی (ئەزهەر = أزهر)ە ، بریقەدار ، بریسکەی ڕوو ، ڕووی سپی و بێ گەردو جووان . (٢) لەقەبی فاتیمەی کچی محەمەد پێغەمبەرو ژنی عەلی‌ی خەلیفەی چوارەمی ڕاشیدینە .

**زیب** : جووانی ، ئارایش ، ڕازانەوە ، زینەت و خۆ جووان کردن .

**زیبا** : جووان ، چاك ، باش ، ڕوو جووان .

**زیرە** : هاوار ، قیرە ، دەنگی توندو تیژ . زی ڕووح (ذی‌رووح) : گیاندار ، جاندار .

**زی شان (ذی‌شان)** : پایە بڵند ، پایە بەرز ، خاوەن پایە .

**زیق (ضیق)** : تەنگ بوون ، تەنگی ، تەسك ، تەسکو تروسك .

**زیکر (ذکر)** : (١) هاتنەوە یاد . (٢) ناوهێنان . (٣) ستایش ، دوعا ، نوێژ ، وێرد .

**زیل (ظل)** : سێبەر ، سایە ، ئاسایش ، بەختیاری .

**زیللەت (ذلة)** : خووار بوون ، نزم بوون ، کەوتن ، سەرکزی ، سەرشۆڕی ، زەلیلی .

**زیلی گودروون** : سێبەری شاخی پیرەمەگروون ، بڕوانە (گودروون) .

**زین** : ئەو شتەیە لە چەرم ودار دروست دەکرێ و لە سەر پشتی ئەسپ و ماین دادەنرێ بۆ ئەوەی سووار لە سەری دابنیشێ .

**زینەت** : ئارایش ، جووان کردن ،

هەر شتێکی کە شتێکی تری پێ جوان بکرێ .

**زینده** : (١) بڕوانە (زیندوو) . (٢) گەورە ، مەزن .

**زینـدوو** : زینـدە ، گیانـدار ، ئادەمزاد یا گیاندارێك کە ڕووح لە لەشیدا بێ ، دژی مردوو .

**زیو** : مەعدەنێکی سپیی بەنرخە خشڵو پارەو شتی هونەریی نایابی لێدروست دەکرێ ، بە بەها لە زێڕ هەرزانترە .

**زیهن ( ذِهْن )** : هـۆش ، فـام ، هێزی ناوەوەی کـە شت دێنێتەوە یاد .

**زێڕو زەبەر** : سـەراو ژێـر ، کینایەتە بـۆ ئاژاوەو کارەساتو کوشتنو تاڵانو وێران کردن .

**زوبوول (ذُبُول)** : پەژمردەبوون ، ژاکان ، سیس بوون .

**زورەفا (ظُرَفاء)** : کۆی (زەریف = ظریف)ە ، بڕوانە ( زەریف ) .

**زورووف ( ظروف )** : کـۆی ( زەرف = ظرف )ە . (١) لە زانستی (سەرف = صرف)دا هەموو شتێکی کە شتێکی تری تێدا بێ ، ئەوەی مانای « لە »ی تێدایە ، دوو بەشە : جێگەو کات . (٢) بلیمەتییەتی ، پسپۆری . (٣) قاپ ، هەموو شتێکی کە شتێکی تری بخرێتە ناوەوە . (٤) حاڵ ، وەزع .

**زوروە (ذُرْوَه)** : بڵندی ، لووتکە، کەل ، جێی بڵند .

**زولەیخا** : زلێخا ، لە ئەفسانەی ئاینییدا ناوی ژنی پووتیفاری عەزیزی میسر بوو ئەوەی یووسفی بە پارەکڕی ، زلێخا عاشقی یووسف بوو بەڵام یووسف مەیلی بۆی نەبوو لە بەر ئەوە لای مێردی بوختانی پێ کرد تا خستییە زیندانەوە ، بەڵام لە ئەنجامدا یوسف لە زیندان ڕزگاری بوو لەو کاتەی زلێخا پیر بوو بوو ، ڕۆژێ لە سەر ڕێی یووسف دانیشتو بە فرمێسكو پاڕانەوە داوای لێکرد کە لێی خۆش بێو ئیمانیشی بە پێغەمبەرایەتیی هێنا ، ئیتر یووسف دوعای بۆ کردو گەنج بووەوەو شوویان بە یەکتری کرد ، لە قورئاندا باسی ئەم ڕووداوانە کراوە .

**زولف** : گێسوو ، کەزی ، بسك ، مووی سەر ، مووی بن گو ، مووی نێوانی گۆو کولم .

**زولفەین** : حەلقەڕێزی دەرگا ، وشەکە لە «زورفەین»ەوەیە ، شاعیران پێچو خەمی مووی سەری ژنانیان لەگەڵ ئەودا بەرامبەر کردووە ، زولف ، گێسوو ، مووی بناگو ، لاجانگ ، پرچ ، ئەگریجە .

**زولفی موشکین** : زولفی بۆن خۆشی وەك موشك ، بڕوانە (موشك) .

**زولاڵ ـ زولال (زُلال)** : (١) ئاوی ڕوون ، ئاوی سازگار . (٢) کرمی

بەفر ئــەوەی ناو زگی بریتی‌یـــە لە ئاوی ڕوون‌و پاك .

**زوڵم (ظلم)** : زۆرداری ، ستەم کردن .

**زوڵمات (ظلمات)** : کۆی (زوڵمەت = ظلمت)ە ، بڕوانە (زوڵمەت) .

**زوڵماتی گوناه** : تاریکی گوناه ، گوناهی خراپ ، گوناهی تاریك .

**زوڵمەت ( ظلمت )** : تاریـــکی ، دوواکەوتوویی ، نەخوێندەواری .

**زوهرە (زُهرە)** : ناهید، ڤینۆس، نزیکترینی ئەستێرە گەڕۆکەکانە لــە زەوی ئێمە ، لە پێش ڕۆژهەڵات‌و لە پــاش ڕۆژ ئــاوا لە ئاســماندا دەبینرێ ، ماوەی بزووتنەوەی لــە دەوری ڕۆژدا ( ٢٢٥ ) ڕۆژە ، دوو ئەوەندەی عەتاریــدو هەنــدێ لــە زەوی‌ی ئێمە بچووکترە ، گۆرانی‌ی فیکرو سەماکەری چەرخ‌و فەلــەکی پێ دەڵێن .

**زوهــوور (ظهــور)** : ئاشـــکرا بوون ، بە دەرکەوتن ، دیاربوون .

**زوهوورات (ظهورات)** : کـــۆی (زوهوور = ظهور)ە ، نووانـــدن ، ئاشکرا بوون ، دیار .

**زوهاد (زهّاد)** : کۆی (زاهید = زاهِد)ە ، بڕوانە (زاهید) .

**زوود** : زوو ، تیـــــــژ ، دژی درەنگ .

**زوود جەنگ** : زوو تووڕە بوون ، زوو شەڕ کردن ، زوو تۆران ، دژی (دێرسوڵح)ە .

**زووو** : (١) زبر ، درشـــت ، دژی نەرم . (٢) ساختە و فڕ و فێڵ و درۆ هەڵبەستن .

**زووکردن** : دەست‌و برد کردن .

**زۆر** : گەلێك ، گەلەك ، فراوان ، زیاد ، زێدە ، دژی کەم .

**زرێ** : جلی جەنگ ، بریتی‌یە لەو کراسەی کە لە حەلقەی پۆلا دروست دەکرێ لە سەردەمی کۆن‌دا لە سەر جلو بەرگ لەبەریان دەکرد بۆ ئەوەی تیرو ڕم‌و شیرو خەنجەرو چەکی تری ئەو کاتە جەنگاوەر بریندار نەکا .

**زســتان** : یــەکێ لــە چــووار کەژەکانی ساڵە ، سەرماو سۆڵە ، لە کوردستان‌دا بەفرو باران دەبارێ، ژیان سەختە ، ڕۆژ کورتەو شـــەو درێـــژە ، بــە پــێ‌ی ساڵنــــامەی ڕۆژئاوایی بریــتی‌یە لە مانــگەکانی کانوونی یەکەم‌و کانــوونی دووەم‌و شوبات .

**زگ** : سك ، بەشـــی ناوەڕاستی لەشی ئادەمــزادو حەیوانە ، ئــەو جێ‌یەی هەمــوو بۆڕی‌یەکانی لەشی تێدایە .

**زمان** : زەبان ، زوبان ، زووان ، ئەندامێکی لەشە لە ناودەم‌دایە ، بە هۆی ئەوەوە تــامی شت دەزانرێ‌و ئادەمزاد قسەی پێ دەکا ، شـــێوەی قســـە کـــردنی هەمـــوو میللـــەت‌و نەتەوەیێك .

**زمانی حاڵ** : ئەو وەزعەیە کـــە ئادەمزاد ڕاز و نیازی ناوەوەی خـــۆی تێدا دەردەخا ، زمانی دڵ .

**زمان گرتن :** (١) بێ دەنگ بوون ، کەم قسە کردن . (٢) هاتنە زمان ، منداڵ کە تازە فێری قسە کردن دەبێ . (٣) نەهاتنە دەرەوەی هەموو دەنگ‌و ووشەیێك بە ڕێکی لە قسەکردندا ، نیوە لاڵ .

**زمان لووسی :** قسەزان ، ئەو کەسەیە کە بە زمانی خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنێ .

**زنجیر :** کۆمەڵە حەلقەیێکی مەعدەنی بچووك یا درشتە لە یەکتری بەستراوە وەکو ڕستەی لێ‌هاتووە .

**زنجیری سەودا :** کینایەتە بۆ زولف .

**زنجیر کردن :** بەندکردن ، حەپس کردن ، کۆت‌و پێوەند کردن .

**زیا (ضیاء) :** ڕۆشنایی، ڕووناکی.

**زیاتر :** زۆرتر ، فراوانتر .

**زیارەت (زیارت) :** چوونە لای کەسێك بۆ پرسینی هەواڵی ، چوونە لای کەسی گەورەو پایە بڵند ، چوونە لای نەخۆش‌و پرسینی ، چوونە سەر گۆڕی مردوو .

## ژ = J

**ژار :** زەهر .

**ژارەمار :** زەهری مار .

**ژاڵە :** (١) شەونم ، ئاوونگ ، ئاورنگ ، خوناو ، دڵۆپی شەونم ئەوەی لە سەر پەڕگی گوڵ یا گیادا دەبێ . (٢) بارانی بەهێزو سەر بە کڵاوە . (٣) کەڵەك‌و قایەغ ئەوەی بۆ پەڕینەوەی ئاو بە کار دەهێنرێ .

**ژاڵـە :** درەختێکە هەمیشـە سەوز ، گەڵای تاڵە وەك بی وایە ، گوڵی زەردو سوورو سپی هەیە .

**ژاوەژاو :** دەنگە دەنگ ، دەنگە دەنگی هەمە جۆری تێکەڵ یەك بوو .

**ـ ژاو :** نویشك ، نویشکی هەموو شتێك .

**ژەمژەم :** ژەم ، جەم ، جارێك خواردن‌و تێر بوون .

**ژەنگ :** بڕوانە (زەنگ) .

**ژەنگین :** ژەنگدار ، ژەنگاوی ، بە ژەنگ .

**ژیلەمۆ :** ژیل ، زیلەمۆ ، ئاگرێك کە بەرەو کزی بڕواو بووبێ بە خۆڵەمێش‌و پشکۆکانی بچووك بووبنەوە .

**ژین :** بڕوانە (ژیان) .

**ژێر :** بن ، بنەوە ، دژی سەر .

**ژوور :** (١) سەروو ، باکوور ، شیمال ، سەرەوە . (٢) حوجرە ، هۆدە .

**ژوولیدە :** پەرێشان ، خەمگین ، لێ‌قەوماو ، سەراو ژێر .

**ژماردن :** حیساب کردن ، بە سەرکردنی شتی زۆر دانە دانە .

**ژن** : ئادەمزادی مێ ، ئافرەت ، ئافرەتی خاوەن مێرد .

**ژیان** : زیندوویی ، زیندەگی ، زیندوو بوون ، حەیات ، دژی مردن .

**ژیانەوە** : گەڕانەوەی ژیان پاش مردن ، زیندوو بوونەوە ، تازە بوونەوەی شت لە پاش سیس بوون و کز بوونی .

## س = s

**سا** : دەی ، ووشەی هاندانە بۆ هێنانە دی فەرمانێک یا کردنی شتێک : سابێنە ، ساوەرە ، سابڕۆ .

**سائیب (صائب)** : (۱) ڕاست و دروست . (۲) محەمەد عەلی‌ی سائیب کوڕی میرزا عەبدوررەحیمە لە ساڵی (۱۶۰۱ز) لە ئیسفەهان لە دایک بووە و لە ساڵی (۱۶۷۰ز) هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە ، یەکێکە لە غەزەلخوانە بەرزەکانی شیعری فارسی . بیری ووردو خەیاڵی بەرزو تەعبیری سفت و وێنەی زیندوو سەرانسەری دیوانەکەی شاعیریان داگیر کردووە . بە سائیبی تەبریزیش ناوبانگی دەرکردووە چونکە لە بنەماڵەیێکی تەورێزی بووە .

**سائیل (سائل)** : (۱) هەژار ، دەرۆزەکەر ، سواڵکەر . (۲) ئەوەی پرس دەکا ، ئەوەی پرسیار دەکا ، ئەوەی دەپرسێ .

**سائیم (صائم)** : بە ڕۆژوو ، بە ڕۆژی ، ئەو کەسەی بە ڕۆژووە ، ڕۆژووگرتوو .

**سائیمو ددەهر (صائم الدهر)** : ئەو کەسەی هەمیشە بەڕۆژووە ، ئەو کەسەی خواردن ناخوا .

**سابیت (ثابت)** : قایم ، ڕاست و دروست ، پایەدار ، پێی لە جێی خۆی بێ و نەبزوێ .

**سابیق (سابق)** : پێشین ، پێشینان ، پێشڕەو ، ئەوەی پێش .

**سابوون : (صابون)** : شتێکە لە کلۆریدی پۆتاس (قەلیە)و ڕۆنی شینایی یا چەوریی داری تر دروست دەکرێ ، بۆ شوشتن و پاک کردنەوەی جل و بەرگ و لەش و هەموو شتی تریش بە کار دەهێنرێ .

**سات** : ساعەت ، کات ، دەم ، دەمێکی کەم .

**ساحیب (صاحب)** : (۱) خاوەن ، (۲) یار ، دۆست ، برادەر .

**ساحیبی عیلمولکیتاب ( صاحب علم الکتاب )** : مەبەس ئاسەفی وەزیری سلێمان پێغەمبەرە .

**سادە** : بێ ئارایش ، بێ نەقش و نیگار ، ساکار .

**سارا (صحراء)** : بیابان ، چۆڵ ، جێگەی بێ ئاو و سەوزی .

**سارەبان** : ووشترەوان ، خاوەن ووشتر ، شووانی ووشتر .

**ساری‌یە (ساریە)** : مێی (ساری)یە : (١) ئەوەی بە شەو دەڕوا ، شەو ڕەو ، سەیران‌و گەردش بە شەو . (٢) دوو بە دەرکردن ، دەرچوون لەو دیو . (٣) کارکردن لە شتێك بە جۆرێك کە بە هەموو لایێك بڵاو ببێتەوە .

**ساعەت (ساعت)** : (١) کات ، وەخت ، پێوانەی کات ، بەشێك لە بیست‌و چووار بەشی شەوو ڕۆژ کە بریتی‌یە لە شەست دەقیقە . (٢) ئالەتی پێوانەی کات ، کاتژمێر .

**ساعید (ساعِد)** : دەست ، دەستی ئادەمزاد ، بازوو ، باسك ، ئەندامی نێوان مەچەکی دەست‌و ئانیشك .

**ساعید (صاعِد)** : سەرکەوتوو ، ئەوەی سەردەکەوێ ، ئەوەی لە خووارەوە دەچێتە سەرەوە .

**ساعیقە (صاعقه)** : ئەو ئاگرەیە کە لە ئەنجامی هەورە تریشقەو برووسك پەیدا دەبێ ، هەورە تریشقەو برووسك کە دەبێتە هۆی سووتاندنی شتێك .

**ساغ (صاغ)** : (١) شتی دروست ، شتی بێ خەوش‌و کەل‌و کولم . (٢) ئادەمزادێ یا ئاژاڵێ کە نەخۆش نەبێ . (٣) کەسی ڕاست گۆی بێ فڕوفێڵ .

**ساف (صاف)** : پاك ، ڕۆشن ، ڕوون ، زولال ، بێ‌گەرد .

**سافی ( صافی )** : نیسبەتە بۆ (ساف) ، بڕوانە (ساف) .

**ساق** : (١) لاق ، نێوان ئەژنۆ و مەچەکی پێ . (٢) قەدی دارو درەخت ، کەڵی گیا .

**ساقە سەمەن** : کەڵی یاسەمەن ، بڕوانە (یاسەمەن) .

**ساقی** : (١) ئەوەی ئاو دەدا ، ئەوەی ئاو یا شەراب دەداتە یەکێکی تر . (٢) لە زاراوەی سۆفیزم‌دا ( ڕابەری ڕاستەقینە = المرشد الحقیقی )یە کە ئەمە خودا خۆیەتی وەکو لە قورئان‌دا هاتووە : « وسقاهم ربهم شراباً طهوراً » .

**ساقی‌یە (ساقیه)** : مێی (ساقی)یە ، بڕوانە (ساقی) ، جۆگە جۆگەلە .

**ساکین (ساکِن)** : بێ بزووتنەوە ، ئارام گرتوو .

**سالار** : سەردار ، سەرۆك ، سەرۆکی میللەت ، گەورەو پێشڕەوی کاروان یا لەشکر .

**سالیك (سالِك)** : پێڕەو ، ڕەفتار ، ئەوەی لە گوناھ دوور دەکەوێتەوەو کاتی بە عیبادەت دەباتە سەر ، زاهید ، سۆفی ، دەروێش ، ڕێبوار .

**سالووس** : (١) فێلباز ، حیلەباز ، ڕیاکار ، سالۆز . (٢) ناوی ئاوازو مەقامێکە .

**سالح (صالح)** : چـــاك ، کردەوەی چاك ، باش .

**سامان** : (١) مـــاڵو دەولەت ، ئەسبابی دەولەمەندی . (٢) ڕێكو پێکی ، جـــوانی . (٣) نیشـــانەو ئەنـــدازە . (٤) هێمنـــیو ئـــارامو لەسەرخۆیی . (٥) وولات ، شار ، نیشتمان . (٦) هەموو بەرهەمێکی ئەدەبیو هونـــەری . (٧) پـــاکی . (٨) هێـــزو توانـــا . (٩) نـــاوی کەسێك بوو کە بنەماڵەی پاشایانی سامانی دروست کرد .

**سانی‌یە** : (١) ووشتری ئاوکێش . (٢) جۆگە و ڕووبار . (٣) ناعوور .

**ساو** : (١) هەسان ، سوینو تیژ کردنی داس یـــا هەر شـــتێکی تری تیـــژ . (٢) بـــاج ، خـــەراج . (٣) ساماڵ ، ئاســـمانی شـــینی بێ هەور .

**سایە** : سێبەر .

**سایق (سائق)** : (١) ئـــەوەی ئاژاڵ لێ دەخـــوڕێ ، ئەو کەسەی خەریکی ئاژۆتنی حەیـــواناتە ، ئەو کەسەی خەریکی لێخوڕینی هەمـــوو شتێکە کە دەڕوا . (٢) لە ووشـــەی ( سەوق = سوْق)ی عەرەبی‌یەوەیە ، قەدو لقی درەختی ئەستوورو ڕێكو پێكو جووان .

**ســـەب (سب)** : جنێـــودان ، نەفرەت لێ کردن ، لەعنەت لێدان .

**سەبا (صبا)** : (١) بای شەماڵ ، بایێك کە لە ڕۆژهەڵاتەوە شنەی دێ ، بایێك کە لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە شـــنەی دێ . ناوی گوندێـــکە لە دەوروبـــەری شـــنۆی کوردســـتانی ئێران .

**سەبا (سبا)** : وولاتێك بوو لە لای خـــوارووی ڕۆژئـــاوای جزیـــرەی عەرەب ( یەمەن ) ، لـــە تـــەوڕاتو کتێبـــە کلاسیکی‌یـــەکانی عـــەرەبو گریكو ڕۆمـــان باسی لێوە کراوە ، شارستانی‌یەتێکی گەورەی هەبوو ، بازرگانی‌ی زێڕو زیوو بەردی بەنرخ لەو وولاتەدا لـــە برەودا بوو ، گۆیا بەلقیس قەرالیچەی ئەم مەملەکەتە بووە ، بڕوانە (بەلقیس) .

**سەبات (ثبات)** : قایمی ، ڕاستو دروســـتی ، نەگۆڕیـــن ، بـــیروڕا نەگۆڕین .

**سەباحەت (صباحت)** : جووانی ، ڕوو جووان ، شـــەنگ ، شـــۆخو شەنگی .

**سەبەب (سبب)** : (١) هـــۆ ، بەڵگە ، عیللەت ، وەسیلە ، ڕێگە . (٢) پێوەندی نزیکیو خزمایـــەتی . (٣) زاراوەیێکی زانستی‌ی عەرووزە ، سێ جـــۆرە : یەکەمیان ســـەبەبی سووك (خەفیف = خفیف) بریتی‌یە لە تیپێکی بێدەنگو تیپێکی دەنگدار ؛ دووەمیـــان ســـەبەبی ناوەنـــجی (موتەوەسیت = متوسط) بریتی‌یە لە تیپێکی دەنگدارو دوو تیپی بێدەنگ ؛

سێ‌یەمیان سەبەبی (سەقیل = ثقیل) بریتی‌یە لە دوو تیپی دەنگدار.

**سەبەبکار** : ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی کارێك ڕووبدا .

**سەبوکبار** : ئەو کەسەیە کە باری سووك بێ ، ئەو حەیوانە بارکێشەیە کە باری سووك بێ ؛ کەسی بەتاڵو ئاسوودەو بێ خەیاڵ ، کەسی بێ‌خەم .

**سەبوور (صبور)** : ئەوەی بەرهەڵستی‌ی ئێش‌و ئازارو کارەسات دەکا ، ئەوەی ئارام دەگرێ .

**سەبت (ثبت)** : (١) قایم بوون ، ڕاست‌و دروست بوون ، قەرار گرتن ، ئۆقرە گرتن . (٢) نووسین ، شتێك لە دەفتەردا بنووسرێ .

**سەبر (صبر)** : ئارام گرتن ، خۆڕاگرتن لە ئێش‌و ئازارو کارەسات .

**سەبز** : **بڕوانە** (سەوز) .

**سەبغ (صبغ)** : ڕەنگ کردن ، ڕەنگ کردنی جل یا هەر شتێکی تر .

**سەبغەتوڵلا (صبغة الله)** : ئایینی خودا، دینی خودا ، ئایینی ئیسلام .

**سەحەر (سحر)** : نزیکی بەیانی ، سپیدەی بەیانی .

**سەحوو (صحو)** : (١) هوشیاری، نەمانی سەرخۆشی . (٢) ساماڵ ، ڕۆژی بێ هەور .

**سەحب (صحب)** : کۆی (سەحابی = صحابی)یە ، (١) یار ، هاوڕێ . (٢) یارانی محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان .

**سەحرا (صحراء)** : بڕوانە (سارا) .

**سەحرای مەحشەر** : ئەو گۆڕەپانەی حەشری لێ دەکرێ .

**سەحن (صحن)** : (١) ناوەڕاستی چووار دیوار ، ناو سەراو باڵەخانە ، حەوش‌و سەراو باڵەخانە . (٢) قاپ‌و قاجاخ .

**سەخا (سخاء)** : بەخشین ، جوانمەردی ، چاوتێری .

**سەخت (سخت)** : دژوار ، قورس ، سفت ، دژی نەرم .

**سەد** : ژمارە «١٠٠» ، دەکەرەت دە .

**سەدا (صدا)** : (١) ئاواز ، بانگ . (٢) دەنگدانەوە .

**سەدارەت (صدارت)** : جێگەی بەرز ، باڵانشین ، پلەی سەرۆکی وەزیران ، سەدری ئەعزەم .

**سەداق (صَداق)** : مارەیی ژن .

**سەدەف (صَدَف)** : جانەوەرێکی

بچووکە لە ناو ئاودا دەژی ، لەشی لە چەند پارچەیێـك پێك هاتووە ، ئەم پارچانە سەدەفیان پێ دەڵێن ؛ چاکترین سەدەف ئەوەیە کە سەدەفی مرواری پێ دەڵێن ، ئەمە بریتی‌یە لەوەی کە جانەوەرەکە لە ناو زگی‌دا ماددەیێك پەیـدا دەکـا ، ئەمـە بـە درێژایی ڕۆژگار دەمەیێ‌و ڕەق دەبێ ، قۆپچەی لێ دروست دەکرێ .

**سەدر (صدر)** : سنگ ، سینگ ، پێشەوا ، سەرووی هەموو شتێك ، یەکەمی هەموو شتێك .

**سەد ڕەنگ** : ڕەنـگاو ڕەنـگ ، شتێك هەموو ڕەنگێکی تێدابێ .

**سەد ساڵە** : پیر ، کۆن ، تەمەن درێژ ، بە ساڵا چوو ، ئەوەی زۆر دەژی .

**سەد هەزار**: ژمارە «۱۰۰،۰۰۰» سەد جار هەزار .

**سـەر** : (۱) ئەنـــدامی لەشـــی ئادەمزادو حەیـوانە لـە گـەردەن بەرەوژوور کە مێشـكو چاوو گوێ دەمی تێدایە . (۲) سەرەتاو یەکەمی شـتێك . (۳) سـەرووی شت . (٤) نـووکی شـت . (٥) کـەسی گەورە ، سەروەر .

**سەراب** : (۱) باخو زەوی‌یێکی کە نزیك ئاوو سەرچاوەو ڕووبار بێ . (۲) وێنـەی ئـاو کە لە بیابـانان‌دا دیارە لـە ئەنجـامی ڕەنگـدانەوەی تیشـکی ڕۆژ لەگـەڵ ئـاوی ڕاسـتەقینە ، کینایـەتە بـۆ شتی نادیارو نەبوو .

**سەراپا** : (۱) لـە سـەرەوە تـا خووارەوە ، قـەدو باڵا ، ئەندام . (۲) تەواو ، هەموو ، گشت .

**سەراسەر** : سەر تا سەر ، لەو سەر تا ئەو سەر ، هەموو ، گشت ، تەواو .

**سەراسیمە** : ســـەرگەردان ، پەشووکاو ، هەراسان ، پەرێشان .

**سەرەنجام** : دووایی ، پایان .

**سەری تۆ خۆش** : تۆ بژی ، تۆ خۆش بی ، تۆ بمێنی ، تۆ دوور بی لە کارەسات .

**سەری خۆش** : (۱) ئەو سەرەی کە خۆش دەبێ ، سەرخۆشی کە لە ئەنجامی شەراب خواردنەوە دەبێ . (۲) نەمانی سەر ، مردن . (۳) نەمانی سەرێك ببێتە هۆی ژیانو خۆشی بۆ سەرێکی تر .

**سەریر (صریر)** : (۱) بانگ کردن ، هاوارو فەریاد بـردن . (۲) دەنگی قەڵەم لە کاتی نووسین‌دا ، جیرە .

**سەریع ( سـریع )** : ڕەوان ، زوو، خـێرا .

**سەری مانگ** : سەرەتای مانگ .

**سەرین** : (۱) نیسبەتە بۆ سەر . لای ســـەر ، دژی لای پـــێ . (۲) بالیف ، هەموو شتێکی لە ژێر ســەر دابنـرێ بەتایبەتی لـە کاتی نوستن‌دا .

**سەرو** : بڕوانە (سەروو) .

**سەرو دەسماڵ** : سەرپێچو جلو بـەرگی شانو ملو سـنگی ژنان ، شـێوەی نەتەوەیی جـۆرە جـلو

بەرگێکی ژنی کوردی ناوچەی سلێمانی‌یە .

**سەرو زولف** : قژ ، پرچ ، سەرپێچ .

**سەرو سامان** : ناوماڵ ، هەموو شتێکی پێویستی زیندەگانی ، پارەو ماڵ‌و سەروەت .

**سەروستان** : باخی سەروو ، ئەو جێگەیەی کە درەختی سەرووی زۆرە .

**سەرو قەد** : تەدی وەك سەروو ، جوان ، ڕێك .

**سەرو مێزەر** : سەرپێچ‌و شێوەی پۆشینی سەر لە لایەن شێخ‌و مەلاکانی کوردستان .

**سەروو ــ سەرو** : درەختێکە گەڵای باریك‌و تیژە وەکو دەرزی وایە ، هەمیشە سەوزە ، بڵندی تا بیست مەترەیە .

**سەربان** : سەری ژوورو خانوو ، بان .

**سەر بە سەر** : (۱) سەراسەر ، سەر تا سەر ، لەو سەر تا ئەو سەر . (۲) شت بە شت ، گۆڕینەوە . (۳) دوو نێرینە هەر یەکەیان سواری ئەویتریان‌و ئارەزووی جنسی دامرکێنێ .

**سەرتاپا** : بڕوانە (سەراپا) .

**سەر تەپلەك** : (۱) جۆرە کڵاوێکی خڕی ژنانەیە ، سەری بە لیرەی زێڕ دەرازێنرێتەوە « ئاخچە »ی پێ دەڵێن ، یا بە پارچە زێڕێکی خڕو تەنکی نەخشکراو « تاس »ی پێ دەڵێن . (۲) ئەو سەبەتەیە کە لە پێستی حەیوان گیرا بێ ، کینایەتە بۆ سەری پیس‌و پۆخڵ‌و خراپ .

**سەر پەنجە** : سەر ئەنگوست ، کینایەتە بۆ هێزو توانایی‌و قودرەت .

**سەرچاوە** : (۱) سەرەتای هەڵقوڵانی ئاو لە ژێر زەوی‌یەوە بۆ سەر زەوی ، سەرەتای جۆگەلەو کارێزو کانی ، ئاو جێگەیەی کە ئاو لە ژێر زەوی‌یەوە دێتە سەر ڕووی زەوی . (۲) ناوی گەڕەکێکە لە گەڕەکەکانی زەردیاوای قەرەداخ لە ناوچەی سلێمانی‌دا .

**سەرچوون** : مردن ، کوژران .

**سەرچنار** : سەرچاوەو کانی‌و ئاوو باخێکە بە چەند کیلۆمەترەیێك کەوتۆتە لای ڕۆژئاوای شاری سلێمانی‌یەوە ، جێگەو هەوارگەو سەیرانگایێکی یەکجار خۆشە ، تا پێش جەنگی جیهانی‌ی دووەم بە خۆڕسکی مابووەوە ، بەڵام لەم دوایی‌یەدا دەستکاری‌ی کانی‌و ئاوەکە کراوەو ناوچەکەش بووە بە شار بەتایبەتی بە هۆی دروست کردنی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنارەوە .

**سەرخۆش** : کەسێکە لە ئەنجامی خواردنەوەی ئارەق‌و مەی لە حاڵی ڕەووشتی بچێتە دەرەوە یا بێ هۆش بێ .

**سەرد** : ئـاو یا هـەوا یا هـەر شتێکی تر پلەی گەرمایی کەم بێ ، فێنك .

**سەردار** : فەرمانـدەی لەشکر ، سـالار ، سـەرۆكو گـەورەی دەسـتەیێك یا عەشـیرەتێك یـا میللەتێك .

**سەرراف (صراف)** : (١) ئـەو کەسەی کە پارەی سـاغ لە پارەی قەلب جیا دەکاتـەوە ، زێڕ ناس . (٢) ئەو کەسەیە کە پارە دەگۆڕێتەوە، ئەو کەسەیە کە بازرگانیو ئالوویری بە پارە دەکا .

**سەر ڕووت** : ئەو کەسەی هیچی لە سەر نەبێ ، ئـەو کەسەی کلاوو سەرپێچو دەسرۆکی لە سەر نەبێ ، سەر قووت ، سەر کوت .

**سەر ڕشتە** : (١) ڕێگەی کار ، سـەرکەوتنو زانینـی کـار . (٢) دەفتەری حیساب .

**سەرزەدە** : لە پڕ ، ناگەهانیو بێ ئاگـاداری ، کەسـێك لە پـڕو بێ ئەوەی بزانرێ بێتە جێگایێك ، بێ خەبەردان چوون بۆ جێگایێك .

**سەرسەری** : دەربەدەر ، قسەی سەرپێیو بێ سەرو پا ، کارێـکی بێ ووردبوونەوە بکرێ .

**سەرسەری باز** : هەتیـو بـاز ، منداڵ باز ، قـوون کێ ، ئەوانەی هەتیـو دەبەنـە کەلاوەو خـەرابەو سۆیواریان دەبن .

**سەر شار** : پڕ ، پڕی ، تا لێوان .

**سەر شان** : (١) لووتـکەو کەلو بەرزایی شـاخ . (٢) هەندێـکە لە شت کـە بخرێتـە سـەر شـانو هەڵبگیرێ .

**سـەرشەقام** : گەڕەکێکـە لـە گەڕەکەکانی شاری سلێمانی کەوتۆتە لای خوواروی شـارەوە ، لە کاتی خۆیدا چەند پردێـکی لێبووە ، بە درێـژایی ڕۆژگـار هەندێـکی ڕووخاوون ، ئەوەی نالی باسی لێوە دەکا ئەوەیە کە ئێستا لای مزگەوتی مەلا حوسێنەوەیەو بە شێوەی تاق دروست کراوە .

**سەرشکێن** : ئـەوەی سـەر دەشکێنێ .

**سەرف (صرف)** : (١) زانستییێکە لە بابـەت ئیشـتیقاقی ووشـەی عەرەبییەوەیە . (٢) بڵاوکردنەوە ، خەرج کردن ، خەرج کردنی مـاڵو پـارە . (٣) دەرهێنانی شتێك یا کەسێك لە جێگەیێك .

**سەر قەتار** : سەرۆکی کاروان ، سەر قافلە ، مەکارەچی .

**سەر کەش** : (١) سـە ربلند ، گەردەنکەش . (٢) زۆردار ، بە هێزو توانا . (٣) یاخی ، یاغی .

**سەرکەشی** : نیسـبەتە بـۆ (سەرکەش) ، بڕوانە (سەرکەش) .

**سەرگـردە** : فەرمانـدە ، فەرمانڕەوا ،

**سەرگردن** : (١) سـەربڕین . (٢) دەست پێکردن .

**سەرگەردان** : ئـاوارە ، دەربەدەر ، سەرگەشتە ، حەیران .

**سەرگەرمی** : (١) ئیش‌و کـاری زۆر ، هەموو هەست لای کارێك یان شتێك بێ . (٢) سەرخۆشی ، سەرمەستی .

**سەرگەل** : سەرۆکی تاقمێك ، سەرۆکی پۆلێك ، سەرۆکی چەند کەسێك .

**سەرگۆشە** : ئەو کەسەیە کە لە بناگوێی خەلکی بە نزمی‌و پسەپس قسە بکا .

**سەرگران** : سەرقورس ، لووت بەرز ، مەغروور ، مەست ، تووڕە .

**سەرلەوح** : (١) نـاوی ووتـار ، پێشەکی ، ووتـاری یەکەم . (٢) سەرووی لاپەڕەی یەکەمی کتێب ئەوەی نەقش‌و نیگاری لێ کێشراوە .

**سەرما** : ساردی هەوا ، هەوای سارد ، دژی گەرما .

**سەرمایە** : پـارەو پوول‌و مـاڵی بازرگانی ئەوەی ئالوێری پێ دەکرێ .

**سەرمەست** : سەرخۆش ، مەست ، لووت بەرز .

**سەرنگوون** : (١) داپۆشراو ، بێ سەرو شوێن ، سەراو ژێر . (٢) وون بوو ، سورگوم .

**سەرووی ڕەوان** : سەرووی ڕێك‌و بڵند .

**سەرووی قەد** : قەدو باڵای ڕێك‌و بەرز .

**سەرووی مەوزوون** : بڕوانـە (سەرووی ڕەوان) .

**سەرهەلگرتن** : لە جێگەیێك دەرچوون‌و نەگەڕانەوە بۆی .

**سەعادەت** : بەختیاری ، خۆش بەختی ، دژی بەدبەختی .

**سەعی (سعی)** : (١) تێکۆشان ، کار کردن . (٢) چوون ، ڕۆیشتن . (٣) ئەو ڕاکردنەیە لە کاتی حەجدا لە نێوان (سەفاو مەڕوە) .

**سەف (صف)** : ڕیـز ، تاقـم ، پۆل ، قەتار .

**سەفا** : بڕوانە (سەفاو مەروا) .

**سەفا (صفاء)** : ڕۆشنی ، ڕوونی ، پاکی ، ڕەونەق ، تەڕو ئاوداری .

**سەفاسەف** : ڕیز ڕیز ، ڕیز لە سەر ڕیز .

**سەفاگاه** : جێگەی سەیران‌و خۆشی‌و گوشادی .

**سەفاو مەڕوا ( الصفا والمروه )** : دوو گرۆلکە یا بەردی گەورەیە لە مەککە حاجی‌یان بە نێوانیاندا دەگەڕێن بە یادی هاجەری دایکی ئیسماعیل کە بۆ ئاو گەڕاوە لە نێوان هەر دوو بەرددا ، سەفاو مەڕوا جێگەی عیبادەت‌و پەرستن بووە لە پێش ئیسلامدا .

**سەفاو و مەڕوە** : بڕوانە (سەفاو مەڕوا) .

**سەفەر (سَفر)** : لە شارێك بۆ شارێك چوون ، بڕینی ڕێگە .

**سەفیل (سفیل)** : نزم ، خوڕی ، پەست ، نـاکەس ، زەبوون ، سەرکز ، ئەوەی لە ژێرەوە بێ ، ئەوەی لە خوارەوە بێ .

**سەفینە (سفینة)** : کەشــــتی . پاپۆڕ .

**سەفینەی بــەڕ** : کەشـــتی‌ی بیابان ، ووشتر .

**سەفیە (سفیە)** : نـــادان ، بێ هۆش ، سەرسەری .

**سەفحە ( صــفحە)** : (۱) ڕوو ، سەری هەموو شتێك . (۲) لاپەڕەی کتێب .

**سەف سەف (صف صف)** : ڕیز ڕیز .

**سەفف (صفّ)** : بڕوانە (سەف) .

**سەففی برۆ** : ڕیزی مووی برۆ .

**سەقەت (سقط)** : (۱) بەربوونەوە، کەوتن ، کەوتنە سەر . (۲) هەموو شتێکی بێ سوود . (۳) جلی کورت . (٤) ناوزڕان‌و ڕیسوایی ، کەوتن . (٥) هەڵە لە قسەکردن یا نووسین‌دا.

**سەقەر (سَقَر)** : دۆزەخ .

**سەقیم (سقیم)** : نەخـــۆش ، دەردەدار .

**سەکەنات (سکنات)** : کـــۆی (سەکینە = سکنە)یە . (۱) حاڵ‌و وەزع ، ئەو حاڵەی پیاو لەسەریەتی (۲) دامرکاوو ، بێ جووڵە .

**سەگ** : چوارپێ‌یێکی ماڵی‌یە لە گۆشت خۆرەکانە ، بۆ پاسەوانی بە کار دەهێنرێ ، یارمەتی‌ی ڕاوکەران دەدا . لەگــەڵ گورگ‌دا دەپـــەڕنە سەر یەکتری‌و سەگی گورگینیان لێ پەیـدا دەبــێ ، ئەمــە چاکتــرین‌و بە هۆشترین سەگی پاسەوانی‌یە ، لە ناو کــوردەواری‌دا ســەگ ڕەمزی گلاوی‌و نزمی‌یە .

**سەگ سیفەت** : گــلاو ، خوو و ڕەووشتی وەك سەگ .

**سەگ مەگەس** : مەگەسێکە پێ‌ی درێژە لــە لەشی سەگ‌و ئــەسپ‌و حەیوانی تر پەیـدا دەبێ‌و خوێنیـــان دەمژێ .

**سەلام** : (۱) پــاکی‌و دووری لــە خەوش‌و کارەسات . (۲) گەردەن ئازادکردن ، سڵاو .

**سەلم (سَلَم)** : بڕوانــە (سەلم‌و توور) .

**سەلما (سلمی)** : (۱) ناوی ژنــە ، بــووکی شــیعرە لـــە ئەدەبیـــاتی ڕۆژهــەڵات‌و ئاســیای ناوەڕاست‌و نەتــــەوە موسوڵمانـــــەکان‌دا . (۲) مارمێلکی ســپی . (۳) نــاوی گیایێکە .

**سەلمان** : یەکێکــە لــە یـارانی محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان ، بە خۆی دەووت سەلمانی موسوڵمان، لـــــە بنــــچ‌دا لـــــە ئاگــــر پەرستەکانی ئیسفەهان بوو ، زۆر ژیاوە ، لە شام‌و مووسڵ‌و نسێبین زیندەگانی کردووە ، کتێبە کۆنەکانی عەجــــەم‌و ڕۆم‌و جوولـــــەکەی خوێنــدووە ، بــە پــارە کــڕاوەو هێنراوەتە شـــاری مەدینە ، کە بە ئاینــی ئیســلامی زانی هاتــە لای پێغەمبەرو بــوو بە موســوڵمان ، کابرایێکی بەهێزویەکجار زیرەك‌بووە،

زانایێــــکی بێ هاوتـــا بــــووه ، موهاجیرەکان دەیانــووت سەلمان له ئێمەیەو ئەنســـاریش دەیانــووت له ئێمەیە ، بەڵام محەمەد ووتوویەتی : سەلمان له ئێمـــەی بنەماڵەی خاوەن کەعبەیە ، له (٦٥٦ز) کۆچی دووایی کردووه .

**سـەلمو توور ـ چـۆڵی سەلمو توور :** بـه پـێـی گێڕانەوەیێـکی ئەفسانەیی فەرەیدوون سێ کوڕی بووه ، ئـیرەج‌و سـەلم‌و تـوور ، مەملەکەتەکەی له نێوانیاندا دابەش کردووه ، ئێران بەشی ئیرەج بووه ، تورکستانی داوه به توور ، وولاّتانی شـــام‌و ڕۆمیش وەبەر ســـەلم کەوتووه . تورکستان له بەر توور بووه به « تـووران »و ئێرانیش به ناوی ئیرەجەوه نراوه ، دەڵێن توور کوژرا ، ئەفراسیاب له تورکستان هەڵساو کەوتــه جەنـگەوه لەگـەڵ کەیقوبادو کەیکاووس‌و کەیخوسرەودا بۆ سەندنی خۆنی توور ، ئەم جەنگە ماوەیێکی دوورو درێژی کێشا ، له ئەنجامدا خۆنێکی زۆر ڕژاو وولاّت داری له سەر بەردی نەما تا گەیشتە ئەوەی وێرانی‌و چۆڵی‌یەکەی بوو به پەنـــد . **ـ چۆڵی سەلمو توور :** زەوی‌یێکی وێران‌و بێ ژیان .

**سـەلیقی :** نیســــبەته بــۆ (ســەلیقە) ، سـروشت ، بنیـاد ، تەبیعەت ، خۆڕسك .

**سەلا (صلا) :** (١) ووشەیێکه بۆ بانگ کردنی خەڵکی به کار دەهێنرێ ، بانگ کردنی خەڵك بۆ کارێك ؛ نۆژ کردن . (٢) نان خواردن .

**سەلات (صلاة) :** نۆژو پاڕانەوه له لایەن بەندەوه له خودا ، ڕەحمەتی خودا بۆ بەندەکانی .

**سەلا هەستان :** بانگ‌دان .

**سەم (سَمّ) :** ژەهـر ، زەهر ، هەمـوو دەرمانێـکی کـه گیانـدار بکوژێ ، ئـەو شتەیە که بـه هەر جۆرێك بچێته ناو لەش‌و مردنی له دووا بێ .

**سەما :** بڕوانه (ڕەقس) .

**سەما (سماء) :** ئاسمان .

**سەماع (سماع) :** (١) گوێ‌لێ‌بوون ، بیستن ، گوێگـرتن . (٢) ئـاوازی خۆش ، گۆرانی ، سروود .

**سەماوات (سماوات) :** کـــۆی (سەما = سماء)ه ، بڕوانه (سەما) .

**سەمەر (ثمر) :** بەر ، میوه .

**سەمەری مایە (ثمرمایە) :** بەری داری جسن‌و هەڵبژاردە ، بەری ئەو دارەی که هیچ نەخۆشی‌یێکی نەبێ ، بەری چاك .

**سەمەدانی (صمدانی) :** نەمـر ، زیندوو ، سەرمـــەدی ، ئەبەدی ، خودایی .

**سەمەن :** بڕوانه (یاسەمەن) .

**سەمەندەر :** بڕوانـــه ( مـاری سەمەندەر ) .

**سەمع (سمع) :** گۆ ، گۆچـکه ، هەستی گۆ لێ بوون .

**سەنا ( ثناء ) :** ستایش ، مەدح .

**سەنا (سناء)** : ڕوونـاکی ، ڕۆشنایی ؛ بەرزی ، بڵندی .

**سەناخوان** : ئەوەی مەدح دەکا ، ئەوەی شیعری مەدح دەڵێ .

**سەندن** : وەرگرتن .

**سەنعەت (صنعت)** : کار ، پیشە ، هونەر ، پیشەسازی .

**سەنگ** : (١) بەرد. (٢) قورسایی، کێش ؛ ڕێز ، قەدرو قیمەت .

**سەنگدڵ** : دڵڕەق ، دڵی ڕەقی وەك بەرد ، بێڕەحم ، ستەمکار ، زۆردار .

**سەواد** : (١) ڕەشی ، دژی سپی . (٢) تارمایی . (٣) شەو ، ڕەشایی شەو . (٤) ڕەشکێنەی چاو ، ڕەشێنەی چاو . (٥) خوێندەواری ، ڕۆشنبیری . (٦) زۆربە، بەشی زۆر لە خەڵك .

**سەوت (صوت)** : بانگ ، ئاواز ، دەنگ .

**سەودا** : (١) کڕینو فرۆشتن ، دانو وەرگرتن ، ئاڵوێری ، موعامەلە . (٢) مێی (ئەسوەد = اسود)ە ، ڕەشی ، تارمایی . (٣) خوێندەوار ، توانایی خوێندنو نووسین . (٤) نەخۆشیی ماخولیا . (٥) عیشقو شەیدایی‌و هەواو هەوەس .

**سەودا زەدە** : عاشق ، شەیدای عیشق ، ماخولیایی .

**سەوداسەر** : بڕوانە (سەودازەدە) .

**سەور (ثور)** : گـا ، بڕوانە (بورج) .

**سەوز** : کەسك ، هەموو شتێکی کە ڕەنگی لە ڕەنگی گیای تازە بێ .

**سەوزە** : (١) گیای تازە . (٢) کینایەتە بۆ مووی ڕیشو سمێڵ .

**سەوزە درەخت** : درەختی سەوز ، دارو درەختی کەسك ، دارو درەختی شین ، درەختی تازەو ناسك .

**سەوزە گیا** : گیای سەوز ، گیای تەڕو ناسكو تازە .

**سەوزەی سیراب** : مێرگی تێر ئاو ، شینایی تێر ئاو ، چیمەنی تێر ئاو .

**سەوڵ** : (١) دوو داری ڕێکی سەرپانە بۆ لێخوڕینی بەلەمو کەڵەك لە ناو ئاودا بەکار دەهێنرێ . (٢) دەوەنێکی بڵندی گەڵا پانە گوڵێکی سووری وەکو پۆپنەی کەڵەشێر دەگرێ .

**سەوڵەت (صولت)** : هێرش ، سەرکەوتن ، توانایی ، هێزو توانایی .

**سەوم (صوم)** : ڕۆژوو ، خۆ گرتن لە خواردنو خواردنەوە لە پێش ڕۆژهەڵاتەوە تا پاش ڕۆژئاوا .

**سەهو (سهو)** : هەڵە ، لە بیر کردن ، فەرامۆش کردن ، لە بیر چوونەوە .

**سەهران** : نەنوستوو ، بێدار ـ

**سەهم (سـهم)** : (١) تیر . (٢) بەش ، بەخت ، بەهرە ، نەسیب . (٣) ترس ، هەرەس ، سام .

**سەید (صید)** : ڕاو ، شکار ، ڕاو و شکار ، نێچیر .

**سەیدی حەرەم** : ڕاوی کۆترەکانی کەعبە ، بە پێی ئایینی موسولمانی ڕاوی ئەو کۆترانە حەرامە ، لە ماڵی دۆستێکدا کارێکی خراپ بکرێ یا کەسێك بکوژرێ وەکو ڕاوکردنی کۆترەکانی حەرەم وایە .

**سەیر** : (١) سەیران ، گەڕان ، گەشتو گوزار . (٢) تەماشا کردن . (٣) لە ڕێ ڕۆیشتن ، ڕۆیشتن .

**سەیران** : سەیرو گەڕان ، گەشت .

**سەیری بەهاران** : گەشتو سەیرانی بەهاران .

**سەیرانی** : نیسبەتە بۆ (سەیران)، بڕوانە (سەیران) .

**سەیرو مەیر** : لە سەر شێوەی «کوڕو موڕ» ، «دەفتەرو مەفتەر» سەیران ، گەڕان ، بڕوانە (سەیر) .

**سەیرکردن** : (١) تەماشاکردن ، ڕووانین ، نوواڕین . (٢) سەیران کردن .

**سەیقەل (صَیقل)** : مشتوماڵ کردنی شیرو خەنجەر ، پاككردنەوەو تیژ کردنو بریقەدان بە شیرو خەنجەر .

**سەیقەلی**: نیسبەتە بۆ (سەیقەل)، بڕوانە (سەیقەل) .

**سەیل (سَیْل)** : لافاو ، ئاوی زۆر لە ئەنجامی بارانی بە خوڕ یا تووانەوەی بەفری زۆر .

**سەیوان** : (١) ناوی گردێکە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە لەگەڵ بنیادنانی شار ئەو گردە کراوە بە گۆڕستان . (٢) چەتر . (٣) ئاسمان . (٤) سەیوانو کەیوان ناوی جووتە قارەمانێك بوون ، دەڵێن دلێرانە جەنگاوون دژی هێرشی تورکە عوسمانییەکان بۆ سەر شاری سلێمانی ، لە گردی سەیوان نێژراوونو گردەکە بە ناوی یەکیامەنەوە نراوە .

**سەییاد (صیّاد)** : ڕاوکەر ، ڕاوچی .

**سەییارە (سیّارە)** : (١) مێی (سەییار = سیّار)ە ، کاروان ، قافڵە . (٢) ئەستێرە گەڕۆکەکانی ئاسمان .

**سیححەت (صِحّة)** : ڕاستی ، دروستی ، تەندروستی .

**سیحر (سِحر)** : جادوو ، ئەفسوون ، ئەفسانە .

**سیدق (صِدق)** : ڕاست ، ڕاستیو دروستی ، دژی درۆ .

**سیراب** : پڕ ئاو ، ئاودار .

**سیراج (سراج)** : چرا .

**سیراجی ئەنبیا : (سراج الانبیاء)** : چرای پێغەمبەران ، ڕوونـــاکیی پێغەمبەران ، محەمەد پێغەمبــەری موسوڵمانان .

**سیرەت (ســیرت)** : ڕێـــــگە ، تەریقەت ، مەزهــەب ، سوننەت ، هەیئەت ، ڕەووشت .

**سیفات (صِفات)** : کۆی (سیفەت = صفت)ە ، بڕوانە (سیفەت) .

**سیفەت (صِفَت)** : چۆنیــەتی ، ئەو شتەیە کە چۆنیــەتی شتێك یا کەسێك دیاری بکا .

**سیلاح (سِلاح)** : چەك ، هەموو ئالەتێــکی کە لــە جەنگدا بــە کار بهێنرێ .

**سیلە (صِلە)** : (١) پــاداش ، چاکە ، بەخشــین ، چاکە کــردن . (٢) پێوەندی ، دۆستی .

**ســیلەی ڕەحــم** : پێوەنـــدیو یەکێتیی نێوان خزمو کەسو کار ، چاکەو یارمــەتی بەرامبــەر خزمو کەسو کار .

**سیلسیلە (سِلسِلە)** : زنجـیر ، حەلقــەی مەعدەنی کە لــە یەکتری قایم کراوە .

**سیم** : زیو .

**سیم سوڕین** : سمتو کەفەلی لووسو سپی ، سمتی سپیی وەك زیو .

**سیمار (ثمار)** : کۆی (سەمەر = ثمر)ە ، بڕوانە (سەمەر) .

**سیمین** : زیوین ، هەموو شتێکی سپیی لە ڕەنگی زیو بێ ، هەموو شتێکی لە زیو دروست کراو .

**سیمین بەدەن** : لەشی ســپیی زیوین ، لەشی سپیی وەك زیو .

**سینە** : سنگ ، سینگ .

**سینەیی ئەفگار** : سینگی بریندارو دەردەدارو پــڕ ئازار لــە عیشــقو دڵداری .

**سینەیی چاك** : کینایەتــە بــۆ ئادەمزادی ڕەنجدەر ، خاوەن ئازار ، عاشق ، ئەوەی کارەساتی بە ســەر هاتووە .

**سینی** : قاپێکی پەلی فراوانە ، لە مەعــدەن دروست دەکــرێ ، بۆ نــان لە ســەر خــواردن بە کــار دەهێنرێ ، یا شتی تری خواردنو خواردنەوەی لە سەر دادەنرێ .

**ســێ** : ژمــارە « ٣ » ، ئــەو ژمارەیەی لە پــاش دوو و لە پێش چووارە .

**سێبەر** : (١) سایە . (٢) ئەوەی سێ جار بەر دەدا .

**سێ بڕ** : تەمــەن سێ ســاڵ ، ئەوەی تەمەنی سێ ساڵان بێ .

**سێو** : میوەیێــکی بۆن خــۆشو بە تامە ، لە کوردەواریدا سێوی لا سوورو پاییزیو زستانی هەیە .

**سێیەم** : نیــسبەتە بــۆ (سێ) ،

ئەوەیـە کـە لە پلـەی سێدایـە ، سێیەمین .

**سوبووت (ثبوت)** : پێ لـە جـێ بـوون ، نەبـزووتن ، قایـم ، پایەداری .

**سوبح (صُبح)** : بەیان ، بەیانی ، سەرەتای ڕۆژ .

**سوبحان (سـبحان)** : خـودا ، بەپاکی یاد کردنی خودا .

**سوبحی کازیب (صبح کاذب)** : بەیانی‌ی یەکەم ، یەکەمین ڕووناکی‌ی بەیـانی . ـ **سوبحی سادیق (صبح صادق)** : بەیـانی‌ی دووەم ، ئـەو کاتـەی کـە ڕوونـاکی بە چـاکی دەردەکەوێ .

**سوبحەدەم** : کاتی بەیانی ، بەیانی ، سەردەمی بەیانی .

**سوپاه** : سوپا ، لەشکر .

**سوپەهر** : (١) ئاسمان ، فەلەك . (٢) تەبیعەت .

**سوتوور (ستور)** : حەیـوانی چووار پا ، هەموو حەیوانێکی کە بۆ سووار بوون یـا بارکێشان بە کار بهێنرێ وەکو ئەسپو ئێستر .

**سوجوود (سُجود)** : بـڕوانە (سوجدە) .

**سوجدە (سجدە)** : نێو چـەوان گەیاندنـە سەر زەوی بـۆ مەبەسی عیبـادەتو خ ۆبـە بچـووكو نزم پیشـاندان . بە عـەرەبی‌و تورکی عوسـمانی « سَجدە »و بە فارسی « سِجدە »یە .

**سـوحبەت ( صُحبت )** :
(١) هـاودەمی ، هاوڕێیـەتی . (٢) گفتوگۆ ، دەمە تەقێ .

**سوختە** : ئەو کەسەیە کە قۆناغی پاش قوتابی‌یەتی بردۆتە سەر ، واتە لە حوجرەوە تا کتێبی جامی تەواو کـردووە ، لە پـاش ئەمە دەبێتـە موستەعید .

**سوخەندان** : نووسەر ، ئەدیب ، شاعیر ، ئەو کەسـەیە کە قسەی ڕاستو جووان بڵێ یا بنووسێ .

**سورووج (سُروج)** : کۆی (سەرج = سَرْج)ە ، بڕوانە (زین) .

**سورین (سُرین)** : ڕان ، کەفەڵ ، سمت .

**سوروور (سُرور)** : شـادی ، شادمانی ، گوشادی .

**سوورەییا (ثریّا)** : (١) چلچـرا ، ئەو چرایەیە کە چەند کەڵی پێوەیەو لە بن میچی ژوور شۆڕ دەکرێتەوە. (٢) ئەسـتێرەی پەروێـن ، پێـرو ترازوو .

**سورمە** : کل ، چەشنە خۆڵێکی نەرمو ڕەشو ووردە بۆ ڕەش‌کردنی برژانـگو ڕشـتنی چـاو بە کـار دەهێنرێ .

**سوفەیل (سُفَیل)** : بچـووك کراوەی ( سـەفیل = سـفیل )و ( السُـفل ، السـُفل )ە ، نـزم ، خوری ، ئەوەی لـە ژێرەوە بێ ، ئەوەی لە خووارەوە بێ .

**سوقاق** : کۆڵان .

**سوله‌حا (صلحاء)** : کـــۆی (سه‌لیح = صلیح)ه ، ئه‌و که‌سه‌ی که کاری چاك ده‌کا .

**سولووك (سلوك)** : گرتنـــی ڕێگه‌یێك و لـه سه‌ری ڕۆیشـتن ، ڕه‌فتار ، ڕێـــڕه‌و ، ڕه‌ووشت ، بۆ ته‌ریقه‌ت به کار ده‌هێنرێ .

**سوڵتان** : (۱) فه‌رمـان ڕه‌وا ، پادشا ، مه‌لیك ، شـا ، شاهنشا . (۲) به‌ڵگه ، تووانا ، هێز .

**سوڵح (صلح)** : ئاشتی ، ئاشت بوونه‌وه ، ئاشت کردنه‌وه .

**سونه‌ن (سنن)** : کۆی (سوننه‌ت = سنت)ه ، بڕوانه (سوننه‌ت) .

**سونووح (سنوح)** : ده‌ربڕینـــی بیروڕا به شێوه‌یێکی جووان ، هه‌موو شتێکی به دڵ و خۆش بێ .

**سونووف (صنوف)** : کۆی (سنف = صـنف)ه ، جـۆر ، چه‌شـن ، ته‌وع .

**سونبول** : (۱) لاسك و ته‌دی گوڵه گه‌نم ، گوڵه‌جۆ . (۲) ناوی گوڵێکه له سه‌ره‌تای به‌هاردا ده‌بێ ، به‌تایبه‌تی لـه جـه‌ژنی نـه‌ورۆزدا ده‌یـکه‌نه گوڵدانـه‌وه ، کینایه‌ته بـۆ زولفی دلبه‌ر .

**ســونبولی** : نیســـبه‌ته بـــۆ (سونبول) ، بڕوانه (سونبول) .

**سونع (صـنع)** : (۱) دروسـت کردن ، خه‌لق کـردن ، داهێنان . (۲) چاکه کردن ، چاکی .

**سوننه‌ت (سنت)** : (۱) ڕه‌ووشت ، خـو و ڕه‌ووشـت ، ته‌بیعـه‌ت ، شه‌ریعـــه‌ت . (۲) لـــه زاراوه‌ی زانسـتی‌ی فیـقه دا ئه‌و قســه و کرده‌وه و ڕه‌فتارانه‌یه که پێغه‌مبه‌رو ئه‌سحابه کردوویانه و لـه ســه‌ری ڕۆیشتوون .

**سووار ــ سوار** : (۱) چه‌سپیو ، ڕه‌وان ، ڕێك ، ده‌ست به ســه‌ردا گرتن . (۲) ئه‌و که‌سه‌یه که له سه‌ر ئه‌سپ یا شتێکی تر دابنیشێ و لـه جێگه‌یێك بۆ جێـگه‌یێکی تر بڕوا ، دژی پیاده .

**سووار بوون** : (۱) له سه‌ر وولاخ یا هـه‌ر شتێکی تـر دانیشتن بـۆ مه‌به‌سی ڕۆیشتن لـه جێگه‌یێك بۆ جێگه‌یێکی تر . (۲) جـووت بوونی پیاو له‌گه‌ڵ ژندا ، له‌م کاره‌دا پیاو ده‌که‌وێته سه‌ره‌وه .

**سووان ــ سووین** : (۱) چوونه‌وه ، چوونه‌وه‌ی ڕه‌نگ ، سپی بوونه‌وه . (۲) شـتێك ده‌ستی لێ بـدرێ و له خۆرسکی خۆی بچێته ده‌ره‌وه ، لێ خشێنراو ، کون کراو ، شکێنراو .

**سووه‌یدا (سوَیداء)** : نوختـه‌ی ڕه‌شی دڵ ، ناخی دڵ ، دانه‌ی دڵ ، ناوه‌ڕاستی دڵ .

**سوها (سها)** : ناوی ئه‌ستێره‌یێکی بچووکه و ڕووناکی‌ی که‌مه .

**سوهه‌یل (سهیل)** : ئه‌ستێره‌یێکه نزیکی قوتبـی خووارووه لـه دووا ڕۆژانی هاوین دیار ده‌بێ .

**سووتان** : ئاگـر گرتن ، ئـازار

دیتنی لەش لە ئاگر یا ئاوی کوڵاو یا هەر شتێکی تری داغ .

**سووتاندن** : ئاگر تێبەردان .

**سووتاو** : ئاگر گرتوو .

**سووت** : سووتان .

**سووتن** : سووتان .

**سووچ** : (١) گوناه ، تاوان ، کاری خراپ کردن . (٢) قوژبن ، کونج .

**سوود** : (١) قازانج ، کەلک ، فائیدە ، دژی زیان . (٢) کۆی (ئەسوەد = اسود)ە ، ڕەش .

**سوور** : (١) ئاڵ ، هەموو شتێکی لە ڕەنگی خوێن بێ . (٢) شایی‌و زەماوەند ، کەیف‌و خۆشی ، گوشادی‌و کامەرانی . دژی (شین)ە.

**سووری** : نیسبەتە بۆ ڕەنگی سوور .

**سووڕ (صور)** : شاخێکە یا ئالەتێکی مەعدەنی‌یەو لەو دەکا ، بە فوو تێ کردن دەنگێکی بەرزی لێ هەڵدەستێ . ـ **سووڕی ئیسرافیل** : شەیپووری ئیسرافیل ، بە پێی ئەفسانەی ئایینی ئیسرافیل یەکێکە لە سەرۆکی فریشتەکان ، لەشێکی یەکجار گەورەو لەندەهۆرو چووار باڵی هەیە . لە لەوحدا هەموو ئیرادەیێکی خودا دەخوێنێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا شەیپوور لێ دەدا‌و مردووان هەموو هەڵدەستنەوە ، سێ ساڵ پەیامنێری نێوان محەمەدو خودا بووەو وەحی بۆ هێناوە ، ئینجا جبرائیل هاتۆتە جێگەی .

**سووڕەت (صورت)** : وێنە ، شکڵ، نەقش ، ڕوخسار، پەیکەر .

**سووسەن (سوسن)** : گیایێکە لە تیرەی زەنبەق ، گەڵای باریک‌و درێژو گوڵی جووان‌و بۆن‌خۆشە ، ڕەنگی زەردو شین‌و سپی‌ی هەیە ، سپی‌یەکەی سووسەنی ئازادی پێ دەڵێن .

**سووف پۆش** : خوری پۆش ، ئەوەی جلی بووزوو دەپۆشێ ، دەروێش ، سۆفی .

**سووك** : (١) شتێك قورسایی نەبێ ، دژی گران‌و قورس . (٢) بێ نرخ ، سووك‌و ڕیسوا .

**سۆز** : بڕوانە (سۆزش) .

**سۆزان** : بڕوانە (سۆزش) .

**سۆزی هیجرەت** : ئاگری دووری ، دەردو ئازاری دووری .

**سۆزش** : (١) سووتان ، ئاگر گرتن ، بریندار بوونی لەش بە هۆی ئاگرەوە ، هەموو شتێکی گەرم‌و داغ . (٢) دەردی دڵ ، ئازاری لەش .

**سۆفی (صوفی)** : دەروێش ، مرید ، شێخ ، ئەو کەسەیە کە پێڕەوی تەریقەتی سۆفی (سۆفیزم) دەکا .

**سۆل** : جۆرە پێڵاوێکە .

**سۆر** : شۆر ، بە خۆ ، سوور ،

شتێکی خوێ زۆر تێدا بێ .

**سپەند** : گیایێکی کێوی‌یە ، دەنکی ڕەشی هەیە بۆ چاوئێشە دەیخەنە ئاگرەوە ، بۆنی تایبەتی‌ی هەیە .

**سپی** : هەموو شتێکی ڕەنگی بەفر یا شیری هەبێ .

**سپیدە** : (١) سپی‌یەتی‌و ڕووناکی‌ی بەیانی . (٢) سپی‌یێنەی هێلکە .

**ستارە** : بڕوانە (ئەستێرە) .

**ستاندن** : وەرگرتن .

**ستەم** : زۆرداری ، ئازار، زولم ، جەور .

**سدیقەیی مەعسوومە ( صدیقهء معصومه )** : لەقەبی فاتیمەی کچی محەمەدو ژنی عەلی‌یە .

**سدیقی عەزیز** : سدیقی خۆشەویست ، مەبەس ئەبوو بەکرە، بڕوانە (ئەبوو بەکر) .

**سرێشك** : فرمێسك ، ئەسرین ، دڵۆپە ، دڵۆپەی ئاوی چاو کە لە کاتی گریاندا دێتە خوارێ .

**سروشت** : خوو و ڕەووشت ، تەبیعەتی ئینسان .

**سرف (صرف)** : (١) نویشکی هەموو شتێك ، نویشك ، بێ گەرد ، (٢) شەرابی بێ غەش .

**سرر (سر)** : نهێنی ، شتی داپۆشراوو نەبینراو .

**سرکە** : (١) شتێکی شلی ترشە لە ترێو خورماو میوەی ئاوداری تر دروست دەکرێ ، سرکەی ترێ لە هەموویان باشترە ، کینایەتە بۆ گرژی‌و تووڕەیی . (٢) هەوری ، جۆرە قوماشێکی ئاوریشمی‌یە ژنان سەری پێ دەبەستن ، سەرپێچی ژنان .

**سروە** : شنەی با ، دەنگی بای شەماڵ .

**سڕ** : سڕبوون ، تەزینی دەست‌و پێ .

**سست** : بێ‌توانا ، لەڕ ، لاواز ، بێ‌دەوام ، تەمبەڵ ، دژی سەخت .

**سستی** : بێ‌توانایی ، لاوازی ، تەمبەڵی ، نەرمی‌و لە سەرخۆیی .

**سفت** : سەخت ، توند ، پتەو ، ئەستوور .

**سفر (صفر)** : (١) لە زاراوەی زانستی‌ی ژمارەدا دروشمێکە وەکو نوختە « . » . (٢) بەتاڵ ، پووچ ، هیچ .

**سفرە** : بڕوانە (خووان) .

**سفتو سۆی** : دەست تێ‌وەردان، ئازاردان ، ژاکاندن .

**سلێمان (سلیمان)** : بە پێی ئەفسانەی ئایینی کوڕی داوودە ، مەلیکی هەرە بە تواناو شان‌و شکۆی نەوەی ئیسرائیلە ، لە سەدەی دەیەمی پێش زایین پلەی پێغەمبەری بووە ، گۆیا خودا بای خستبوە ژێر فەرمانی ئەو ، زمانی هەموو ئاژاڵ‌و باڵندەیێکی دەزانی سامانێکی گران‌و بێ ژمارەی بووە ،

ئەموستیلەیێکی هەبوو « ئیسمی ئەعزەم »ی لە سەردا نەقش کرابوو بە هۆی ئەوەوە ئادەمزادو پەریو فریشتەو ئاژاڵو باڵندەو هەموو گیاندارێك لە ژێر فەرمانی ئەودا بوون . کە هەواڵی بەلقیسی قەرالیچەی سەبای بیست بڕیاری جەنگی لەگەڵدا ، بەلقیسیش ویستی سلێمان ببینێ بۆ ئەوەی لە لایێك جادووەکانی خۆی بۆ بنوێنێو لە لایێکی تریشەوە حیکمەتی سلێمان وەربگرێ . سلێمان فەرمانی بۆ با دەرکرد کە بەلقیسی بۆ بێنێ بە تەختو تاراجی‌یەوە ، کە گەیشتە دەرگای سلێمان شووی پێ‌کرد ، بڕوانە (بەلقیس) .

**سلێمانان** : کۆی (سلێمان)ە ، مەبەس سلێمان پاشایە ئەوەی لە پاش خەباتو شەڕو شۆڕێکی بنەماڵەیی دوورو درێژ تووانی دەسەڵاتی خۆی بە سەر میرنشینی سلێمانی‌دا بگرێ ، دووا ساڵانی ژیانی ئاسوودە بوو لە ساڵی (١٢٥٤هـ/١٨٣٨م)دا کۆچی دووایی کردو ئەحمەد پاشای کوڕی لە جێی دانیشت .

**سلێمانی** : شاری سلێمانی یەکێکە لە شارە هەرە تازەکانی کوردستان لە ساڵی (١١٩٩هـ/١٧٨٤م) لە لایەن برایم پاشاوە بنیاد نراوە ، بەڵام ناوچەکەی یەکێکە لە ناوچە هەرە کۆنەکانی شارستانی‌یەتی ئادەمزاد ، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەم شاری سلێمانی پایتەختی میرنشینێکی کوردی سەربەخۆ بووە ، ئنجا عوسمانی‌یەکان داگیریان کرد تا دەوروبەری جەنگی جیهانی‌ی یەکەمو پاش جەنگ لە لایەن ئینگلیزەوە داگیر کرا ، دەمێکیش حوکومەتی کوردستانی خوواروویی لێ‌دامەزرا لە پاشانا کەوتە دەوڵەتی عیراقەوە ، لە کوردەواری‌دا شاری هەڵمەتو قوربانی پێ‌دەڵێن ، مەڵبەندی ناوەندی‌ی سامانی نەتەوایەتی‌ی کوردە .

**سم** : ماددەیێکی شاخی‌یە لەباتی سەرپەنجەو نینۆکە بۆ ئەسپو وڵاخو ئێستر .

**سماق** : ترش ، بە شێوەی دانەیە ، هەر یەکەی هێندەی دەنکە نیسکێکە وەکو هێشوو بە دارەوە دەبێ ، ڕەنگی سووری پەمەیی‌و تامی ترشە ، درەختی هێندەی دار هەنارە لە کوێستانان‌دا دەڕوێ ، لە کوردستان‌دا زۆرە .

**سمین** : کون کردن ، درز تێ‌خستن ، ــ **نەسمراو** : کون نەکراو . ــ **نەسمابێ** : کون نەکرابێ.

**سمت** : ڕانو کەفەڵ ، سەرووی ڕان ؛ گەڵو قوزی ژن ، جێگە شارراوەکانی ژن .

**سنەوبەر (صنوبر)** : دارێکی گەورەیە لە چنار دەکا ، گەڵای درشتو سەوزی تۆخە ، بەری لە شێوەی دڵی بەرخ دەکا ، جۆرە قەترانێك لەم دارە دەردێنن .

**سندووق (صندوق)** قوتـــووی گەورە لە دار یا مەعــدەن دروست کراو .

**سیا :** ڕەش ، تیرو تاریك .

**سیادەت (سیادة) :** (۱) گەورەیی، ســـەروەری . (۲) ســـەیدی ، پێغەمبەرو نەوەی پێغەمبەر .

**سیاه :** بڕوانە (سیا) .

**سیەه :** بڕوانە (سیا) .

**سیەه ڕوو :** ڕوو ڕەش .

**سیەه سەنگ :** (۱) بەردی ڕەش، بـەردە ڕەش . (۲) بـەردی ڕەشی کەعبە (حجر الأسود) .

**سیەه مار :** ڕەشـمار ، مـاری ڕەش .

## ش = ş

**شــا :** (۱) ســولتان ، خـاوەنی تەختو تـاراج ، خـاوەنی تانـج ، سەرۆکی مەملـەکەت ، شەهریار . (۲) شـــای شـــەترەنج ، مەلیـکی شەترەنج . (۳) هەمـوو شتێکی لە جنسی خۆی گـەورەو چاکو بەڵکە بێ ، وەکـو : شابەیت ، شـاپەڕ ، شاکار .

**شاخ :** (۱) شـــتێکە لە ئێســقان دەکا لە ســەری هەندێ حەیوانات دەڕوێ ، قۆچ . (۲) کێو ، چیا . (۳) پیاڵەی شەراب . (٤) لق .

**شــاد :** خـۆش ، بەختیـــار ، شادمان ، گوشاد .

**شاداب :** شاداو ، شاد بوون بە ئاو ، تەڕو تێراو ، تەڕو تازە .

**شادی :** خۆشی ، بەختیاری ، شادمانی ، گوشادی .

**شادمانی :** بڕوانە (شادی) .

**شار :** ئاوایی گەورەی کە شەقامو کۆڵانو ماڵو دوکانی زۆرو کۆمەڵە خەڵکی زۆری لێ بێ .

**شارەزا :** پسپۆر ، کەسی ئاگادار لە شتێك .

**شارەزوور :** ناوچەیێکی فراوانە لـە کوردســتانی خـــواروودا ، سەرەتای لـە بنـاری شـاخەکانی هەورامانەوەیە ، خاکێـکی بە پیتی هەیە ، مەڵبەندی شارستانیەتێکی گەلێ کۆنە لە بەر ئەوەیە شوێنەواری ئەرکیۆلـۆجی‌ی زۆرە . لـە پـاش جەنگی جیهـانی‌ی دووەمو دروست کـردنی بەنـداوی دەربەنـدی‌خان گەلێکی ئـەم دەشـتە کەوتە ژێـر ئاوەوە ، کـوردی ئەو ناوچەیـە بە شـێوەی گـۆرانی زمانی کـوردی دەدوێن ، بەڵام لە پاش بنیاد نانـی شاری سـلێمانی‌و پەیـدا بـوونی ئەدەبی نـالی شێوەی گـۆرانی لەو ناوچەیەدا بەرەو کزی ڕۆیشتو لـە چووارچێوەی تەریقەتی نەقشبەندی مایـەوەو بـــەرەو نەمـان دەڕوا . دیـارە تەریقەتـەکەش ڕزیـوەو لە گیان‌دان‌دایە چونکە لەگەڵ گۆڕرانی مێژوو و ئایدیۆلۆجی‌یەتی ئادەمزادی ئەم سەردەمە ناگونجێ .

**شاریح (شارِح)** : ئـەوەی شت ڕوون دەکاتـەوە ، ئەوەی لـە شت دەکۆڵێتەوەو ئاشکرای دەکا .

**شاعیر (شاعِر)** : ئەوەی شـیعر دەڵێ ، ئەوەی شـیعر دەنووسێ ، غەزەلخوان .

**شام** : (١) ئێـوارە ، سـەرەتای شەو ، ئەم کاتەی کە تازە تاریـکی دەست پێدەکـا ، کینایەتـە بـۆ ڕەشیو تاریـکی . (٢) خوواردنی ئێوارەو شەو . (٣) وولآتی سووریە، شاری دیمەشق .

**شامات** : کۆی (شام)ە، (١) بڕوانە (شام) . (٢) کۆی (شامە)یە ، خاڵ . (٣) شامرد ، مردنی شا ، زاراوەیێکە لـە یـاریی شـەترەنج بـە کـار دەهێنرێ .

**شان (شأن)** : گەورەیی ، مەزنی ، کار ؛ پلەی کۆمەلآیەتیی بەرز .

**شان** : جێی بە یـەك گەیشتنی دەست لەگەڵ لەش ، ئێسقانی لای ڕاستو چەپی خووار مل .

**شانامە (شاهنامە)** : نـــاوی کتێبەکەی ئەبولقاسم حەسەن کوڕی ئیسحاق شەرەف شای فیردەوسی تووسی(٩٤٠ز ــ ١٠٢٠ز)یە ، باس لە داستانی ئەفسانەیی شاهنشاهانو پاڵەوانانی ئێران دەکا ، چیرۆکێکـی شیعری درێژە دەوروبەری شەست هەزار دێڕە شیعرە ، زمانی فارسی تازە لەوەوە دەسـت پێدەکا یا بە هۆی ئەوەوە زیندوو بووەوە .

**شانە** : (١) شـــە ، شتێکی ددان دارە مووی سـەری پێ دادەهێنن‌و ڕێکی دەخەن . (٢) شان ، شـان‌و مل ، ئەو جێیەی دەست‌و قـۆڵ‌و باسك بە لەشەوە نووسێنراوە . (٣) ماڵی هەنگ .

**شانە بەرز** : شان بڵند .

**شاه** : بڕوانە (شا) .

**شاهی** : (١) نیسبەتە بۆ (شاه) ، بڕوانە (شـا) . (٢) ناوی پارەیێکی ئێـرانە . (٣) نـاوی سـەوزەیێکی خوواردنەوە . (٤) ناوی شاعیرێکی عەجەمە .

**شاهی ئاسەفی سانی (شاه آصف ثانی)** : سلێمان پاشای میری سلێمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نـۆزدەم ، بڕوانە (سلێمانان) . ــ **ئاسەفی یەکەم یا ئاسەف** : وەزیـــری ســـلێمان پێغەمبەر بووە ، بڕوانە (ئاسەف) ، کە شاهی ئاسەف سلێمان پێغەمبەر بێ شاهی ئاسەفی دووەم ســلێمان پاشایە .

**شاهی توڕڕە نووس** : شاهنشا ، شای گەورەی کە توڕڕەو دروشم‌و سککەو پارەی هەبێ .

**شاهید (شاهِد)** : (١) بـــووك ، کچی جووان ، دلبەر ، مەعشووق . (٢) گەواه ، ئەوەی ڕووداوێك بـە چاوی خۆی دەبینێ .

**شاهیـدی بیکـر** : دلبـــەر ، خۆشەویست ، مەحبووبە .

**شاهێن** : (١) زمانی تەرازوو ، ئەو شتە یا ئالەتە درێژەیە کە هەر دوو تای تەرازوو بە هەر دوو سەری‌یەوە دەکرێ . (٢) یەکێکە لە باڵندە شکاری‌یەکان لە عیقاب دەکا ، نینۆکو چنگی بە هێزی هەیە .

**شاهێنی** شاهی : شاهێنی چاکو ڕەسەن ، شاهێنێك شایانی شا بێ .

**شاهنشاه** : شاهی شاهان ، گەورە ، مەزن ، خاوەن شکۆ .

**شاهنشەهی** : نیسبەتە بۆ (شاهنشاه) ، بڕوانە (شاهنشاه) .

**شایەد** : (١) بڕوانە (شاهید) . (٢) بەشکو ، ئەگەر، مەگەر ، ڕەنگە، دیارە .

**شایی** : سەماو هەڵپەڕین ، هەڵپەڕکێ ، ئاهەنگ .

**شایی‌کەر** : ئەو کەسەیە کە هەڵدەپەڕێ ، ئەو کەسەیە کە لە هەڵپەڕکێدا بەشدار دەبێ .

**شایستە** : شایان ، وەشانەوە ، لایەق .

**شەئن (شان)** : کار ، حاڵ ، وەزع ، کاری گەورە .

**شەب** : شەو ، بڕوانە (شەو) .

**شەبەه (شبه)** : (١) وەکو . (٢) شەوە ، جۆرە مووروویێکی ڕەشە ، بەردێکی ڕەشی بریقەدارە . (٣) دارێکی دڕکدارە ، گەڵای زەردو گوڵی سووری هەیە .

**شەبیه (شبیه)** : وەکو .

**شەبباك (شباك)** : کوێ (شەبەکە = شَبَکە)یە ، هەموو شتێکی کون کون ، تۆڕی ماسی گرتن ؛ پەنجەرە.

**شەبستان** : جێی نوستن ، حەرەمسەرا .

**شەت (شط)** : ڕووبار ، زێ ، ئاوی زۆرو گەورەی کە دەڕژێتە ناو زەریا .

**شەتت (شطّ)** : بڕوانە (شەت) .

**شەجەر (شجر)** درەخت ، دار .

**شەخس (شخص)** : تارمایی ، ئادەمزاد لە دوورەوە ، لەشی ئادەمزاد ، لەش ، کەس . (٢) چاك . پیاوچاك ، گوڕی پیاوچاك .

**شەراب (شَراب)** : مەی ، هەموو شتێکی شلی کە دەخورێتەوەو ئادەمزاد سەرخۆش دەکا .

**شەرار (شَرار)** : پڕووشکە ، قرچە ، ئەوەی لە ئاگرەوە بۆ هەوا دەپەڕێ .

**شەرەر (شَرَر)** : بڕوانە (شەرار) .

**شەرەف (شَرَف)** : گەورەیی ، ئابڕوو ، بڵندی ، پلەی کۆمەڵایەتی‌ی بەرز .

**شەربەت (شربت)** : (١) ئەو بەشە خواردنەوەیە کە بە جارێك دەخورێتەوە . (٢) ئاو یا خۆشاو یا شەکرێ کە لە ئاودا دەتوێنرێتەوە .

**شەرت (شرط)** : مەرج ، پەیمان ،

قەرار ، بڕیـــار ، پێوەندیی شتێك بە شتێكی ترەوە .

**شەرح (شَرح)** : ئاشكرا كردن ، ڕوون كردنەوەی شـتێكی قورس ، كردنەوە ، بەیان كـردن ، فـراوان كردن .

**شەرزە** : تـــووڕە ، پـەست ، زۆردار ، بەهێزو توانا .

**شەرع (شرع)** : ئایینو مەزهەب ، تەریقەتو ڕەووشتی ئایینی كە خودا بۆ بەندەی داناوە .

**شەرم (شَرْم)** : ناموس ، حەیا .

**شـــەرمەندە** : شـــــــــەرمن ، شەرمەزار ، ئـەو كەسەی شـەرم دەكـا ، ئـــەو كەســـەی شــەرم گرتوویەتی .

**شەڕ** : بەدی ، خراپە ، خەراپە ، دەعوا ، دژی خێر .

**شەش** : ژمارە « ٦ » ، ژمارەی پاش پێنجو پێش حەوت .

**شـــەش جانیب** : شـــەش لا ، (ڕاســـت)و (چـــەپ)و (ژووروو)و (خوواروو)و (سەر)و (بن) .

**شەش دانگ** : تـەواو ، كامڵ ، بێ كەمو كـووڕی ، تاقمی تەواو كە بریتی‌یە لە شەش پارچە .

**شەشدەر** : شـــەش خـــان ، زاراوەیێكە لە یاریی نەرد (تاوڵە)دا بە كار دەهێنرێ ، بریتی‌یە لەوەی كە یەكێ لە دوو یاری‌كەرەكە شــەش خـانی لای خـــۆی بگـرێ بەمـــە بەرامبـــەرەكەی دەبەســـتێتەوەو ناتـــووانێ پوولـــەكانی خـــۆی ببزوێنێتەوە ، بڕوانە (نەرد) .

**شەعائیر (شعائر)** : كۆی (شەعیرە =شعیرە)یە، ئەو كردەوەو ئایینانەن كە لە حـەجدا دەكـرێن ، هەمـــوو كردەوەیێكی ئایینی یا مەزهەبی یا نەتەوایەتی .

**شەعر (شَعر)** : موو ، مـــووی ئادەمزاد ، تووكو مووی ئاژاڵ .

**شەفاعەت (شفاعت)** : تـــــكا كردن ، پاڕانەوە ، تكا كردن لە یەكێ بۆ ئەوەی لە یەكێكی تر ببوورێ یا یاریدەی بدا .

**شەفیر (شفیر)** : (١) جێـــــگەی دەرچوونی برژانگ لە سەر قەپێلكی چـاو . (٢) ڕۆخو قـــەراخو لای هەموو شتێك .

**شەفیع (شفیع)** : تكاكەر ، ئەو كەسەی دەپاڕێتەوە ، ئەو كەسەی تكا لـە یـەكێ دەكا بـۆ ئەوەی لـە یەكێـكی تر ببـــوورێ یا یاریـــدەی بدا .

**شەق (شق)** : (١) درز بـــردن ، دوو پارچە بـــوون ، كەرت بوون ؛ پارچە ، نیوەی شتێك ، لایێكی بار . (٢) شـــەق تێ‌هەڵدان : دانـــە بەر شـەق ، لێدان لە شتێك بە پێ .

**شەقاوەت (شقاوت)** : بەدبەخت بــــوون ، بەدبەخـــتی ، دژی بەختیاری .

**شەقایق ـ شەقایق (شقائق)** : گوڵاڵە ســووره ، لالـــە ، گوڵێـــكی

کێوی‌و ماڵی‌یە لـە خەشخاش دەکا بەڵام هەنـدێ بچووکتـرە ، چەند جۆرێکی هەیە یەکێکیان پێنج پەڕی هەیە ، هەندێکی تری لە پێنج پەڕ زیاتـرە جۆرە کێوی‌یـەکەی ڕەنگی سووری ئاڵی ئاتەشی‌یـە لە سەر پەڕەکانی‌دا لەککەیێکی ڕەش هەیە .

**شەقی (شقی)** : بەدبەخت ، دژی بەختیار .

**شەققی ئەیوان** : درز تێ‌کەوتنی تاقی کیسرا لە مەدائین (سەلمان‌پاك) لە نزیك شاری بەغداوە .

**شەققی فەلەك** : دوو کەرت بوونی فەلەك ، ڕووخانی چەرخ‌و فەلەك ، کینایەتە بۆ ڕۆژی قیامەت .

**شەکەر (شکَر)** : ئەو شیرینی‌یەی کە لە چەوەندەر یا قامیش دروست دەکرێ ، شەکر ، قەند .

**شەکەر بێز** : ووردە شـەکر ، شەکری لە بێـژنگ دراو ، شـەکر دابێژ ، شەکر پژێن .

**شەکەر خەند** : بـزەی شیرین ، پێکەنینی شیرینی وەك شەکر .

**شەککەر** : بڕوانە (شەکەر) .

**شەککەر بار** : شـەکەر بـار ، شەکراوی ، شیرین ، زۆر شیرین .

**شەل** : ئـەو کەسـەیە کـە کەموکووڕی‌یێـك لە پێی هـەبێ‌و ڕۆیشتنی تەبیعی نـەبێ ، ووشەکە لە (شلل)ەوەیە .

**شەڵتە** : ئەو شتەیە کە سەرگین‌و زبڵ‌و پەیین‌و شتی تری تێ دەکرێ‌و لە سـەرپشتی وولاغ دادەنرێ بـۆ گوزانەوە ، لە جەواڵ‌و ڕەشبکەی کاڵ دەکا .

**شەم** : (١) شەمع ، مۆم ، موم . (٢) سەرپەنجەی ناسـکی دەست‌و پێ .

**شەماڵ** : بای نەرم ، بای فێنك .

**شەمامە** : جـۆرە کاڵەکێـکی بچووك‌و نەرم‌و تۆکڵی لووسە ، خەتی سوورو ڕەش‌و سـەوزی تێدایە ، لەگەڵ مەمکی کچ‌و ژن‌دا بەرامبەرو بەراوورد دەکرێ .

**شەمەت (شمط)** : ڕیش‌و سەری ماش‌و برنج ، مـووی ڕەش‌و سپی تێکەڵ .

**شەمیم (شَمیم)** : (١) بـۆنی خۆش ، بۆن‌خـۆشی . (٢) بڵند ، بەرز .

**شەمس** : ڕۆژ ، خۆر .

**شەمع (شمع)** : مۆم ، موم .

**شەناوەر (شناور)** : مەلـەوان ، ئـەو کەسەی لە ئـاودا مەلەوانی دەکا ، شتێك کـە دەکەوێتە سەر ڕووی ئاو .

**شـەو** : لـە ڕۆژئـاواوە تـا ڕۆژهەڵات ، سەردەمی تاریکی .

**شەوارە** : (١) هەموو باڵندەیێکی کە بە شەو بگیرێ . (٢) شەو کردن بـە ڕۆژ لـە ئاهەنـگ‌دا ، شـەو نەنوستن .

**شەوە** : (١) بەردێکی ڕەشـی بە

ترخە ، لـە خشڵی ژنـاندا بە کار دەهێنـرێ . (٢) نەخۆشـیـیێکە منداڵی ساوا تووشـی دەبێ‌و دەیکـوژێ ، لـە ئەفسـانەی کوردەواریدا گۆیا جنۆکەیێکە ئـەم دەردە بۆ منداڵی بچـووك دەهێنێ‌و دەیکوژێ ، هەر وەکو « ئاڵ » دایکی ساواو ژنی زەیستان دەکوژێ .

**شەوی قەدر** : شـەوی عیبادەت‌و مانگی قەمەری، سێ شەوی دووایی مانگی قەمەری کە مانگ دیار نابێ . پارانەوەیە ، شـەوانی ٢١ ، ٢٣ ، ٢٧ی مانگی ڕەمەزانە .

**شەوی گێراوە بە فەردا** : شەوی کردووە بە ڕۆژ .

**شەوی مەحاق** : شەوی دووایی مانگی قەمەری ، سێ شەوی دووایی مانگی قەمەری کە مانگ دیار نابێ .

**شەوی میعراج** : ئەو شەوەیە کە محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان بە فەرمانی خـودا چـووە ئاسـمان‌و گەیشـتە بـارەگای خودا ، هیچ کەسێك‌و شتێك نەگەیشتۆتە ئـەو جێیە .

**شەوبۆ** : گوڵێکی بـۆن خۆشە ، ڕەنگی زەردی کاڵ‌و سووری تـیری هەیە ، قەدی گیاکـەی تا نیو مەتر بـەرز دەبێ ، لە بەهـاراندا گـوڵ دەکـا ، بـە شـەو بۆنی لـە ڕۆژ زیاترە لە بەر ئەوەیە شەو بۆی پێ دەڵێن .

**شەوچرا** : (١) هەموو شتێکی کە لە شـەودا تیشـك‌و ڕووناکیی هەبێ .

(٢) کرمێکی بچووکە لە ناو تاریـکی شـەودا وەکو فسفۆر دەبریسکێتەوە.

**شەوچراغ** : بڕوانە (شەوچرا) .

**شەوق (شوق)** : (١) ئارەزوو ، مەیـل ، ڕەغبـەت ، ئیشـتیقاق ، بیرکردن ، یاد ، نیاز. (٢) ڕووناکی ، تیشك .

**شەوقی** : نیسبەتە بۆ (شەوق) ، بڕوانە (شەوق) .

**شەوکە** : تاکی (شەوك=شوك)ە، دڕك ، خار .

**شەوکەت (شوکت)** : (١) چـەك‌و سیلاح‌و تیـژیی چەك‌و سـیلاح ، تیژیی هەموو شتێك . (٢) هێزو توانا ، شکۆ و پلەی بەرز ، خاوەن جێگە‌و شان .

**شـەوگەرد ــ شـەوگەردان** : (١) پاسەوان ، ئـەو کەسەیە کە بە شەو دەگەڕێ ، عەسەس . (٢) دز .

**شەونم** : خوناو ، ئاوونگ ، ئەو تەڕاییەیە کە شەو لە سەر گیا یا شتی تـر دروست دەبـێ ، ئـەو دڵۆپەیە کە لە دڵۆپی باران دەکاو بە شەو لە سەر گوڵ دەنیشێ .

**شەه** : بڕوانە (شا) .

**شەهاب (شهاب)** : (١) گڵپـە ، گڵپـەی ئاگـر . (٢) ئەسـتێرە ، ئەستێرەی ڕووناك‌و تیشكدار .

**شەهادەت (شهادت)** : (١) گەواە، باوەڕنامە . (٢) کوژران لە ڕێگەی چاکە .

**شەهید (شهید)** : (١) ئامادە ، گەواه ، شاهید ، (٢) ئەو کەسەی لە ڕێگەی چاکە دەکوژرێ .

**شەهیدی کەربەلا** : حوسێنی کوڕی عەلی‌ی کوڕی ئەبی تالیب (٦٢٥ – ٦٨٠ز) کوڕی فاتیمەی کچی محەمەدی پێغەمبەری موسولمانانە ، لە سەر خیلافەت لەگەڵ یەزیدی کوڕی موعاوی‌یە تێکچوون ، لە ئەنجامی جەنگێك کە لە شاری کەربەلا ڕوویدا حوسێن کوژراو یەزید بە خەلیفە مایەوە ، بەم هۆیەوە حوسێن بوو بە شەهیدی کەربەلا .

**شەهپەڕ** : شاپەڕ ، شاباڵ ، پەڕی گەورەی باڵندە ، گەورەترین پەڕ لە باڵی باڵندەدا .

**شەهد (شهد)** : هەنگوین .

**شەهد لەب** : لێوی شیرینی وەك هەنگوین .

**شەهسووار** : شاسووار ، سوواری ئازاو دلاوەرو چالاك .

**شەهلا (شهلاء)** : مێی (ئەشهل = اشهل)ە ، ژنی چاو ڕەشی مایل بە شین کە نموونەی جوانی‌یە .

**شەهنشا** : شاهنشا ، شاهی شاهان ، پادشای گەورە ، مەلیك .

**شەهنشاه** : بڕوانە (شەهنشا) .

**شەیاتین** : کۆی (شەیتان = شیطان)ە ، بڕوانە (شەیتان) .

**شەیئ (شیء)** : شت ، چشت .

**شەیب (شیب)** : مووسپی بوون ، مووی سپی ، پیری .

**شەیپووڕ** : نەفیر ، بووق ، جۆرە ئالەتێکی مۆسیقایە بە شێوە لە زوڕنا دەکا .

**شەیپووڕی شاپوور** : نەفیری شاپوور . ـ **شاپوور** : یەکێکە لە عەییارەکان لە ئەسکەندەرنامەدا ناوی هاتووە ، بڕوانە (عەییار) .

**شەیتان (شیطان)** : دێو ، ئەهریمەن ، ئیبلیس ، یاخی بوو ، ئەو کەسەی فەرمان ناگەیێنێتە جێ ، لە خودا عاسی .

**شەیدا** : شێتی دڵداری ، پەرێشان ، عاشق .

**شیر** : (١) شمشیر ، چەقۆیێکی پۆلایی درێژە ، دەم و نووکی تیژە . (٢) شتێکی شلی سپی‌یە لە پاش منداڵ بوونی ژن یا زایینی حەیوان لە مەمکی دایك دێتە دەرێ .

**شیرە** : ئەو ئاوە تیرەیە کە لە میوە دەردەهێنرێ ، ئاوی ترێ یا توو بکولێنرێ تا پەیت و خەست دەبێ ، شەکراوی تیری کولێنراو .

**شیرین** : (١) دلبەری خوسرەوی پەرویز بوو ، لە جوانی‌دا بێ هاوتا بووە ، هەندێ لە مێژوو نووسان بە گریکی دەزانن ، هەندێکی تریش بە خەڵکی خۆزستانی دادەنێن ، ئەم ژنە عاشقێکی تریشی هەبوە ناوی فەرهاد بوو دەڵێن خوسرەو فەرمانی بۆ فەرهاد دەرکرد کە شاخی

بێستوون هەڵبکەنێ‌و کونی بکا ، بەسەرهاتی عیشقی « فەرهادو شیرین »و « خوسرەو و شیرین » لە ئەدەبیاتدا ڕەنگی داوەتەوە . (٢) هەموو شتێکی تامی شەکری هەبێ ، دژی تاڵ .

**شیرینی** : (١) نیسبەتە بۆ (شیرین) ، بڕوانە (شیرین) . (٢) خواردەمەنی‌یێکە لە شەکر یا هەنگوین‌و ڕۆن‌و ئاردو شتی تر دروست دەکرێ ، چەشنی زۆرەو شێوەی دروست کردنیشی ڕەنگاو ڕەنگە .

**شیرینی خوسرەو** : بڕوانە (شیرین) .

**شیرین قەڵەم** : ئەو کەسەیە کە جوان دەنووسێ ، خاوەن ئوسلووب لە نووسیندا ، ئەو شاعیرو نووسەرەی بەرهەمی شیعرو نووسینی نایابی هەیە .

**شیشە** : بڕوانە (شووشە) .

**شیعار (شِعار)** : دروشم ، ڕەسم ، وێنە ، عەلامەت .

**شیعە** : مەزهەب‌و تیرەیێکی ئایینی ئیسلامە باوەڕیان بەوەیە کە خیلافەت لە پاش مردنی پێغەمبەر بۆ عەلی‌ی کوڕی ئەبی تالیبە لە پاش ئەو بۆ منداڵەکانیەتی .

**شیعر (شِعر)** : قسەی بە کێش‌و قافیەو هۆنراوە ، ئەو قسەیەی کێش‌و قافیەو خەیاڵی تێدایە .

**شیفا (شِفاء)** : (١) چاکبوونەوە لە نەخۆشی . (٢) دەرمان ، داوو دەرمان .

**شیفا (شِفاه)** : کۆی (شەفە = شفە)یە ، لێو .

**شیفتە** : عاشق ، سەرگەردان ، ئاوارە ، حەیران .

**شیققە (شِقّة)** : نیوەی هەموو شتێك ، پارچەی هەموو شتێك ، شتێك بشکێ‌و ببێ بە دوو پارچە ، درز .

**شین** : (١) ڕەنگی نیلی ، ڕەنگی بنەوشە ، ڕەنگی ئاسمان ، سەوزی‌ی درەخت . (٢) شیوەن ، ماتەم ، کارەسات ، ناخۆشی .

**شین ڕەنگ** : ڕەنگی شین ، ڕەنگی ماتەم .

**شین کردن** : (١) شیوەن کردن . (٢) ڕەنگ کردنی شتێك بە ڕەنگی شین ، لە خوم دانی جل‌و بەرگ یا هەر پارچەیێك .

**شیو** : (١) چەم ، ئەو جێ‌یەی ڕووبارو زێی پێدا دەڕوا ، بەست . (٢) چێشت .

**شیوەسوور** : بەستێکە لە خوواروی چەمچەماڵی دیوی کەرکووکەوەیە ، هەندێ جار ئاوی پێدا دەڕوا ، دەبێ لە بەر ئەوە شیوەسووریان پێ‌ووتبێ چونکە خۆڵەکەی سوورە یا ئاوی سووری قوڕاوی پێدا ڕۆیشتووە .

**شیوی ئاودار** : ناوی شیوێکە

کەوتبـووە لای ڕۆژئـاوای شـاری سلێمانی‌یەوە ، لە بەھاران‌دا ئـاوی پێدا دەھات ، ئێستاکە کەوتۆتە ناو شارەوە .

**شێت** : شەیدا ، ئەو کەسـەی عەقل‌و مێشکی نەبێ ، دژی عاقل .

**شێخ** : (١) پیاوی گەورەو زانا ، سەرۆکی تەریقـەتی دەروێشـی ، مورشید . (٢) پیاوی پـیر ، کەسی بە ساڵاچوو .

**شێخەباس (شێخ عەباس)** : پیاو چاکێك بـووە شوێنـەکەی لـە لای خوارووی شاری سلێمانی‌یەوەیە ، نزیکی گوندی قەرەتۆغان‌و بەرامبەر ماڵەکانی ووڵووبەیە . دیارە بە پێی نەریتی کـوردەواری مەرقـەدەکەی بە پارچـەی سـەوز ڕازاوەتـەوەو عەلەمەکەی پۆشتەو پەرداخ بووە . گەڕەکی جوولەکانی سلێمانی لە پاش کۆچیان لە ساڵی ١٩٤٩ـ١٩٥٠ بە ناوی ئەم چاکەوە ناو نراوە .

**شێر** : ئاژاڵێـکی گەلێـك بـە توانایە ، خاوەنی بازوو و چڕنووکی بەھێزو تیژە ، گۆی گەلێك سووکە ، بە زۆری لە ئەفەریقاو ئاسیا دەژی ، سوڵتانی ئاژاڵ‌و جانەوەرانە .

**شێرانی شکار** : (١) ئەوانـەی ڕاوی شـێر دەکەن ، ڕاوکـەری شێر . (٢) کەسی ئازاو دلێر .

**شێری شەرزە** : (١) شـێری تـووڕە . (٢) کینایەتە بـۆ عەلی‌ی کوڕی ئەبی تالیب ، بڕوانە (عەلی) .

**شێری نەڕ** : شێری نێر ، بەڕە شێر .

**شێری یەزدان (اسداللە)** : شێری خودا ، کینایەتە بۆ عەلی‌ی کـوڕی ئەبی تالیب ، بڕوانە (عەلی) .

**شێو** : (١) سـەردەمی ئێوارە . (٢) خـوواردنی ئێـوارە ، بـڕوانە (شیو) .

**شـێوە** : ڕێ‌و ڕەووشـت ، دەسـتوور ، قانـوون ، شـکل ، ڕوخسار ، وێنە ، ڕەسم

**شوبھە (شُبە)** : لە یەك چوون ، وەکو .

**شوبھە (شُبْھە)** : گومان ، شك ، کارێـکی شـارراوەو داپۆشـراو ، کارێکی نەتوانرێ ڕاست‌و چـەوتی دیاری بکرێ .

**شوبھەت (شُبْھەت)** : بڕوانـە (شوبھە) .

**شوتور** : ووشتر ، حوشتر .

**شوتوربان** : ووشـتـرەوان ، شووانی ووشتر .

**شوتوربانا !** : ئەی ووشترەوان !

**شوتورمورغ** : ووشـتر مورغ ، باڵندەیێکی لەش گەورەو پێ درێژو باڵ بچووکە ، ناتووانێ بفڕێ بەلام لە سەعاتێك‌دا ماوەی (٤٠) کیلۆمەتر دەڕوا ، لـە بیابـانانی ئەفریقادا دەژی .

**شوستوشۆ** : حەمـام کـردن ،

خاوێن کردنــەوە ، خۆشــوشتن ، شوشتن ، شتن .

**شوشتن** : پاككردنەوەی شت بە ئاو .

**شوعاع (شُعاع)** : ڕوونـــاكی‌ی ڕۆژ ، تیشكی خۆر .

**شوعەرا (شُعَراء)** : كۆی (شاعیر = شاعِر)ە ، بڕوانە (شاعیر) .

**شوعلە (شُعْلَه)** : گڵپە ، گــڕ ، زمانەی ئاگر .

**شوعلە ڕێژ** : ئــەوەی ڕوونــاكی دەدا .

**شوكور (شُكْر)** : سوپاس كردن ، سوپاس كــردنی یەكێك بەرامبــەر چاكەیێك .

**شووان** : ئەو كەسەیە كە ئاژاڵ دەلەوەڕێنێ .

**شوهوود (شُهود)** : كۆی (شاهید = شاهِد)ە ، بڕوانە (شاهید) .

**شوهوب (شُهُب)** : كۆی (شیهاب = شِهاب)ە . (١) گڵپە ، گڵپــەی ئاگر ، تیشــك . (٢) ئەســتێرە ، ئەستێرەی ڕوونــاكو تیشكدار . (٣) تیشكێكە لە ئاسماندا بە شەوان وەكو تیر دەكشێ لە جێگەیێكەوە بۆ جێگەیێكی تر دەڕوا ، ئەمە هەندێ شــتی ئاســـمانی بچــووكە لـــە ئەستێرەكان جیا دەبێتەوە ، بــڕوانە (شەهاب) .

**شووشە** : شــتێكی ڕوونــە لــە تووانـدنــەوەی هەنـــدێ مــەوادی كیمیاوی لــە ئەنجامی گەرم كردنو خستنیە ناو قاڵب شێوەی تایبەتی وەردەگــرێ ، تەنیــا بــە ئەڵماس دەبڕێو برینداز دەكرێ .

**شۆخ** : دڵ زیندوو ، خۆشحاڵ ، سیما جووان ، جووانو ڕێك .

**شۆر** : (١) ئاشووبو كارەسات ، فەریادو خوم شــێوان ، تێكچوونی شیرازەی ژیانی كۆمەڵ . (٢) سۆر ، هەموو شتێكی خوێ زۆر تێدا بێ ، تامی خوێ .

**شۆراو** : سۆر ، ئـاوی ســۆر ، كینایەتە بۆ فرمێسك .

**شۆرەشەت** : ڕووباری ســۆر ، كینایەتە بۆ فرمێسكی زۆر .

**شۆروغەرغەرە** : ســـەرەمەرگ ، سەردەمی گیان‌دان ، بڕوانە (شۆر) .

**شۆرش** : ســەراو ژێــر كــردنی دەستووری ژیانی كۆمەڵ ، بڕوانە (شۆر) .

**شــڕ** : (١) بــەدی ، خــراپی ، خەراپی ، تێك‌چوون . (٢) شتێك لە كەڵك كەوتبــێ ، شتی كــۆنی بێ سوود .

**شكار** : ڕاو ، نێچیر .

**شكاف** : پارچــە ، ســۆراخ ، دەلاقە .

**شكان** : (١) وورد بوون ، پارچــە پارچە بوون . (٢) كەوتنی سوپا ، دۆڕاندن لە جەنـگدا . (٣) هاتنە خووارەوەی نرخ .

**شكاندن** : (١) وورد كـــردن ، پارچە پارچە كردن . (٢) زاڵ بوون بە سەر سوپادا .

**شکاو** : ئـەو شتەی کـە وورد بووە ، ئـەو شتەی پارچـە پارچە بـووە ، ئـەو سـوپایەی ژێـر کەوتووە .

**شکەست** : بڕوانە (شکاو) .

**شکەستی** : نیسـبەتە بـۆ (شکەست) ، بڕوانە (شکاو) .

**شـکەم** : زگ ، سـك ، ئـەو ئەندامەیە لـە ناوەڕاسـتی لەشـی ئادەمـزاد یا ئـاژاڵ کـە بـۆری‌و ئەندامانی ژیانی تێدا کۆدەبێتەوە .

**شکەن** : خووارو خێچی ، پێچ‌و خەمی زولف ، خوواری .

**شکەنج** : (١) بڕوانـە (شکەن) . (٢) فێل .

**شکەنجە** : ڕەنج‌و ئازار .

**شکۆفە** : (١) خونچـە ، گـوڵی درەختـی میـوەدار کـە هێشـتا نەکراوەتەوە . (٢) ڕشانەوە .

**شکستە** : شـکاو ، ووردبوو ، تێك چوو ، دژی ڕێك‌وپێکی .

**شکڵ** : وێنە ، وەکـو ، شێوە ، ڕوخسـار ، ڕەسم .

**شمشاد** : درەختێکە گەڵای خڕو بچووك‌و ئەستووری هەیە ، هەمیشە سەوزە ، داری سفت‌و سەختە ، بۆ دارتاشی گەلێ نایابە .

**شمشێر** : بڕوانە (شێر) .

**شمشێری ساو** : (١) شـێری تیژی لە هەسان دراو . (٢) شێری باج‌و خەراج ، لە کۆندا پاشـای بەهێز بەزەبری شێرو بە زۆرە باج‌و خـەراجی لـە پاشـای بێ‌هێـز وەردەگرت .

**شیاکە** : (١) پیسایی گاو مانگا . (٢) تەرس ، سەرگین . سەنێر .

## ع = ʼ

**عاتیر (عاطِر)** : بۆن خۆش ، عەتر پژێن ، ئەو کەسەی عەتری خۆش دەوێ .

**عاتیل (عاطِل)** : بێ کـار ، بـێ سوود ، بێ هوودە ، بێ شت .

**عاجیز (عاجِز)** : سـست‌و بـێ تووانا ، نەخۆش کەوتوو .

**عادەت (عادت)**: خوو و ڕەووشت، کارێك کـە ئادەمزاد خووی پێـوە بگرێ .

**عادیل (عادِل)** : دادگـەر ، ئـەو کەسەی کە فەرمانڕەوایی بەیەکسانی بکاو جیاوازی لـە نێوان خەڵکدا نەکا .

**عار** : نەنگ ، شەرم ، عەیب .

**عارەبی** : زمانی عەرەبی .

**عارەق (عَرَق)** : (١) شتێکی شلە لە ژێر پێستی لەش دێتە دەرێ ، تامی سـوێرەو تەرکیبـی کیمیـاوی خـۆی هەیە . (٢) هەمـوو شتێکی شلی کە لە ڕێگەی عەرەق کردنەوەی کوڵاندنی شـتی تر دێتە کایـەوە ،

وەکو عەرەقی مێووژ یا هی شتێکی تر ، خواردنەوەیێکە ئادەمیزاد سەرخۆش دەکا .

**عاری :** ڕووت ، بێ جل و بەرگ .

**عاریز (عارِض) :** (١) پیشاندان ، دەرخستن ، پەیدابوون . (٢) چەهرە ، ڕوو ، ڕوومەت ، ڕوخسار ، گۆنا ، دەموچاو .

**عاریف (عارِف) :** (١) دانا ، زانا ، پسپۆڕ . (٢) خوداناس .

**عاسی (عاصی) :** سەرکێش ، گوناهکار ، ڕێگر ، ئەو کەسەیە کە فەرمان ناهێنێتە جێ .

**عاشق :** دۆستی زۆر نزیك ، دڵدار ، خۆشەویست ، یەکێك یەکێکی تری زۆر خۆش بوێ ، گیرۆدەو گرفتاری کەسێك .

**عاشقان :** کۆی (عاشق)ە ، بڕوانە (عاشق) .

**عاشقی :** نیسبەتە بۆ (عاشق) ، بڕوانە (عاشق) .

**عاشقی‌زار :** (١) ئەو کەسەی عاشقی دەمە ، ئەو کەسەی ئارەزووی ماچی دەم دەکا . (٢) عاشقی بێ توانا ، عاشقی زەعیف ، عاشقی ڕەنجوور ، عاشقێك پیشەی ناڵەو زار بێ .

**عاقیبەت :** دوواییکار ، ئەنجام .

**عاقڵ (عاقل) :** دانا ، هوشیار ، بەهۆش ، هۆشدار .

**عالەم (عالَم) :** (١) جیهان ، گێتی ، دونیا ، خەلق . (٢) فەلەك ، ڕۆژگار .

**عالەمی بالا :** (١) جیهانی سەرەوە ، ئاسمان . (٢) بارەگای خودا ، عالەمی مەلەکووت .

**عالەمگیر :** ئەوەی هەموو جیهان داگیر دەکا ، ئەو کەسەیە کە فەرمانڕەوایی هەموو جیهان دەکا .

**عالی :** بڵند ، بەرز ، گەورە ، مەزن ، ئەرجومەند .

**عالی جا :** جێگە بەرز ، جێگە بڵند ، پایەدار .

**عام :** (١) گشتی ، هەموو کەس ، شتێك هەموو بگرێتەوە. (٢) خەڵك ، کۆمەڵ ، مەردم .

**عامیری (عامِری) :** لەقەبی قەیسی کوڕی ملوحە ، بڕوانە (مەجنوون) .

**عامیل (عامِل) :** (١) زاراوەیێکە لە زانستی‌ی نەحوودا بە کار دەهێنرێ ، ئەوەیە کە دەبێ تیپی دوایی ووشە ئیعرابێکی تایبەتی‌ی ببێ . (٢) کارگەر ، کرێکار ، هەموو کەسێکی بە دەست پیشەسازی‌یێك بکا . (٣) حاکم ، والی ، فەرمانڕەوا ، ئەوەی سەرۆکایەتی خەڵکی دەکا .

**عەبەس (عَبَث) :** کاری بێ سوود ، کاری بێ هوودە ، کاری بێ فائیدە ، کردنی شتێك کە سوودی تێدا نەبێ .

**عەبیر (عبیر) :** شتی بۆن خۆش ،

هەمــوو شتێکی بۆنی خــۆشی لێ بێژێ ، شتی بۆندار ، گوڵاو .

**عەبــووس (عَبــوس)** : زۆر ڕوو گرژ ، زۆر ڕوو ترش ، ئەو کەسەی بزەو پێکەنین لە سەر لێویدا نی‌یە .

**عەبد (عَبْد)** : بەندە ، بەنــدەی خودا ، کۆیلە ، ئەو ئادەمزادەیە کە بە پارە دەکڕێ .

**عەبهەر (عَبْهَر)** : نێــــرگس ، یاسەمین .

**عەتا (عطاء)** : بەخشش ، پاداش ، دیــاری ، هەمــوو شتێکی کــە بە کەسێك ببەخشرێ .

**عەتتار (عطّار)** : عەتــر فرۆش ، ئەو کەسەی داو دەرمانی بۆن خۆش دەفرۆشێ .

**عەتر (عِطر)** : بۆنی خۆش ، ئەو ماددە بۆن خۆشــەیە کە لە گوڵ یا شتێکی تر دروست دەکرێ ، گوڵاو .

**عەتر پۆش** : عەتــراوی ، ئــەو کەسەی عەتری پۆشیوە واتە زۆری لە خۆی داوە .

**عەترفشان** : عەتر پژێــن ، ئــەو شتەیە کە زۆر عەتــراوی‌یەو عەتر بڵاو دەکاتەوە ، هەموو شتێکی بۆن خۆش کە عەتر بڵاو دەکاتەوە .

**عەترناك** : عەتراوی ، سیفەتە بۆ عەتر ، بڕوانە (عەتر) .

**عەجــایب (عجــائب)** : کـــۆی (عەجیبە = عجیبة)یە ، ئەو شتەیە کە سەری ئادەمــزاد سوڕ دەکا ، ئەو شتەیە کــە لە بەر جــووانی‌و نایابی‌و بێ‌هاوتایی ئادەمزاد حەیرانە دەکا .

**عەجەب (عجب)** : سەرسوڕمان ، حەیران .

**عەجەم** : (١) وولاتــی ئێــران . (٢) غەیری عەرەب .

**عەجووز (عَجوز)** : پیرێژن ، ژنی پیر ، ژنی بە ساڵاچوو ،

**عەجووزە** : بڕوانــە (عەجووز) .

**عەجووزەیی دونیا** : جیهانی پیر ، ئەو جیهانەی پیرە وەکو پیرێژن .

**عەدیل (عدیل)** : هاوتا ، وەکــو ئەو ، بەرامبەر .

**عەدوو (عدوّ)** : دوژمن .

**عــــەدل (عَــدْل)** : (١) داد ، دادپەروەر . (٢) وەکو ، بەرامبەر . (٣) ئەو کەسەی لە بەر ڕاست گۆیی شایەدی وەردەگیرێ .

**عەرار (العرار)** : (١) نێــرگسی کێــوی ، نێــرگسی بیابــان . (٢) بەهاراتێکی زەردو وورده بــۆنی یەکجار خۆشە .

**عەرەب (عَرَب)** : (١) نەتــەوەی عەرەب . (٢) کەســێکی بە نەتەوە عەرەب بێ ، باباێکی عەرەب .

**عەرەبی (عربی)** : نیســبەتە بــۆ عەرەب ، (١) نەتــەوەی عەرەب . (٢) زمانی عەرەبی .

**عەرەق (عرق)** : بڕوانە (عارەق) .

**عەربەدە (عربدة)** : بەدخــوویی ، سەرســەری‌یەتی ، دەنگی بــەرز ،

قیرەو قیژە ، نابەجێیی کردن لە ئەنجامی سەرخۆشیدا .

**عەرد :** ئەرز ، زەوی .

**عەرز (عَرض) :** (١) پانایی ، بەرینی ، دژی درێژی . (٢) پەیداو ئاشکرا کردن ، ئەوەی کە دیارە .

**عەرسە (عَرْصە) :** حەوش ، حەوشە ، گۆڕەپانی ناو خانوو ، گۆڕەپانی پێش قەسرو باڵەخانە ، مەیدان .

**عەرش (عَرْش) :** تەخت ، بارەگا، قەسرو باڵەخانە ، ئەو جێیەی شاو سوڵتان لێی دادەنیشن .

**عەرش‌و قورش :** بوون ، کەون ، کائینات ، هەموو ، هەرچی هەیە .

**عەرش‌و کورسی :** بارەگای خودا، مەقامی خودا .

**عەرعەر (عرعر) :** سەروی کێوی درەختێکە لە سەروو دەکا ، بەڵام هەندێ لەو کورتترو بچووکترە ، لە ئەدەبیاتدا لەگەڵ قەدو باڵای دلبەر بەرامبەرو بەراورد دەکرێ .

**عەرفەج (عَرْفَج) :** گیایێکی بیابانی‌یە لە قەراخ ئاو شین دەبێ ، هێندەی درەختی سماقە ، لە پێنج لق زیاتر نابێ ، ڕەنگی مەیلەو سوورەو گەڵای وەکو گەڵای کاژ وایە، گوڵی سپی‌یە . (غەرفەج)و (کەرفەج)یشی پێ دەڵێن .

**عەرقە (العرقة) :** (١) ڕێگەی ناو شاخ . (٢) پارچە گۆشتی لێنراوی سارد .

**عەزاب (عذاب) :** ئێش‌و ئازار ، ڕەنج‌و دەرد، ناسۆری، ئەشکەنجە .

**عەزات (عضات) :** هەموو دارو درەختێکی گەورەی دڕکدار .

**عەزل (عَزل) :** خستنە لاوە ، لە کار دەرکردن ، لە کار خستن ، بێ کار کردن ، جودا کردن .

**عەزم (عَزم) :** مەبەس ، بڕیاردان بۆ کردنی شتێك ، مانەوە لە سەر یەك دۆخ ، کردنی ئەو شتەی بڕیاری لە سەر دەدرێ بە هەر جۆرو نرخێك بێ .

**عەزیز (عزیز) :** (١) عەزیزی میسر ناوی پووتیفار بووە ، وەزیری فیرعەون‌و مێردی زلێخا بووە ، بڕوانە (یووسف) ، (زولەیخا) . (٢) بەڕێز ، شەریف ، پایە بەرز .

**عەزیزان :** کۆی (عەزیز=عزیز)ە، بڕوانە (عەزیز) .

**عەزرا (عذراء) :** (١) ناوی دلبەرو خۆشەویستی (وامیق)ە ، گۆیا کچێکی جووان بووەو هەر بە کچێنی ماوەتەوە ، لە دەوروبەری ئەسکەندەری گەورەدا بووە ، شاعیری ئێرانی عونسوری (٩٦١ز-١٠٣٩ز) بەسەرهاتی دلداری‌ی « وامیق‌و عەزرا » لە داستانێکی چیرۆکی شیعری‌دا دەگێڕێتەوە . (٢) کچ ، کیژ ، ژنی کون نەکراو ، ژنی نەسمراو . (٣) گەوهەری کون

نەکراوو برینندار نەکراو ، گەوهەری دەست لیٚ‌نەدراو .

**عەسا (عصا)** : گۆچان ، ئـــەو دارەیە کە لــە کاتی ڕۆیشتن‌دا بــە دەستەوە دەیگرن‌و یاریدەی ڕۆیشتن دەدا .

**عەسەس (عَسَس)** : کــــۆی (عاس)ە ، (١) پاسـەوانی شـەو ، شەوگەرد ، ئەوەی بە شەو دەگەڕیٚ بۆ مەبەسی پاسەوانی . (٢) دز .

**عەسەل (عَسَل)** : هەنگوین .

**عەسیبە (عسیبة)** : جیٚ‌ی مــوو دەرهاتن لە کلك ، وورده ئیٚسقانی کلك .

**عەسر (عصر)** : (١) کاتی دووای نیوەڕۆ تا ڕۆژ ئاوا . (٢) ڕۆژگار ، سەدە ، دەهر . (٣) گوشینی شتیٚك بۆ مەبەسی ئــەوەی ئاو یا شیرەی دەربهیٚنریٚ .

**عەسکەر (عسکر)** : ١) لەشــکر ، سوپا . (٢) سەرباز .

**عەفوو (عفو)** : لیٚ‌خـۆش‌بوون ، لیٚ بووردن ، بەخشین ، لە گوناهی یەکیٚك خۆش بوون .

**عەفعەف (عفعف)** : عەوعــەو ، حەپەحەپ ، وەڕین ، دەنگی سەگ ، لوورەی سەگ .

**عەفار (عفار)** : ناوي داریٚکە ئاگر دەکاتەوە .

**عەقیق (عقیــق)** : کوارتـــز ، پارچەیێـك لە بــەردی بەللووری‌یە ڕەنگی جیاوازی هەیە ، بەنرخترینی ڕەنگی سوور یــا ئالووبالوویی‌یە ، جۆرێکی تریشــی هەیــە عەقیــقی یەمــانی پیٚ دەڵیٚــن ، زیــاتر بــۆ ئەموستیلە بە کار دەهیٚنریٚ .

**عەقیقی** : نیســبەتە بۆ عەقیق ، ڕەنگی عەقیق ، بڕوانە (عەقیق) .

**عەقیم (عقیم)** : نــەزۆك ، ژنیٚك منداڵی نەبیٚ ، پیاویٚك منداڵی نەبیٚ .

**عەقرەب (عقرب)** : (١) دووپشك . (٢) ناوی بورجی هەشتەمی فەلەکە ، بڕوانە (بورج) .

**عەقل (عقل)** : هۆش ، ئەو هیٚزو هەستەیە لە ئادەمزاددا کە جووانی‌و ناشیرینی ، کاری چاك‌و خراپ لــە یەکتری جودا دەکاتەوە .

**عەکس (عکس)** : (١) ڕەنگدانەوە ، شەوق دانــەوە ، وێنە ، شــکڵ . (٢) پیٚچەوانە کــردن ، سەراوژێر کردن ، وەرگیٚڕان .

**عەکسی عەسەل** : (١) پیٚچەوانەی هەنگوین ، تــاڵ . (٢) پیٚچەوانەی ووشەی عەرەبی (عســل) ووشەی (لسع)ە ، پیٚوەدانی مارو دووپشك‌و هەنگ ... هتد .. واتە هەنگ کە هەنگــوین دەدا ئەمــــە خۆشـــی‌و شـیرینی‌یە ، کــــە پیٚــوەش دەدا ناخۆشــی‌و تاڵی‌یە .

**عەلاقە (علاقە)** : هەموو شتیٚکی پیٚوەندی بە ئادەمزادەوە هەبیٚ وەکو

حاڵو ژنو مێردو منداڵ ، پێوەندی ، دۆستایەتی ، خۆشەویستی ، عیشق .

**عەلامەت (علامت)** : نیشان ، نیشانە ، شتێك بۆ ڕێپیشاندان لە جێیێك دابنرێ .

**عەلاوە (علاوە)** : سەربار ، زیادەکردنی هەموو شتێك ، زۆر کردنی شت .

**عەلایق (علائق)** : کۆی (عەلاقە = علاقە)یە ، بڕوانە (عەلاقە) .

**عەلەم (عَلَم)** : (١) ئاڵا ، بەیداغ ، نیشانە . (٢) ناوی کەس ، ئەو ناوەیە کە ئادەمزاد ناوبانگی پێ دەردەکا ، گەورەو سەرۆکی میللەت .

**عەلەمدار** : خاوەن عەلەم ، ئەو عەلەمەی لە سەر گۆڕی شەخسو پیاو چاك هەڵدەکرێو بە قوماشو پارچە قوماشو تیلمەی سەوزو سپی دەڕازێنرێتەوە .

**عەلەن (علَن)** : ئاشکرا بوون ، ئاشکرا کردن ، دژی نهێنی .

**عەلقەم (علقم)** : گوژاڵك ، هەموو شتێکی تاڵ .

**عـەلی (علی ابـن ابی طـالب)** : عەلیی کوڕی ئەبی تالیب کوڕی عەبدولموتتەلیب لە ساڵی (٦٠٠ز) لە مەککە لەدایك بووە ، ئامۆزاو زاوای محەمەدە ، لە پاش کوشتنی عوسمان لە ساڵی (٦٥٥ز) بوو بە خەلیفەی چووارەم کە خەلیفەی دووایی ڕاشیدینە ، لە دەوری ئەودا کاری موسـولمانان لـە ڕووی فەرمانڕەوایییەوە کزبوو هەر لە بەر ئەوەش بوو لە پاش کوشتنی عەلی شەڕو شۆڕ لە نێوان ئەنـدامانی بنەماڵەی هاشمیو ئومەوی دەستی پێ کـرد ، کارەساتی گەورە لـە کوشتنو بڕینو تاڵان کردن ڕوویدا . لـە ساڵی (٦٦١ز) بـە دەستی عەبدوررەحمانی کـوڕی مولجـەم کوژرا .

**عەم (عم)** : ناوی جزمێکە لە سی جزمەکانی قورئان .

**عەمـار (عَمار)** : (١) جـۆرە ڕەیحانەیێك بوو لە کۆندا بە ناوی سڵاوکردن لە گەورە پیاوان ڕایان دەوەشاند ، ئەو ڕەیحانەیە کە کۆڕی خوواردنـەوەو بـەزمو ڕەزمـی پێ دەڕازێننەوە . (٢) سڵاو ، سەلام . (٣) هەموو سەرپێچێك لە عەمامەو شتی تر .

**عەماری (عَماری)** : (١) کەژاوە . (٢) ئەو تەختـە ڕەوانەیە کە دارە مەیتی لە سەر دادەنێن .

**عەمەل (عَمَل)** : کار ، ئیش .

**عەمیق (عَمیق)** : قووڵ .

**عەمبەر** : بڕوانە (عەنبەر) .

**عەمەدەن (عمدا)** : ئانقـەست ، ئەنجامی کـار لـە ڕووی بڕیـارو ئـارەزووەوە نەوەکـو بـە ڕێـگەی تەبیعیو چارەنووسی خۆیەوە .

**عەن (عن)** : تیپی جەررە لە عەرەبیدا .

**عەنبەر (عَنبَر)** : ماددەیێکی بۆن خۆشە ڕەنگی خۆڵەمێشی‌یە ، لە مەعیدەو لوولەکانی ناوەوەی ماسی‌ی عەنبەردا هەیە ، لە کاتی ڕاو کردنی ئەم ماسی‌یە ماددەکە لە ناو زگی دێننە دەرێ . ماسی‌ی عەنبەر سەری گەورەو ددانی تیژی هەیە ، درێژی‌ی تا دە مەترە دەڕوا .

**عەنبەری بوویا** : بۆنی عەنبەر ، شتێك بۆنی وەکو عەنبەر خۆش بێ .

**عەنعەنە (عنعنە)** : لە ووشەی (عەن = عن)ی عەرەبی‌یەوەیە ، بە مانای « لە » دووبارە کراوەتەوە ، بۆ بیستن : فلان لە فلان لە فلان .. تا دەکاتە سەرچاوە .

**عەنقا (عەنقاء)** : (١) سیمرغ ، باڵندەیێکی ئەفسانەیی‌یە گۆیا یەکجار گەورە بووەو لە کێوی قافدا هێلانەو جێگەی بووە . (٢) مێ‌ی (ئەعنەق = اعنق)ە ، ژنی گەردن درێژ .

**عەنکەبووت ( عنکبوت )** : جاڵجاڵۆکە ، مەگەزێکی بچووکە چووار جووت پێ‌ی هەیە ، لە ژێر زگی‌دا ماددەیێکی شل دێتە دەرێ ، لەمە تاری ڕێکوپێك دروست دەکاو هێلانە دەتەنێ بۆ ئەوەی خۆی لە مێش‌ومەگەزی تر بپارێزێ . ئەمە ڕایەڵی جاڵجاڵۆکەو تەنی جاڵجاڵۆکەشی پێ دەڵێن .

**عەن لەتمیهی کوفقەلکەففە ( عن لطمە کَفٌ الکَفٌ )** : دەست هەڵگرتن لە زیللە لێدانی ، دەست هەڵگرتن لە مست لێدانی .

**عوامیل (عوامل)** : (١) کاری گران ، (٢) هۆ ، سەبەب .

**عەوسەج (عوسج)** : گیایێکی دڕکدارە گوڵی هەمە جۆری هەیە .

**عەهد (عهد)** : (١) پەیمان ، سۆند ، وەفا ، ئەمان . (٢) ڕۆژگار ، سەردەم ، زەمان ، دەورو زەمان .

**عەیار (عیار)** : (١) بەراوورد کردن‌و بەرامبەر کردنی شتێك لەگەڵ شتێکی تر بۆ ئەوەی تەواوی‌و ناتەواوی یا کەمی‌و زۆری دیار بکرێ . (٢) ئەندازەو قەوارەی زێڕ یا زیو لە پارەو سککەو شتی تری کە لە زێڕو زیو دروست دەکرێ ، چونکە لە بەر نەرمی‌ی ئەم دوو مەعدەنە دەبێ مەعدەنی ڕەقی تری تێ بکرێ . ـ **کەم عەیار** : ئەو شتەیە کە زێڕ یا زیوی کەمی تێدایە .

**عەیان (عیان)** : (١) بینین بە چاو ، گومان نەبوون لە بینینی شتێك . (٢) دیار ، ئاشکرا .

**عەیب (عَیب)** : خەوش ، بەدی ، کەمی .

**عەیش (عیش)** : زیندەگانی ، ژیان ، خواردەمەنی ، خۆراك ، بەختیاری ، خۆشی‌و شادمانی .

**عەین (عین)** : (١) چاو ، (٢) سەرچاوە . (٣) کەس ،

شــەخس . (٤) هەڵبژێــرراو و نوێشــکی هەمــوو شــتێك . (٥) سەرۆکی میللەت .

**عەییــار (عیّــار)** : زۆرزان ، گەڕۆك ، تەڕدەست ، زمان لووس ، زرنگ ، چــالاك ، ڕوو قــایم ، بێ پەروا ؛ دەســتەو تاقمێك بــووە لە هەموو دەورو ڕۆژگارێکدا دەوری‌یان لە ژیــانی کۆمەڵایەتی‌و ئابــووری‌ی کۆمەڵدا بووە .

**عیبادەت (عبادت)** : پەرســتن ، بەندەیی کردن ، بەندەیی .

**عیتاب (عِتاب)** : ســەرزەنشت کردن ، گلەیی کردن ، لۆمە کردن .

**عیجز (عِجز)** : بێ توانا بوون ، سست بوون ، بێ هێــز بوون ، پیر بوون .

**عید** : جەژن ، ڕۆژی جەژن ، هەر ڕۆژێکی کە دەبێتە مایەی خۆشی‌و شادی‌ی کۆمەڵە کەسێك .

**عیدی قوربان** : جەژنی قوربان ، جــەژنی گــەورەی موســوڵمانانە دەکەوێتــە ڕۆژی دەیــەمی مانــگی زیلحەججــە بــە پێی ســاڵنامەی هیجری قەمەری . ئەفسانەی ئایینی ئەوە دەگێڕێتــەوە کــە ئیبــراهیم پێغەمبــــەری پێش مووســــای ئیسرائیلی‌یان دەیــەوێ ئیســماعیلی کوڕی کە ناوی دایکی هاجەر بووە بکا بە قوربــانی ، بەڵام خــودا‌وەند لە ئاسمانەوە بەرانێك دەنێرێ‌و لــە باتی ئیسماعیل دەکرێ بە قوربانی ، ئەم جەژنەیە یادێ ئەو ڕووداوەیە ، بەڵام جوولەکەکان ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم کە ناوی دایکی سارە بووە بە زەبیحوڵلا (ذبیح‌الله) دادەنێن .

**عیزز (عزّ)** : سەربڵندی ، پایە بەرزی ، بەنرخی ، بەڕێزی .

**عیززەت (عِزّة)** : سەربڵندبوون، پایە بەرز بوون ، بەنرخ ، بەڕێز .

**عیسمەت (عصمت)** : خۆپاراستن لە گوناه ، تــاوان‌و گوناه نەکردن ، ڕێ گرتن لە خراپە .

**عیســیان (عِصیان)** : ســەر دانەنوواندن ، بە قسە نەکردن ، یاخی بــوون ، فەرمان نەهێنانــە جێ ، غەزرین .

**عیشق (عِشق)** : دڵــــداری ، ســەرگەردانی‌ی خۆشــەویستی ، هەست کردن بە خۆشەویستی .

**عیشقباز** : مێباز ، هەرزە ، چاو لە دەر ، ئەو کەسەیە کە چاو بازی لەگەڵ ژناندا دەکا .

**عیشوە (عِشوە)** : (١) کــاری داپۆشــراو و نادیــار ، شــتی شارراوە . (٢) نــازو کریشــمە ، لووت بەرزی‌و لە خۆبایی لە ڕووی جووانی‌یەوە .

**عیقد (عقد)** : (١) ملوانــــکە ، گەردانــە ، گەردەنلــــغ ، قــەلادە ، قیلادە . (٢) گووارە .

**عیللەت (عِلّت)** : (١) هــــۆ ،

سەبەب . (٢) نەخۆشی ، برینداری، ناساغی .

**عیلم (عِلم)** : زانست ، زانستی ، زانین ، ڕاستی .

**عینان (عِنان)** : جلەو ، جەڵەو ، دەمی ئەسپ ، ئەو پەتەیە کە بە لغاوەوەیەو سووار بە دەستی دەیگرێ .

**عینایەت (عِنایت)** : بایەخدان ، ڕێ پیشاندان ، پاراستن ، دەستگرتنی یەکێك لە پێناوی ئەوەی لە کاریدا سەربکەوێ ، ووردی لە کار کردندا .

**عینەب (عِنَب)** : ترێ .

**عینە (عینة)** : چاکترین و هەڵبژاردەو نویشکی هەموو شتێك .

**عیندەڵلا (عندالله)** : لای خودا ، کن خودا .

**عیهن** : خوریی ڕەنگ کراو ، لۆکەی ڕەنگ کراو .

**عییادەت (عیادت)** : پرسینی نەخۆش ، بە سەر کردنەوەی نەخۆش ، لە نەخۆش پرسین .

**عوبوور (عُبور)** : پەڕینەوە ، پێداهاتن ، ڕۆیشتن بە سەر جێگەیێك یا ڕێگەیێکدا .

**عوتبە** : پێچی گەڵی و شیو لە ناو ناو شاخدا .

**عوجب (عجب)** : خۆبینی ، خۆپەرست ، خۆپەسندی ، لووت بەرزی ، لە خۆبایی بوون .

**عورووج (عُروج)** : چوون بۆ ئاسمان ، ڕۆیشتن بەرەو بڵندی و بەرزی ، بەرەو سەرەوە ڕۆیشتن ، بڕوانە (میعراج) .

**عوریان (عُریان)** : ڕووت ، ڕووت و قووت ، بێ جل و بەرگ .

**عوزار (عذار)** : مووی سەر نێو چەوان ، بن گو ، گۆنە ، ڕوخسار ، ڕوومەت .

**عوزر (عُذر)** : بەهانە ، پاکانە ، حوججەت ، ئەو پاکانەیەیە کە ئادمزاد دەیکا بۆ هەڵگرتنی گلەیی لە سەر خۆی .

**عوسات (عصاة)** : کۆی (عاسی = عاصی)یە ، بڕوانە (عاسی) .

**عوسەیلە** : (١) شیرە ، شیلە . (٢) شەهوەت ، ئاوی پیاو .

**عوسمان (عثمان بن عفّان)** : عوسمان کوڕی عەففانی کوڕی ئەبی عاسی کوڕی ئومەیەیە ، لە ساڵی (٥٧٧ز) لە مەککە لە دایك بووە ، سێیەمین خەلیفەی ڕاشیدینە لە پاش عومەر بووە بە خەلیفە ، لە سەردەمی عوسماندا موسوڵمانەتی لە قەفقاس و خوراسان و کرمان و سەجستان و ئەفەریقا و قیبرس بڵاو بووەوە ، هەر لەو سەردەمەدا بوو قورئان بە تەواوی کۆکرایەوەو دانەیێکی لێ بوو بە بنج ، لە لایەن موسوڵمانانەوە لە ساڵی (٦٥٦ز)دا کوژراوە .

**عوشرەت (عشرت)** : دۆستایەتی ،

تێکەڵ بوون ، ژیان لەگەڵ یەکتری‌دا، ژیانی بەختیاری ، ژیانی خۆش .

**عوششاق (عشّاق)** : کـــۆی (عاشق)ە ، بڕوانە (عاشق) .

**عوقەلا (عقلاء)** : کۆی (عاقڵ)ە ، بڕوانە (عاقڵ) .

**عوقدە (عقدة)** : گرێ .

**عوقدە گوشا** : گرێی کراوە .

**عوقوود (عقود)** : (۱) کۆی (عەقد = عَقد)ە بەستن ، گرێ‌دان ، بەهێز کـردنی عەقدو پەیمـان . (۲) کۆی (عیقد = عِقد)ە ، ملوانکە ، گەردانە ، گـەردەن بەنـــد ، گـــەردەنلغ ، خەناوکە .

**عوکووس (عکوس)** : کۆی (عەکس = عکس)ە ، بڕوانە (عەکس) .

**عولوی (علوی)** : بڵنـــــدی ، بەرزی ، بالآیی ، نیسبەتە بۆ بـالآ بەتایبەتی ڕۆژو مانگ‌و ئەستێرە .

**عولیا (علیا)** : مـێی (ئەعـلا = أعلی)یـە ، بڵنـد تر ، بـەرز تر ، جێگەی هەرە بڵند ، هەموو شتێکی کە بەرز بێ .

**عومـەر (عمـر بن الخطّـاب)** : عومەری کـوڕی خەتتـابی کـوڕی نوفەیلی قورەیشی لە سالی (۵۸٤ز) لەدایك بـووە ، ئەفسـانەی نـاو کوردەواری دەڵێ تا عومەر نەبوو بە موسوڵمان بیلال لـە ناو کوولەکەدا بانگی دەدا . عومەر خەلیفەی دووەمی ڕاشیدینە لە پاش ئەبوو بەکر ، لـە سەردەمی ئەودا ئاینی موسوڵمانی گەیشـتە وولآتی شـام‌و عـیراق‌و قودس‌و میسرو ئێران‌و کوردستان ، لـە سـالی (٦٤٤ز) بـە دەسـتی فەیرووزی ئەبوو لوئلوئەی ئێـرانی کوژراوە .

**عومر (عمْر)** : (۱) ماوەیێـــکی زۆر ، ڕۆژگارێکی درێژ . (۲) تەمەن، ماوەی ژیـانی ئادەمـزاد لە دایـك بوونەوە تا مردن .

**عومرە (العمْرة)** : هێنانە دیی چووار پێویستە لە حەج‌دا ، حەجی بچووکی پێ دەڵێـن ، بریتی‌یە لە : ئیحرام‌و تەواف‌و چوون بۆ سەفاو مەڕوەو موو تاشین .

**عومری خدر (عمر خضر)** : تەمەن درێژی ، نەمری ، بڕوانە (خدر) .

**عومری زایع (عمر ضایع)** : ژیانی بێ سوود ، ئەو ژیانەی کە بێ سوود دەچێتە سەرو کەڵکی بۆ خاوەنی‌و خەڵکی تریش نی‌یە .

**عومر بە بادان** : بڕوانە (عومـری زایع) .

**عوممان** : بڕوانـــە (دەریـــایی عوممان) .

**عونناب ـ عیننـاب (عنّـاب)** : شـیلان ، درەختێـکی دڕکـدارە ، بڵندی تـا شەش مەتـرە دەڕوا ، گەڵای پان‌و بە ددانە ، گوڵی زەردو لقی سوورو بەهێـزە ، بەری خڕو بچووك‌و بەتامە بە شێوە لە گێلاس

دەکـا ، لـە پاییـزدا دەگـا ، بـە تازەیی‌و ووشك کراوی دەخورێ .

**عوبوون (عیون)** : کۆی (عەین = عین)ە ، بڕوانە (عەین) .

**عووج (عوج)** : عووجی عەنەق لە داستان‌و ئەفسـانەی کۆندا نـاوی کابرایێك بووە زۆر درێـژ بووە ، دەڵێن لە لایەن مووسای پێغەمبەری جوولەکان کوژراوە ، هەر کەسـێکی درێژو بـاڵا بەرز بێ لەگـەڵ ئەودا بەرامبەرو بەراوورد دەکرێ .

**عوود (عود)** : (١) عوودی هیندی، درەختێکە لە هیندستاندا هەیە ، ڕەنگی لقـەکانی قاوەیی‌یـە ، بۆنی خۆشـە ، دەیخەنە ناو ئاگـرەوە لە کاتی سـووتاندا بۆنی خـۆش بڵاو دەکاتەوە . ــ عوودی قوماری یـا کوماری بە ناوی شاری کومارەوەیە لـە هیندسـتان . (٢) ئالەتێـکی مۆسیقایە . (٣) لق ، چڵ ، دار .

**عوور (عور)** : (١) کۆی (ئەعوەر = اعور)ە ، ڕوانـــە (ئەعـوەر) . (٢) ڕووت ، ڕووت‌و قـــووت ، ڕووت‌و ڕەجاڵ .

## X̄ = غ

**غـــار** : (١) ئەشـــکەوت . (٢) ڕاکردن ، هەڵاتـن ، ڕاکـردنی ووڵاخ . (٣) درەختێکی گەورەیـە گەڵای درشت‌و درێژە ، تامی تاڵەو بەڵام بۆنی خۆشـە ، گوڵی ووردو سپی‌یە ، بەری هێنـدەی فندقێکە تۆکڵێکی ڕەشی ناسکی هەیە ، دەڵێن تا هەزار سـاڵ دەژی .

**غارات** : کۆی (غارەت)ە ، بڕوانە (غارەت) .

**غارەت (غارت)** : تاڵان کـردن ، بە تاڵان چـوون ، بەسـەردادان ، تاراج کردن ، یەغما .

**غارەتگەر** : تاڵانکەر ، یەغماکەر ، ئەو کەسەی تاڵان دەکا .

**غاری** : نیسبەتە بـۆ (غـار)و (غارەت) ، بڕوانە (غار) ، (غارەت) .

**غافیل (غافل)** : بـێ ئـاگا ، کەودەن ، ناهوشیار ، لە کۆی گادا نووسنوو ، ئەوەی زوو شتی لە بیر دەچێتەوەو ئاگای لە خۆی نی‌یە .

**غالیب (غالب)**: (١) سەرکەوتوو . (٢) پیرۆز . (٣) زۆر بوون ، زیاد کردن .

**غالیە (غالیە)** : دەرمانێکی گەلێ بۆن خۆشە لە پزیشکی‌ی کۆندا بە کار دەهێنـرا دەڵێـن لە موشـك‌و عەنبـەرو حەسـەن لەبـە (جـۆرە سەمغێکە بۆنی زۆر خۆشە ، ڕەنگی سووری مەیلەو ڕەشـە) دروسـت دەکرا ، بۆ بەهێز کردنی مێشـك‌و دڵ‌و سەرێشە بە کار دەهێنرا .

**غایب (غائب)** : دوور لـە پێش چاو ، لە جێگە نەبـوون ، ناپەیدا ، ئەو کەسـەیە کە ئامادە نی‌یـەو لە جێ‌یێکی ترە .

**غەبرا (غبراء)** : مێ ی (ئەغبەر = اغبر)ە ، (١) ڕەنگی زەوی ، ڕەنگی خۆڵ . (٢) خاك ، زەوی ، خۆڵ ، ئەرز .

**غەرامەت (غرامت)** : (١) ئەوەیە کە دانەوەی بە ماڵ پێویست بێ ، یەکێك ئەگەر زیان لە یەکێکی تر بگەیێنێ پێویستە هێندەی زیانەکە ماڵی بداتەوە . (٢) زیان ، دۆڕاندن، ڕەنج بە خەسار .

**غەرەق (غَرَق)** : کەوتنە ناو ئاو ، کەوتنە ژێر ئاو ، خنکان لە ناو ئاودا .

**غەریب (غَریب)** : (١) دوور ، دوور بووەوە ، دوور لە نیشتمان ، بێگانە ، ئاوارە . (٢) هەموو شتێکی سەیرو بێوێنە ، هەموو قسەیێکی کە مانای ئاشکرا نەبێو دوور بێ لە تێگەیشتن .

**غەریق (غَریق)** : خنکاو ، هەموو شتێك یا کەسێکی بکەوێتە ژێر ئاوەوە .

**غەررا (غـرّاء)** : مێ ی (ئەغەر = اغر)ە ، جووان ، باش ، ئەوەی کاری چاك دەکا ، نەژاد پاك ، گەورەو سەرۆکی میللەت .

**غەرغەرە (غَرغَرە)** : (١) گەڕانی ئاو لە ناو دەمو گەروودا . (٢) ترازانی شیرازەی کۆمەڵو پەیدا بوونی ئاژاوە ، هەراو هووریاو تێکچوونی دەستووری ژیانی کۆمەلایەتی . (٣) سەرەمەرگ .

**غەرق (غَرق)** : بڕوانە (غەرق) .

**غەرقە** : بڕوانە (غەریق) .

**غەزال** : مامز ، ئاسك .

**غەزالە** : (١) مێ ی (غەزال)ە ، بڕوانە (غەزال) . (٢) ڕۆژ ، خۆر .

**غەزالە چاو** : چاوی وەك مامز ، گەورەو ڕەشو جووانە .

**غەزالەی بەڕ** : مامزە کێوی ، مامزی کێوی .

**غەزەل (غَزَل)** : (١) جۆرە شیعرێکە لە ڕووی ڕوخسارەوە هەموو دێڕەکانی لە سەر یەك کێشی عەرووزیو یەك قافیەیە ، ژمارەی دێڕەکانی لە حەوت کەمترو لە پازدە زیاتر نییە ، بەڵام لە ڕووی ناوەرۆکەوە خەریکی دڵداریو عیشقبازییە لەگەڵ ژناندا . (٢) دەست تێکەڵ کردنو بە خۆشی ڕابوواردن لەگەڵ ژناندا ، مێبازی کردن ، هەموو قسەیێکی جووانی ئەدەبی کە بۆ وەسفو دڵداری لەگەڵ ژناندا دادەنرێ . (٣) قوماشێکی نەرمی ئاوریشمییە .

**غەزەنفەر (غَضَنْفَر)** : شێری دڕندە ، شێری نەڕ ، هەموو کەسێکی بە لەشو باڵا گەورەو درێژو بەخوو و ڕەووشت درشت بێ .

**غەزز (غزّ)** : تەڵەوایی، چەوری.

**غەڵەت (غَلَط)** : هەڵە ، سەهوو ، نەزانینی ڕاستی لە هەموو شتێکدا ،

هەڵـە كـردن لـە قسـە یـا لـە نووسیندا .

**غەڵەتان :** گلـۆر بوونـەوە ، بزووتنەوە لە سەر ڕووی زەوی بە لا تەنیشت ، بزووتنەوەی لەش ڕوو بە ڕووی لەشێکی تر .

**غەڵتان :** بڕوانە (غەڵەتان) .

**غەم :** خەم ، پەژارە ، ماتـەم ، دلگیری .

**غەمخـوار :** (١) خەمخـۆر ، خەمگین ، ئـەو كەسـەیە كـە خەم دەخـوا . (٢) كەسی میهرەبان‌و دلسـۆز بۆ یەكێـكی تر ، ئـەوەی خەمگـین دەبێ بە خەمی هـاوڕێ‌و دۆستی .

**غەمزە (غَمْزە) :** چاوهەڵتەكاندن، قسەكردن بە چاوو برۆ ، ناز .

**غەمگین :** خەمنـاك ، خەمبار ، خەمخۆر ، ئـەو كەسـەی خـەمی هەیە .

**غەنی (غنیّ) :** دەوڵەمەند ، خاوەن ماڵ‌و سـامان ، ماڵـدار ، دەست ڕۆیشتوو .

**غەوس (غوث) :** یاریـدەدان ، هاریكاری كردن ، دەست گرتن ، بە فریا گەیشتن .

**غەوغا (غوغاء) :** (١) خەڵكێـكی زۆری تێـك ترنجـاو ، خەڵـكی هەرزەی ئاژاوەچـی . (٢) هـەراو هووریاو دەنـگ‌و سـەدا لە كـاتی شورش یا جەنگدا كە خەڵكی بە گژ یەكدا دەچن .

**غەوواس (غوّاص) :** ئاوبـاز ، ئەو كەسەیە كە خـۆی نوقوم دەكاو دەچێتە ژێر ئاو بە مەبەسی ئەوەی سەدەف‌و مەرجان‌و شتی تری بـە نرخ دەربهێنێ .

**غەیب (غَیْب) :** نادیار ، نهێنی ، پەنهان ، پشت پەردە .

**غەیبەت (غیبت) :** (١) نادیـار بوون ، پەنهان بوون ، شتێك ببێ بە نهێنـی ، لە چـاو وون بـوون . (٢) پاشـملە قسـە كـردن ، لـە پاشملەی یەكێكدا قسەی خراپی پێ بووترێ .

**غەیوور (غیّور) :** بە غـیرەت ، خاوەن ناموس ، بە حەیا .

**غەیر (غیر) :** (١) تەنیا ، جـگە لە . (٢) بێگانە .

**غەیری :** بڕوانە (غەیر) .

**غیبتە ( غِبطـة ) :** شـادمانی ، خۆشحاڵی ، ئەو كەسەیە كە حەز بە بەختیـاریی خەڵـكی تر دەكـاو ئارەزووی بەدبەختییان ناكا .

**غیرەت (غیرت) :** (١) نامـووس پەرستی . (٢) حەسـوودی ، چاو هەڵنەهاتن ، ئەو كەسەی كە تووشی نارەحەتی دەبێ لە ئەنجامی ئـەوەی یەكێكی تر خۆی لە خۆشەویستەكەی نزیك بكاتەوە .

**غیلمان (غِلمان) :** كۆی (غولام =

غـلام)ە . (۱) بڕوانـە (غـولام) . (۲) کوڕانی جووانی بەهەشت .

**غینا (غِناء) :** (۱) گۆرانی ، ئاوازی خۆش ، سروود . (۲) دەوڵەمەندی ، خاوەنی ماڵو سامانو دەوڵەت .

**غوبار (غُبار) :** تۆز ، تۆزو گەرد ، خۆڵی نەرمو وورد .

**غوروور (غُرور) :** (۱) فریودان ، گوم کـردن ، نائومێد کـردن ، خۆ بەستنەوە بە شـتێکی بێ سوود . (۲) لـووت بـەرزی ، خۆبینـی ، خۆپەرستی ، خۆپەسندی .

**غوربـەت (غُـربت) :** دووری ، دووری لە نیشتمان ، دووری لـە شـارو ماڵو مەڵبەند .

**غوربەت کەش :** غوربەت کێش ، ئەوەی تووشی غوربەت دەبێ ، بڕوانە (غەریب) .

**غووره (غُرّه) :** (۱) خاڵی سپی‌ی سـەر نێوچـەوانی ئـەسپ . (۲) سـەرەتای هەمـوو شـتێك . (۳) دەمو چاو . (٤) ڕووی مانگ . (٥) گـەورەی قـەومو هـۆز . (٦) چـاکی‌ی هەموو شـتێك . (۷) هەمووشتێکی کە لەڕووناکی‌دا دیاربێ کـە لـە ڕوونـاکی‌دا دیـار بـێ . (۸) باڵندەیێـکی ئاوی‌یە پێ‌یـەکانی درێژە .

**غوفران (غُفران) :** لـە گونـاه خۆش بـوون ، لە تـاوان خـۆش بـوون ، گـەردەن ئـازاد کـردن ، بەخشین .

**غـولام (غُـلام) :** (۱) کـوڕ ، کوڕێکی هێشتا بلـووغی نەبووبێ ، مێرد منداڵ . (۲) بەندە ، کۆیلـە ، خزمەتکار ، پێش خزمەت .

**غونچە :** گوڵی نەپشکووتوو ، ئەو گوڵـەی هێشـتا نەپشـکووتووەو نەکراوەتەوە .

**غونچە دەم :** دەمی وەك غونچە ، دەمـی بچـووکی نەکـراوەی وەك غونچە .

**غونچە گوشا :** غونچەی کراوە ، گوڵ .

**غونچەیی نەشکوفتە :** (۱) غونچەی نەپشکووتوو ، غونچەی نەکـراوە . (۲) ئەنـدامی مێ‌ینـەی کـچ ، ئەندامی مێ‌ینەی کون نەکراو .

## ف = F

**فائیدە : (فائیدە) :** سـوود ، بەهرە ، قازانجێك ئادەمزاد لە ماڵ یا زانستی‌دا دەستی بکەوێ .

**فاتیحە (فاتحە) :** (۱) سەرەتا ، پێشـەکی ، سـەرەتای هەموو شتێك . (۲) یەکەمین سـوورەتی قـورئان ، سوورەتی « الحمد » .

**فاحیشە (فاحِشە) :** (۱) مـێ‌ی

(فــاحیش = فــاحش)ە ، کــاری یەکجار بەد ، گوناهێك کە خراپی لە هەمــوو گوناهــــان زیاتــر بــێ . (٢) قەحبە ، ژنی داوێن پیس .

**فاخیر (فاخر)** : بەنرخ ، بەناز ، هەموو شتێکی چاکو بەنرخو گران بێو لە ناو هەموو شتەکانی تــری وەك خۆی دیار بێ .

**فاریغ (فارغ)** : ئاســـــوودە ، ئازاد ، ئارام ، بێکار ، بەتاڵ ، بێ ناووك ، بۆش ، دەست هەڵگرتن لە کارێــك ، کەسێك دەســتی لە کار بکێشێتەوەو خۆی ئازاد بکا .

**فاریق (فارق)** : جودا کردنەوە ، ئەوەی لە ڕاستیو ناڕاستی جــودا بکرێتەوە ، جیاوازی لە نێوان دوو شت .

**فارس** : (١) نەتــەوەی فارس ، عەجــەم . (٢) ئــەسپ ســووار ، سوواری ئەسپ ، کــەسی ئــازاو دلێرو چوستو چالاك ، جەنگاوەر .

**فارسی** : (١) زمــانی فارسی . (٢) نیسبەتە بۆ نەتەوەی فارس .

**فاسیله (فاصلة)** : مێی (فاسیل = فاصــل)ە ، ماوەی نێــوان دوو شت ، ئەوەی دەکەوێتە نێــوان دوو شتەوە .

**فاق** : (١) پارچەی سەری قەڵەم. (٢) سەری تیر . (٣) تەڵە . داوی ڕاوکــردنی باڵنــــدەی بچــــووكو زیندەوەری ناو ماڵ . (٤) قەڵیش .

**فاقه** : هەژاری ، تەنگ دەستی ، دەست کورتی .

**فاقی فاق** : قەڵیشــی فــاق ، قەڵیشی تەڵەی دار .

**فانی** : (١) نەبوون ، لە ناوچوو ، نابوود . (٢) پــیری کەوتوو ، ئــەو پیرەیە کە لە قەراخ گۆڕدایە .

**فانۆس** : چرایێکە لــە مەعدەنو شــووشە یا کاغــەز یا شــتی تر دروست دەکرێ .

**فایز (فایض)** : (١) ئــاوی زۆری هەستاو ، ئاوێك بــگاتە سەر لێو . (٢) سەرکەوتوو ، پیرۆز .

**فایق ( فائــق )** : زۆر ، زیــــاد ، هەڵبژێرراو ، هەڵبژێرراو و چاکی هەموو شتێك .

**فەتاوا (فتاوی)** : کۆی (فەتوا = فتوی)یە ، بڕیاری قازی لە بابەت شتێك یا ڕووداوێکی شەرعییەوە .

**فەتەرات (فترات)** : فەتــارەت ، زەعیفو سست بــوون ، لــە ناو چوون .

**فەتاح (فتاح)** : ئــەوەی یەکجار کاری خەڵك ئاسان دەکا ، ئەوەی خەڵــك ســەر دەخا ، یەکێکــە لە ناوەکانی خودا .

**فەتح (فتح)** : کردنــەوە ، ڕزگار کردن .

**فەجج (فج)** : دۆڵ ، گــەلی ، دەربەنــد ، دەرە ، ڕێی فــراوانی نێوان دوو شاخ .

**فەجر : (فجر)** : بەیان ، سپیدەی بەیانی .

**فەخر (فخر)** : شانازی ، نازکردن، لووت بەرز کردن ، شانازی کردن بە ڕابردوو و خوو و ڕەووشتو ماڵو دەوڵەتو سامانو کەسو کار .

**فەراغ (فَراغ)** : ئاسودە بوون ، ئازادبوون ، ئارام گرتن .

**فەرەح (فَرح)** : شادی ، شادمانی ، خۆشی .

**فەرەق (فَرَق)** : (١) ترس . (٢) بلاو بوونەوە ، جودا کردنەوە . (٣) بەیانی ، سپیدەی بەیانی . (٤) کەلێنی فراوانی چووار ددانەکانی پێشەوە . (٥) ڕێگە لە ناو شاخدا .

**فەرد (فَرد)** : (١) تاك ، یەك ، تەنیا ، بێوێنە ، بێهاوتا . (٢) لە زاراوەی ئەدەبدا بریتییە لە دێرە شیعرێك کە لە دوو نیوە دێر شیعر پێك هاتبێو بە زۆریش قافیەی هەردوو نیوە دێر شیعر یەك دەبێ .

**فەردا (فردا)** : (١) سبەینێ ، ڕۆژی پاش ئەمڕۆ ، ئەو ڕۆژەی کە لە پاش ئەمڕۆدا دێ . (٢) ڕۆژ ، ڕووناکی .

**فەرزەن (فرضاً)** : (١) کاری پێویست ، ئەوەی خودا دایناوە بۆ ئادەمزادو دەبێ بیکا ، ئەوەی کە ئادەمزاد لە خۆیەوە دەیکا . (٢) بەڵگە ، گومان .

**فەرش (فرش)** : ڕایەخ، مافوور، هەموو شتێکی کە ئادەمزاد لە سەری بنوێ .

**فەرشی زەمین** : گیاو گوڵی ئاڵو واڵای بەهار کە وەکو مافوورێکی تەبیعی وایە .

**فەرع (فَرع)** : (١) ئەو شتەیە کە لە بنیادو نەژادی شتێك جودا دەبێتەوە . (٢) لقی درەخت .

**فەرق (فرق)** : (١) جیاوازی ، جودایی ، جودا کردن ، تەفاووت . (٢) تەوقی سەر ، ئەو خەتەیە لە سەردا کە لە نێوان مووداییە ، بڵندترین جێگە لەلەشی ئادەمزادد.

**فەرمانبەر (فَرمانبر)** : ئەو کەسەیە کە فەرمانی لە خۆی گەورە تر جێبەجێ دەکا یا فەرمانی کەسێك بە کەسێکی تر دەگەیێنێ .

**فەرمـوودە** : ووتراو ، ئەو قسەیەی کە کەسێکی گەورە دەیکا .

**فەرموون** : بڕوانە (فەرموودە) .

**فەرهاد** : (١) ناوی بەردتاشێك بووە لە سەردەمی خوسرەوی پەرویزدا عاشقی شیرین بووە ، بڕوانە (شیرین) . (٢) ناوی چەند شاهنشاهێکی ئەشکانییەکان بووە . (٣) هاوارو هانا بردن ، داوێن گرتن ، داوای یارمەتی کردن .

**فەڕ** : (١) جووانی ، بەرزیو شکۆیی ، ڕەونەق ، بریقە . (٢) کەڵك ، سوود .

**فەزا (فضاء)** : (١) گۆڕەپــــان ، زەویی قــراوان ، زەویی پــانو بەریــن . (٢) حەوشــەی قەســرو باڵەخانەو خانــوو . (٣) بۆشــایی ئاسمان .

**فەزل (فضل)** : (١) بەخشــین ، چاکە کردن ، یاریدەدان . (٢) ماوەی هەموو شتێك ، پاشماوەی شت . (٣) تەواو ، دژی کەم .

**فەساحەت (فصاحت)** : زمــــانی تیژ ، زمانی گەرم ، ڕەوانبێژی ، لە زانستیی بەدیعدا مانای ئەوەیە کە قسە لە هەمــوو کەمو کووڕییێك دوور بێ لە ڕووی ســفتی ووشەو بەهێزی تەعبیرەوە .

**فەساد (فساد)** : (١) زاراوەییێکی زانستی مەنتیقە بە مانای «نەبوون» بەرامبەرو دژی «بوون = کَوْن»ە . (٢) بێ کەڵکی ، گەمەو گاڵتەی بێ سوود ، شتی نادروست .

**فەسڵ (فصل)** : (١) جـــــودا کردنەوە ، پارچــە کردن ، بڕیــن . (٢) قەدەغــە کردن لە نێــوان دوو شت ، بەند . (٣) ئەو جێیەی دوو ئێسقان تێیــدا دەگەنە یەکتــری . (٤) بەشێك یا پارچەییێکی سەربەخۆ لە کتێب . (٥) کــەژ ، یەکێك لــە چووار بەشەکەی ســاڵ کە بەهارو هاوینو پاییزو زستانە .

**فەقیر (فقیر)** : هەژار ، دەست کــورت ، موحتــاج ، دەروێش ، قەڵەندەر .

**فــەقێ** : ئــەو کەســــەیە کــە قوتابیێــکی درێــژی خوێنــدن لــە کوردستاندا دەباتە سەر لە پــاش قوتابی‌یەتی‌یەوە دەســت پێ دەکــا واتــە لــە حوجــرەوە تا ئیجــازە وەرگرتنی مەلایی .

**فەقر (فقر)** : هەژاری ، دەست کورتی ، موحتــاجی ، دەروێشی ، قەڵەندەری .

**فەقرو فاقە** : هەژاریو دەست کورتی ، بڕوانە (فەقر) ، (فاقە) .

**فەلــەك (فلــك)** : چــــەرخ ، گەردوون ، مەداری ئەستێرەکان ، ئاسمان .

**فەلەکولئەتلەس ( فلك الاطلس )** : ئاسمانی شین .

**فەن (فن)** : هونەر ، سەنعەت .

**فەنا (فناء)** : نەبــوون ، نابــوود بوون ، نەبوونی ، نابــوودی ، دژی بوون .

**فەنا فیننوور ( فنــا في النــور )** : نەمان لە نووری خودادا ، تووانەوە لە ناو نووری خــودادا ، زاراوەییێکە بــە زۆری لە ســۆفیزمدا بــە کار دەهێنرێ .

**فەنەر** : (١) چــرادان ، هەمــوو قوتوویێــکی لــە کاغەز یــا دار یا مەعدەن دروست بکرێو چراو مۆمی لە ناو دابنرێ . (٢) زەمبەرەك .

**فەنەن (فنن)** : لقی ڕێكو ڕاستی درەخت .

**فەوت (فَوْت)** : نەمان ، نەبوون ، مردن .

**فەوتان** : بڕوانە (فەوت) .

**فەور (فَوْر)** : (١) هەڵقوڵان ، سەرچاوەیێك کە ئاوی زۆری لێ دەربچێ . (٢) کوڵانی ئاو . (٣) زۆر زوو ، دژی درەنگ .

**فەوران** : بڕوانە (فەور) .

**فەوقانی (فوقانی)** : لای سەرەوە ، بالآیی ، لای بەرزی ، دژی لای ژێرەوە ، وەکو زاراوەیێك لە سۆفیزمیش بە کار دەهێنرێ .

**فەهیم (فهیم)** : بەفام ، بەهۆش ، دانا ، ژیر .

**فەهد (فهد)** : یووز ، پڵنگ .

**فەیز (فیض)** : ئاوی زۆر ، لافاو ؛ شتی زۆر ، دیاریی زۆر .

**فەیلەقووس** : فیلیپ یا فیلیپۆسی دووەمی مەکدۆنی (٣٨٢–٣٣٦ پێش زایین) باوکی ئەسکەندەری گەورەیە، کەسێکی بە تواناو پڕ سامان بووە ، هەموو نەتەوەی گریکی کۆنی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە .

**فەییاز (فیّاض)** : (١) ئاودار ، سەرچاوەی پڕ لە ئاو . (٢) جووانمەرد ، کەسی چاو تێرو سەخی تەبیعەت .

**فیترەت (فِطرت)** : سروشت ، تەبیعەت ، خوو و ڕەووشتی تەبیعی ئادەمزاد .

**فیتنە (فِتنە)** : بەڵا ، کارەسات ، ئاژاوە ، ئاشووب ، شەڕ ، سەختی ، ڕیسوایی ، سەرگەردانی .

**فیدا (فِداء)** : قوربانی ، شتێك لە پێناوی شتێك بدرێ ، دانی سەرو گیان لە باتی شتێکی تر .

**فیداکار** : ئەوەی خۆی دەکا بە قوربانی ، ئەوەی گیان لە ڕێی بیرو باوەڕی دەدا ؛ پێشمەرگە .

**فیراغ (فِراغ)** : (١) فیراق ، قاپو قاجاغی گەورە . (٢) بای سارد ، بای فێنکی هاوینان .

**فیراق (فِراق)** : جودا بوونەوە لە یەکتری ، جودایی ، دووری . ـ **شەوی فیراق** : شەوی لە یەکتری جیا بوونەوە ، ئەو شەوەی دڵدارو دلبەر پێکەوە نەبن .

**فیردەوس** : بەهەشت ، باخ ، بێستان .

**فیرعەون** : (١) فیرعەونی میسر (سەدەی سێزدەمی پێش زایین) ، بە پێی ئەفسانەی ئایینی ئەم شاهنشاهە زوڵم و زۆرییێکی بێ ئەندازەی دەکرد لە دژی بەنی ئیسرائیل بە هۆی هامانی وەزیرییەوە ، بڕوانە (مووسا) . (٢) زۆردار ، سەرکێش ، لووت بەرز .

**فیغان (فغان)** : ئاه و ناڵە ، بانگ ، فەریاد ، شۆڕو غەوغا ، شیوەن ، شین و شەپۆڕ .

**فیرقه (فِرقه)** : پۆل ، تیپ ، دەستەیێك لە خەڵك .

**فیرقەت (فِرقت)** : دووری ، جودایی .

**فیکر (فِکر)** : بیر ، ئەندێشە .

**فیکرەت (فِکرت)** : بڕوانە (فیکر) .

**فینجان (فِنجان)** : قاپێکی بچووکە لە چینی یا بەللوور دروست دەکرێ ، بۆ خواردنەوەی چای یا قاوە بە کار دەهێنرێ .

**فێس** : جۆرە کڵاوێکە ڕەنگی سووری تۆخە .

**فێسی سپی** : کڵاوی سپیی هەژارانە .

**فوتوور (فتور)** : سست بوون ، سارد بوونەوە ، لە جۆش‌و خرۆش کەوتن .

**فوتووح (فتوح)** : کۆی (فەتح = فتح)ە ، بڕوانە (فەتح) .

**فوتووحات (فتوحات)** : کۆی ( فەتح = فتح )ە ، بڕوانە ( فتح ) .

**فورات (الفرات)** : ناوی ڕووبارێکە لە شاخەکانی کوردستانی تورکیای ئێستا هەڵدەقوڵێ، لەوێ شاخەکانی تۆرووس دەبڕێ ، ئنجا دێتە خاکی سووریەو عیراق ، لە خوارووی عیراقدا لە قورنە لەگەڵ ڕووباری دیجلە تێکەڵ دەبێ .

**فورووغ (فروغ)** : ڕۆشنی ، شەوق ، ڕووناکیی ڕۆژ یا ئاگر .

**فوسوول (فصول)** : کۆی (فەسل = فصل)ە ، بڕوانە (فەسل) .

**فولك (فلك)** : کەشتی .

**فویووز (فیوض)** : کۆی (فەیز = فیض)ە ، بڕوانە (فەیز) .

**فتادە** : زەبوون ، کەساس ، پیری کەوتوو ، نزیك بووەوە لە زەوی ، ئەو کوورەی لوتی گەیشتۆتە زەوی ، بڕوانە (ئوفتادە) .

**فریب** : فێڵ ، مەکر ، حیلە ، هەڵخەڵەتاندن ، فریو .

**فرۆشتن** : دانی شتێك بە یەکێکی تر بەرامبەر پارە یا شتێك .

**فرزەند (فرزند)** : منداڵ ، کوڕ یا کچی پیاو و ژنێك کە لەم‌و لەو بێ .

**فرزەندی فەیلەقووس** : بڕوانە (ئەسکەندەر) .

**فرسەت (فرصت)** : نۆبەت ، مەجال ، ماوەی کار ، ماوەی بەجێ بۆ تەواو کردنی کار .

**فرمێسك** : دلۆپ ، دلۆپی ئاو ، ئەشك ، ئەسرین ، ئەو ئاوەیە کە لە ئەنجامی گریان لە چاو دێتە خوارێ .

**فڕین** : باڵ گرتن ، چوون بۆ ئاسمان .

**فڕێدان** : وازهێنان لە شت ، دوور خستنەوەی شت‌و بە کار نەهێنانی .

**فلس** : (١) پاره ، پوول . (٢) پوولەك . (٣) پوولی سەر پێستی ماسی .

## ق = Q

**قائیم (قائم)** : هەستاو ، وەستاو ، ڕاوەستاو ، لە سەر پێ وەستاو .
**قائیموللەیل (قائم اللیل)** : ئەوەی زوو لە خەو هەڵدەستێ ، ئەوەی هێشتا شەوەو لە خەو هەڵدەستێ.

**قابە قەوسەین (قاب قوسین)** : کینایەتە بۆ نزیکی .

**قابیل (قابل)** : شایان ، ئەوەی ئامادەیە قوبووڵی شتێك یا کارێك بکا .

**قاتیع (قاطع)** : (١) ئەوەی شت دەبڕێ ، ئەوەی شت پارچەو بریندار دەکا . (٢) ڕێگە بڕ . (٣) ئەوەی لە ڕێگەدا دەڕوا .

**قاروون** : ناوی باباییکی بەنی ئیسرائیلە ، لە سەردەمی مووسادا ژیاوە ، دەڵێن چل خانووی پڕ لە زێڕو جەواهیری هەبوو ، مووسا نەفرەتی لێ کردو لەعنەتی لێدا ، لە ئەنجامی ئەمەدا خۆی‌و خەزینەکانی لە ناخی زەوی چوونە خووارەوە ، لە ناو کوردەواری‌دا « گەنجی قاروون» ڕەمزی سامانی زۆرو دەوڵەمەندی‌یە .

**قاز** : باڵندەییکی سپی‌و گەورەیە لە بنەماڵەی مراوی‌یە .

**قازو قولینگ ـ قازو قورینگ** : جۆرە باڵندەییکە بە کۆمەڵ دەفڕن‌و لە ئاسمان زۆر بەرز دەبنەوە .

**قاسی** : دڵڕەق ، دڵسەخت ، بێبەزەیی ، بێڕەحم .

**قاسی (قاصی)** : دوور ، دوور بوو ، دوور بووەوە ، دژی دانی .

**قاعیده (قاعِدة)** : مێ‌ی (قاعید)ە، بنج ، بناوان ، بناغە ، بنیاد ، پایە ، نەژاد ، قانوون ، دەستوور .

**قاف** : ناوی شاخێکی ئەفسانەیی‌یە ، ئەم ناوە بۆ شاخەکانی قەفقاسیش بە کار هێنراوە . ـ **قافی زەوی** : لووتکەی زەوی ، ئەرز .

**قافلە** : کاروان ، کۆمەڵێك خەڵك کە بە یەکەوە سەفەر بکەن .

**قافلە سالار** : سەرقافلە ، سەرۆکی کاروان .

**قالب** : شتێکە مەعدەنی تواوە یا هەر شتێکی تری تێبکرێ بۆ ئەوەی وێنەی ئەو وەربگرێ ؛ پارچە دارێکە تراشراوەو خراوەتە شێوەی پێی ئادەمزاد بۆ ئەندازە گرتنی پێڵاو ؛ شتی لە قالب‌دراو بە مانای شتی ڕێك‌وپێك‌و سفت هاتووە .

**قامەت (قامت)** : (١) بالآ ، قەد ، ئەندام ، بڵندی لەشی ئادەمزاد . (٢) تەکبیرو شەهادەو هەموو ئەو ووشەو تەعبیرانەی کە لە پاش بانگی نوێژکردن‌و سەرەتای نوێژدا دەووترێن .

**قامەتی عووج** : باڵای درێژی وەك عووج ، بڕوانە (عووج) .

**قامەت شەجەر** : باڵای وەك درەخت .

**قانوون** : (١) دەستوور . (٢) نەژادو قەوارەی شت . (٣) ئالەتێکی مۆسیقایە لە سەنتوور دەکا . (٤) ناوی کتێبێکە لە نووسراوەکانی ئەبوو عەلی‌ی سینایە.

**قانگ** : ئازاردان بە دووکەڵ ، دووکەڵ لە باڵ شت کردن ، بۆ تیماری گو ئێشە دووکەڵی قانگ بە کار دەهێنرێ ، بڕوانە (دووکەڵی قانگ) .

**قاو** : ئاگردان ، ئاتەشخانە ، ئاتوون ، زارکی بورکان .

**قایم** : چەسپیو ، بەهێز، بەتین ، هەموو شتێکی کە جێگەی خۆی گرتبێ .

**قەبا (قباء)** : جۆرە جلێکی پیاوانەیە .

**قەبووڵ (قبول)** : وەرگرتنی شتێك ، ڕازی بوون ، قسەی کەسێك بە ڕاستی‌و دروستی وەربگیرێ .

**قەبر (قبر)** : گۆڕ ، ئەو جێیەی مردووی لێ دەنێژرێ .

**قەت (قط)** : هیچ ، بە هیچ جۆری .

**قەتاد** : دارێکی سەخت‌و ڕەقە ، دڕکی تیژی وەك دەرزی‌ی هەیە .

**قەتار (قطار)** : چەند حەیوانێکی بارکێش یەك لە دووای یەك بڕۆن .

**قەترە (قطره)** : دڵۆپە ، دڵۆپ ، دڵۆپەیێکی باران .

**قەترەیێکی ڕەحمەت** : دڵۆپێك ڕەحمەت ، ڕەحمەتی کەم .

**قەتع (قطع)** : (١) بڕین ، جودا کردنەوە ، پچڕاندن ، لێك جودا بوونەوە ، لێك دابڕین .(٢) باوەڕی بەهێز ، جەزم‌و یەقین .

**قەد (قد)** : باڵا ، قامەت ؛ ئەندازە ، ئەندازەی لەش لە ڕووی بەرزی‌و بڵندی‌یەوە .

**قەدەح (قدح)** : پیاڵە ، کاسە ، هەموو شتێکی کە مەی‌و شەرابی تێ بکرێ .

**قەدەح‌نۆش** : شەرابخۆر ، مەی‌خۆر ، عەرەق‌خۆر .

**قەدەم (قدم)** : (١) پێ ، ئەندازە، پێ لە سەری ئەنگوستەوە تا پاژنە (٢) پێشکەوتن . (٣) هاتن .

**قەدەم‌شووم** : پێ‌و قەدەمی بێ خێرو نەحس‌و نامووبارەك .

**قەدیفە** : مەخمەل .

**قەدیفەی سەوز** : مەخمەلی سەوز ، کینایەتە بۆ ئەرزی سەوزو مێرگ‌و مێرغوزار .

**قەدیم (قدیم)** : (١) کۆن ، ڕابردوو . (٢) لە زاراوەی فەلسەفەدا هەمیشەیی ، ئەو شتەیە نە سەرەتای هەیەو نە دووایی هەر بووەو هەر دەبێ .

**قەدد (قد)** : بڕوانە (قەد) .

**قەدر (قَدْر)** : (١) ئەندازە ، قەوارە ، بەرامبەر . (٢) هێزو توانا ، بەرزیو بلندی .

**قەد قامەت (قد قامت)** : « قد قامت الصلاة ... » .

**قەراح (قَراح)** : (١) نوێشك ، ئاوی پاکو زولاڵ . (٢) زەوییێکی کە ئاو و درەختی لێنەبێ .

**قەرار (قَرار)** : (١) بڕیار . (٢) پەیمان ، بەڵێن . (٣) جێگرتن ، دانان ، ئۆقرەگرتن ، سەبر کردن .

**قەراردان** : (١) بڕیاردان . (٢) پەیماندان ، بەڵێندان .

**قەرەداغ** : شاخی ڕەش ، ناوی ناوچەیێکی شاخاویو مەڵبەندەکەیەتی لە خوواروی سلێمانییەوەیە ، دەبێ نالی دەوری منداڵیو مێرد منداڵی واتە قوتابییەتیو فەقێیەتی لەو ناوە بردبێتە سەرو گەلێ بیرەوەریی لەوێ بەجێهێشتبێ .

**قەرابە (قرآبە)** : مەشکە ، مەشکەی ئاو و شیر و شەراب .

**قەرقەف (قرقف)** : (١) مەی ، شەراب ، ئاوی سارد . (٢) کتێبی دیانان ، ئینجیل .

**قەڕاڵ** : شای فەرەنگ ، مەلیکی فەرەنگستان .

**قەز** : ئاوریشم، ئاوریشمی خاو .

**قەزیبولبان (قضیب البان)** : لقی درەختی بان ، کینایەتە بۆ ڕێکیو ڕاستی :

**قەسەم (قَسَم)** : سوێند .

**قەسیر (قصیر)** : کورت ، دژی درێژ .

**قەست (قصد)** : (١) مەبەس . (٢) لە ڕێگە ڕۆیشتن .

**قەسد (قصد)** : بڕوانە (قەست) .

**قەسر (قصر)** : کۆشك، باڵەخانە .

**قەسری موعەللا (قصر معلّی)** : کۆشكو باڵەخانەی بلندی ئاوێنە بەند .

**قەسساب (قصّاب)** : گۆشت فرۆش ، ئەو کەسەی مەڕو گا سەر دەبڕیو گۆشتیان دەفرۆشێ .

**قەسوەت (قَسْوَت)** : سەختی ، ڕەقی ، دڵ ڕەق بوون ، بەزەیی نەهاتنەوە .

**قەشقە** : (١) بەد فەڕ ، بێ فەڕ ، نەگریس . (٢) ناوی گیایێکە گەنم تاڵ دەکا .

**قەعر (قَعْر)** : بن ، ژێر ، ناوەوە ، دووایی هەموو شتێك .

**قەف** : گرێ ، حەلقە .

**قەف قەف** : گرێ گرێ ، حەلقە حەلقە .

**قەفەس (قَفَس)** : سندووقێکی کون کونە لە مەعدەن یا دار دروست

دەکرێ ، بالندەو ئاژاڵی تێدا بەخێو دەکرێ .

**قەل** : قەلەڕەشکە ، بالندەیێکی ڕەنگ ڕەشە ، لە هاوینان دەچێتە کوێستانان ، ڕەمزی شـووم‌و بەد بەختی‌یە ، زاغ .

**قەلادە (قِلادە)** : قەلێتـــه ، گەردەن بەند ، قەلێتەی کە لە ملی سەگ‌و تانجی دەکرێ .

**قەلەندەر ( قَلَنْدَر )** : دەروێش ، ئەو کەسەیە کە هیچی نی‌یەو دلی بە ژیان خۆش نی‌یە .

**قەلب** : (۱) دڵ . (۲) ناوەڕاستی هەمـوو شـتێك ، نـاخی هەمـوو شتێك .

**قەلبەزەن** : بێ‌سوود ، بێ‌کارە .

**قەلبی بوریان** : دڵی برژاو .

**قەلع (قلع)** : هەلکەنـــدن لــە بنجەوە ، دەرهێنان لە دەمارەوە .

**قەلعە (قلعە)** : قـــەلا ، ئـــەو پەناگایەی لە ســەر شاخ یا جێی بڵند دروست دەکرێ .

**قەل فڕ** : فڕینی قەل ، کینایەتە بۆ وون بـوون‌و لاچـوونی پیـاوی خراپ .

**قەل فڕی ئەغیار** : وون بـوونی دوژمن ، دوورکەوتنەوەی دوژمن .

**قەللاب (قلاّب)** : ئەو کەسەیە کە پارەی ئەســڵ لە هی قەلب جـودا دەکاتەوە ، شارەزای پارەو سککە .

**قەلەم (قَلَم)** : خامە ، خۆنووس ، پێ نـووس ، ئەو قامیشـــەیە کـە بتراشرێ‌و پێی بنووسرێ .

**قەلەو** : پڕ گۆشت ، چەور .

**قەلب** : (۱) وەرگێـران ، قلپ کـردن ، سەرەونخـوون کـردن . (۲) شـتێك لـە ســەر شـتێکی تر دروست بکرێ بـەلام لە نەژادی ئەو نەبێ . (۳) زێڕو زیو و پارەی بێ نەژادو نا ئەسڵ .

**قەمەر (قَمَر)** : مانـگ ، ڕووی مانگ .

**قەمتەریر (قمطریر)** : ســەخت ، بەهێز ، زەبروزەنگ ، دژوار .

**قەمچی** : قامچی ، تازیانە ، قوڵە دارێکە سەرێـکی چەرمێکی درێژی لوولدراوی پێوە کـراوە بۆ ئاژۆتنی وولاخ بــە کار دەهێنرێ بەتایبــەتی ئەسپ‌و ماین .

**قەمع (قمع)** : سەرشـــۆڕکردن ، خستن ، لە ناو بردن .

**قەنا (قنا)** : (۱) هێشووی خورما . (۲) قامیش ، ئەو قامیشەی تیری لێ دروست دەکرێ .

**قەنارە (قنـارە)** : (۱) دارێـــکە قولابی پێوەیە لە دوکانی قەسابدا گۆشتی پێوە دەکەن . (۲) سێ‌دارە ، ئەو دەستکایەیە کە ئادەمــزادی لێ دەخنکێنن .

**قەند (قَنْد)** : شەکر ، شـتێکی سپی‌و شیرین‌و ووشکە لە کارخانە

لە چەوەندەرو قامیشی شەکر دروست دەکرێ .

**قەندیل (قندیل)** : چرادان .

**قەوام (قوام)** : داد ، ڕاستی ، قامەت ، ڕێك‌وپێکی .

**قەوەت** : بڕوانە (قووەت) .

**قەوس (قوس)** : (١) کەوان . (٢) برۆ . (٣) ناوی بورجی نۆیەمە ، بڕوانە (بورج) .

**قەوی** : بەهێز ، بەتوانا ، زۆردار .

**قەول (قول)** : ووتن ، قسە ، ووتار .

**قەهر (قهر)** : کەوتن ، لە ناو چوون ، لە ناو بردن ، نەمان .

**قەید (قید)** : پێوەند ، بەند ، گوریس یا هەر شتێکی تری کە چووار پێیانی پێ دەبەسترێتەوە .

**قەیدی چی‌یە** : دەشێ ، دەبێ ، هیچ هۆیێك نی‌یە کە نەبێ .

**قەیس (قیس)** : بڕوانە (مەجنوون) .

**قەیسەر (قیصر)** : لەقەبی پێشووی ئیمپراتۆرانی ڕۆما «ڕۆمان» بوو .

**قەی کردن** : ڕشانەوە .

**قیبلە (قبلة)** : کەعبە ، مالی خودا لە مەککە ، ئەو لایەیە کە لە کاتی نوێژکردندا ڕووی تێ دەکەن .

**قیبلە قوزە** : قوز پەرست : مێ‌باز ، ئەوەی قوز ئەوەندە لە لای پیرۆزە گەیشتۆتە پلەی پەرستن .

**قیتمیر (قطمیر)** : ناوی سەگی (ئەسحابی کەهف)ە ، بڕوانە (ئەسحابی کەهف) .

**قیچ** : ناتەواوی لە چاودا ، لاسەنگی لە ترازووی چاودا .

**قیر** : زفت ، شتێکی پەیت‌و تێرو ڕەشە لە نەوت دەردەهێنرێ ، ڕەمزی ڕەشی‌یە .

**قیرووسیا** : قیری سیا ، قیری ڕەش ، کینایەتە بۆ بایەخ نەدان .

**قیسسە (قصّە)** : ئاگا ، ووتە ، قسە ، حیکایەت ، داستان ، چیرۆك .

**قیسمەت (قسمت)** : بەش ، بەهرە ، نەسیب .

**قیمەت (قیمت)** : نرخ ، ئەرج .

**قین** : ڕق‌و کین .

**قوبوور (قبور)** : کۆی (قەبر = قبر)ە ، بڕوانە (قەبر) .

**قوبە (قبّە)** : گونبەد ، بینایێکی کە بانی خڕو گرد بێ .

**قوبلە (قبلة)** : (١) ماچ . (٢) ئەو جادووەیە کە جادووگەر دەیکا بۆ ئەوەی دڵی کەسێك بەستێتەوە بە یەکێکی تر ، واتە خۆشەویستی لە نێوانیاندا پەیدا بکا .

**قوپان** : لە قوپاوەوەیە ، هەموو

شتێکی شکابێتەوە لای خۆی ، هەموو شتێکی لە دووخی خۆی نەمابێ‌و چووبێتە ژوورەوە .

**قوتب (قطب)** : (١) وەلی ، شێخ ، پیر ، سەرۆکی میللەت . (٢) لە زاراوەی جوگرافیادا هەر یەکێك لە دوو لاکەی میحوەری زەوی کە قوتبی باکووری‌و قوتبی جنووبی پێ دەڵێن . (٣) ناوی ئەستێرەیێکە لە نێوان جەدی‌و فەرقەدان دایەو ڕابەری قیبلەیە .

**قوتر (قطر)** : ئیقلیم ، ناوچە ، هەرێم .

**قوترو دائیرە** : زاراوەیێکی زانستیی ئەندازەیە بریتی‌یە لەو خەتە ڕاستەی کە لە ناوەندی دائیرە تێدەپەڕێ‌و دائیرە دەکا بە دوو کەرتی وەك یەك .

**قودرەت (قدرت)** : توانایی ، هێز .

**قودس (قدس)** : (١) پیرۆز ، پاك . پاکی ، بارەگای خودا . (٢) لە زاراوەی دیاناندا ئەقنومی سێ‌یەمە لە پاش «باوك»و «کوڕ» . (٣) ناوی ئیسلامی شاری ئۆرشەلیمە
ـ **ڕووحولقودس (روح القدس)** : جبرائیل .

**قورئان (قرآن)** : کتێبی ئاینی موسوڵمانانە ، بریتی‌یە لە سەدو چواردە سوورەت ، هەفتاو دوو سوورەتی لە مەککە بووەو مەککی پێ‌دەڵێن‌و چل‌و دوو سوورەتی لە مەدینە بووەو مەدەنی پێ دەڵێن .

**قورب (قرْب)** : نزیك ، نزیکی ، دژی دوورو دووری .

**قوربان** : هەموو شتێکی کە بە هۆی ئەوەوە ئادەمزاد لە خودا نزیك ببێتەوە ، ئەو شتەیە کە دەکرێ بە خێر لە ڕێگەی خودا وەکو سەربڕینی مەڕو گاو دابەش کردنی گۆشتەکەی لە ڕێگەی خودادا .

**قوربانی** : بریتی‌یە لە کوشتنەوەی مەڕو گا لە جەژنی قورباندا بۆ خێر لە ڕێگەی خودا ، ئەوە لە ئەفسانەی بەسەرهاتی ئیسماعیلەوە پەیدا بووە ، بڕوانە (عیدی قوربان) .

**قوربەت (قرْبت)** : نزیکی ، عیبادەت‌و خوداناسی ، کاری چاك ئەوەی دەبێتە هۆی نزیك بوونەوە لە خودا .

**قوررەتلئەعیون (قرّت الاعین)** : چاو ڕوون بوون .

**قورس (قرص)** : (١) سفت‌و قایم . (٢) کولێرە ، کولیچە . (٣) ڕووی ڕۆژ .

**قورش** : بڕوانە (عەرش‌و قورش) .

**قوڕ** : خۆڵی لەگەڵ ئاو تێکەڵ کراو ، گڵ .

**قوڕبەسەر** : کینایەتە بۆ ئەو کەسەی کارەساتێکی گەورەی بە سەردا هاتووە .

**قوسوور (قصور)** : دووا هێنان بە کارێك پێش ئەوەی تەواو بێ ، کەمتەرخەمی کردن ، کەم‌و کووڕی ،

کارێك لە ناوەڕاستدا بوەستێنرێ‌و تەواو نەکرێ ، دەست لە کار هەڵگرتن لە ڕووی ناتەواوی‌یەوە .

**قوش** : باشق ، بە تورکی بە مانای باڵندە هاتووە ، باڵندەیێکی ڕاوکەرە چاوی زەردە ، لە باز بچووکترە ، پەڕی تیژو زۆر چالاکە.

**قوففە (قفة)** : (١) دەری ووشك ، کولەکەی زەردی ووشك . (٢) زەنبیل‌و سەبەتەی کە لە لقی دار خورما دروست دەکرێ . (٣) جۆرە بەلەمێکی خڕە بۆ پەڕینەوە لە ئاو بە کار دەهێنرێ . (٤) کینایەتە بۆ شتی سووکی کە دەکەوێتە سەر ئاو .

**قولاب (قلاب)** : چەنگاڵ ، ئالەتێکی مەعدەنی سەر چەماوەیە بۆ ماسی گرتن بە کار دەهێنرێ .

**قولقول** : دەنگی ئاو لە کاتی جۆش هاتن‌و کوڵین‌دا .

**قوڵاب** : بڕوانە (قولاب) .

**قوڵابی** : وەك قولاب ، نیسبەتە بۆ قولاب ، بڕوانە (قولاب) .

**قوڵلە (قلة)** : لووتکە ، سەری شاخ ، بڵندترین جێگە لە هەموو شتێك .

**قوڵینگ** : (١) کوڵنگ. (٢) بڕوانە (قازو قوڵینگ) .

**قوم** : (١) زیخ ، لم . (٢) قوم = قم : هەڵسە ، فرمانی ئەمرە لە فیعلی عەرەبی (قام ، يقوم) .

**قومری** : باڵندەیێکە لە کۆتر بچووکترە ، بە جووتە لەگەڵ یەکتری‌دا دەژین ، گۆشتی خۆشە .

**قووەت (قوّة)** : قەوەت ، هێز ، تووانایی ، زۆری ، تاقەت .

**قووت** : (١) خواردن ، خۆراك ، ئەو شتەی کە ئادەمزاد دەیخوا . (٢) تاك . (٣) بڕوانە (ڕووت‌و قووت) .

**قوون دڕان** : کارکردنی بێ سوود ، ڕەنج بە با ، مایە پووچ .

**قۆچ** : بەران .

**قۆری** : (١) زەنگی گەورە ، زەنگۆڵەی گەورە ، ئەو زەنگەیە کە لە ملی پێشەنگی کاروان دەکرێ. (٢) ناوی باڵندەیێکی بچووکە . (٣) چادان ، چای پەست (٤) گیشە .

**قرژاڵ** : (١) جانەوەرێکە لە ناو ئاو و لە ووشکایش‌دا دەژی . ٢) ناوی بورجی دووازدەمینە ، بڕوانە (بورج) . (٣) لە زاراوەی پزیشکی‌دا ناوی نەخۆشی‌یێکە .

**قسە** : ووتە ، ووتار ، ئەوەی کە دەووترێ .

**قلیش ــ قەڵیش** : درز ، لە باڵ یەك دەرچوونی شت ، کون تێ کەوتن .

**قلیشان ــ قەڵیشان** : درز تێ کەوتن ، درز بردن ، شەق بوون .

**قیا** : بڕوانە (قیامەت) .

**قیامەت (قیامت)** : بڕوانە (ڕۆژی قیامەت) .

## ك = K

**کا** : گیای ووشك ، ئەوەی لە گوڵە گەنم یا گوڵە جۆی ووشك دەمێنێتەوە لە پاش جیا کردنەوەی دەنکەکانیان .

**کاتیب (کاتِب)** : نووسەر ، ئەدیب ، ئەو کەسەیە کە پیشەی نووسین بێ .

**کادێن** : کادان ، جێگەی کا ، عەمباری کا .

**کار** : ئیش ، پیشە .

**کازیب (کاذِب)** : درۆزن .

**کاس** : گێژ ، وڕ .

**کاس (کأس)** : بادە ، جام ، شەراب ، ئەو قاپەیە کە بۆ ئاو یا شەراب خواردنەوە بە کار دەهێنرێ .

**کاسات** : کۆی (کاس = کأس)ە ، بڕوانە (کاس) .

**کاسە** : قاپێکی قوولە خواردەمەنیو خواردنەوەی پێ دەخورێو دەخورێتەوە .

**کاشانە** : (١) کۆخ ، خانووی بچووك ، خانووی هەژاران . (٢) هێلانە .

**کافی** : بەس کردن ، شتێك لە پلەیێکدا بوەستێنرێو هی تری پێویست نەبێ ، پێویستیی نەبوون بە هی تر .

**کافوور** : دەرمانێکی بۆن خۆشو سپییە لە درەختێك دەست دەکەوێ لە چینو ژاپۆن شین دەبێ ، لقو دەماری ئەو درەختە پارچە دەکرێو دەخرێتە ئاوەوەو دەکوڵێنرێو عەرەقی وەردەگیرێ ، لەمە پارچەی بەللووری دروست دەبێ کە کافووری پێ دەووترێ ، لە بەر ئەوەی کافوور زوو خراپ دەبێ بۆیە دەخرێتە ناو شووشەی داخراوەوە .

**کافووری** : سپی ، بۆنی خۆش ، نیسبەتە بۆ کافوور ، بڕوانە (کافوور) .

**کافر** : بێ ئایین ، بێ دین .

**کافرستانی** : ئەوەی لە وولاتی کافراندا ڕوو دەدا ، کینایەتە بۆ کردەوەی خراپو کوشتنو بڕینو تاڵان کردن .

**کاك** : برا ، برا گەورە .

**کاکە سوور** : (١) ناوی کوڕە لە کوردیدا . (٢) بە هەموو کوڕێکی موو زەردو چاوشین دەووترێ . (٣) ناوی باباێکی خەڵکی سلێمانی بووە ، قژ زەردی چاوشین بووە ، لە گەڕەکی دەرگەزێنی شاری سلێمانی ژیاوە .

**کاکۆڵ** : مووی سەر ، دەستە موویێکە لە سەر کە بە سەر نێوچەواندا شۆڕدەبێتەوە .

**کاکۆڵی غیلمان** : قژی کوڕانی جووانی بەهەشت .

**کاڵ** : (١) کاڵك ، میوەی نەگەیشتوو ، ئەو میوەیەیە کە نەگەیشتووەو ناخورێ. (٢) ئاچووغو کراوە بۆ ڕەنگ .

**کاڵا** : جلو بەرگ ، کەلوپەل ، کوتاڵی بازرگانی ، سامان ، ماڵو دەوڵەت .

**کام ؟** : کامە ، کێ ، کێهە .

**کامیاب** : بەختیار ، بە مراز گەیشتوو ، ئەوەی هیواو ئامانجی هاتبێتە دی .

**کانی** : سەرچاوە ، کانی مەعدەن.

**کانی ئاسکان** : ناوی جێیێك بووە لە باکووری ڕۆژئاوای شاری سلێمانی ، ئەو سەردەمە کانیو ئاوی لێ بووەو سەیرانگای خەلکی شار بووە ، لەوانەیە هەر لەو ڕۆژگارەدا یا پێشتر ڕەوە مامزیش ڕووی تێ کردبێ لەبەر ئەوە ناویان نابێ « کانی ئاسکان » ، ئێستا ئەو جێیە کەوتۆتە ناوەڕاستی شارو گەڕەکی « کانی ئاسکان »ە .

**کانی با** : کانیو سەرچاوەیێکە سەیرانگای شاری سلێمانییەو کەوتۆتە لای ڕۆژهەلاتیو لە سەر ڕێگەی هەلەبجە لەودیو گردی سەیوانەوە .

**کانی دمدم** : دەبێ کانیو ئاوێك بێ لەو شۆنانەی وولاتی سلێمانی کە نالی تێیاندا ژیاوە ، لەوانەشە ( کانی دۆمان ) بێ ، ئەمە کانییێکە لە شاری سلێمانی کەوتۆتە سەر ڕێی قەرەداغ لە بەردەمی گردی شێخ قادر کە بەشێکە لە گردی سەیوان .

**کاوول** : وێران ، خراب ، خەرابە ، دژی ئاوەدان .

**کەئس (کاس)** : بڕوانە (کاس = کاس) .

**کەباب** : گۆشتی قیمە کراوی برژاو ، گۆشتی کوت کراوی برژاو .

**کەبك** : کەو ، باڵندەیێکە هێندەی کۆترێکە ، دەنووکی بچووکو پەڕی خۆلەمێشییە ، باڵی پەڵەی سوورو ڕەشی پێوەیە ، گۆشتی بە تامەو دەنگو ئاوازیشی خۆشە ، بەتایبەتی کە بە ڕەوە دەخوێنن زۆرتر لە ناوچەی شاخاویدا دەژین ، لە کوردستاندا زۆرن .

**کەتم (کَتم)** : شاردنەوە ، کارێك بە نهێنی بگیرێ .

**کەچ** : خووار ، لار ، چەماو .

**کەچی** : بەلام ، لەگەل ئەوەش .

**کەدوورات : (کدورات)** : لێل ، لەککە ، گەرد ، تۆزو خۆل ، دژی سافو پاك .

**کەر** : گۆ درێژ ، وولاخێکی بار کێشە .

**کەرامەت (کَرامَت)** : (١)گەورەیی، مەزنی. (٢) کردنی کاری ئەفسانەیی

ئەوتۆ بێجگە لە پێغەمبەران کەس پێی نەکزێ .

**کەرەبۆز** : کەری بۆر ، کەری ڕەنگ خۆڵەمێشی ، کەری ڕەنگی ڕەش‌و سپی تێکەڵ .

**کەرەت** : جار .

**کەرەم (کَرَم)** : چاوتێری ، جوانمەردی ، گەورەیی‌و مەزنی ، دەست بڵاوی .

**کەری** : نیسبەتە بۆ کەر ، بڕوانە (کەر) .

**کەربەلا (کربلاء)** : ناوی شارێکە لە خوارووی وولاتی عیراقی ئێستادا ، لە (١٠ی موحەررەمی ٦١هـ = ١٠ی تشرینی یەکەمی ٦٨٠ز)دا شەڕە بەناوبانگەکەی نێوان لایەنگرانی عەلەوی‌و ئومەوی تێیدا ڕوویدا ، لە ئەنجامدا حوسێنی کوڕی عەلی‌و فاتیمە کوژراو هەر لەوێش نێژرا ، کەربەلا یەکێکە لە شوێنە پیرۆزەکانی شیعە .

**کەردو** : دەوەنێکی درشتە لە کنگرەکەرانە دەکا .

**کەردز** : ناوی ئەستێرەیەکە .

**کەرگەس** : داڵ ، باڵندەیێکی ڕاوکەرە ڕەنگی ڕەش یا قاوەیی دەبێ ، باڵندەی بچووک ڕاو دەکاو گۆشتی کەلاکیش دەخوا .

**کەرم (کَرْم)** : ڕەز ، مێو ، باخی درەختی ترێ .

**کەڕ** : ئەو کەسەی گوێی لە دەنگ نەبێ ، بێ گو . . . .

**کەژاوە** : سندووقێکی گەورەیە لە دارو دەوەن دروست دەکرێ‌و لە سەرپشتی ووشتر دادەنرێ‌و بۆ سوواربوون بە کار دەهێنرێ .

**کەس** : ئادەمزاد ، تاکی خەڵك ، بابا ، شەخس ، خۆ .

**کەسەل (کسل)** : تەمەڵی ، بێ تووانایی ، سستی .

**کەسب (کَسْب)** : وەدەست خستن ، هێنانە ناو دەست ، بوون بە خاوەنی شتێك .

**کەسر (کَسْر)** : شکان ، شکاندن، ووردکردن ، پارچەکردن .

**کەشەندە** : ئەو کەسەی شت ڕادەکێشێ ، ئەو کەسەی شت دەکێشێ ، ئەو کەسەی شت دەسەنگێنێ .

**کەشیدە** : (١) درێژ ، بڵند ، کێشراو . (٢) سەرپێچی شێخ‌و مەلاو پیاوی ئایین .

**کەشش** : ڕاکێشان .

**کەششاف (الکشاف عن حقائق التنزیل)** : کتێبێکە لە تەفسیری قورئان لە دانانی مەحموودی کوڕی عومەری کوڕی محەمەدی خووارزەمی‌ی زەمەخشەری‌یە (١٠٧٥ز – ١١٤٤ز) .

**کەشف (کَشْف)** : ئاشکرا کردن ، پەیدا کردن ، پەردە لادان لە سەر

شتی نهێنی ، ڕوون کردنەوەی شتی
قورس ، بە بەڵگە دەرخستنی
ڕاستیی شت .

**کەشمەکەش** : کێشەکێش ، گێرەو کێشە ، تەنگوچەڵەمە ، بگرەو بەردە ، شەڕوشۆڕ ، گفتوگۆو ئاژاوە ، ناخۆشیو دوژمنایەتی .

**کەعب (کعب)** : پاژنەی پێ ، ئێسقانی پاژنەی پێ .

**کەعبە (کعبە)** : کابە ، خانوێکی چوارگۆشەیە لە ناوەڕاستی شاری مەککە ، بەردی ڕەش «حجر الأسود» لە یەکێ لە سووچەکانییەتی ، لە سەردەمی جاهیلیدا بوتخانەی بوتە گەورەکانی عەرەب : لاتو عوززاو مەناتو هوبەل بوو ، بیری زەمزەم لە نزیکییەوەیە ، محەمەد پێغەمبەر بوتەکانی لە ناو بردو کردی بە قیبلەی موسوڵمانان ، ماڵی خوداشی پێ دەڵێن ، ئەم ناوە بۆ سەردەمی جاهیلیو پاش ئیسلامیش دەشێ .

**کەف** : (١) ماددەیێکی سپییە لە ئەنجامی شوشتنی قوماش یا لەش بە ئاوو سابوون پەیدا دەبێ ، ئەو ماددەیە کە لە ئەنجامی کوڵانی ئاو دەکەوێتە سەرییەوە ، ئەوەی لە دەمی ئادەمیزاد پەیدا دەبێ لە ئەنجامی زۆر قسەکردن یا ووشك بوونی دەم ، کەفی زار . (٢) ئەو ڕەنگە ڕەشەیە کە ژنان برۆیان پێ دەڕێژن .

**کەف (کفّ)** : دەست ، لەپ ، ناودەست ، ناو پێ .

**کەفارەت (کفارت)** : ئەوەیە کە بە هۆی ئەوەوە گوناه داپۆشرێ وەکو ڕۆژوو گرتن یا قوربانیو سەدەقە کردن ، هەڵگرتنی تاوانو گوناه لە سەر خۆ بە ڕۆژوو گرتنو قوربانیو سەدەقە کردنو شتی تر .

**کەفەن (کفن)** : جلی مردوو ، پارچە قوماشێکی سپییە مردووی تێ وەردەپێچنو دەینێژن .

**کەففە (کفّ)** : بڕوانە (کەف) .

**کەففە (کفّە)** : تا ، تای ترازوو ، ئەو بەشەی ترازووە کە شتی لە ناو دادەنرێ بۆ کێشان ، ترازوو دوو تای هەیە یەکێکیان بۆ شتو ئەویتریان بۆ سەنگ «بەرد» .

**کەل** : (١) کەچەڵ ، ئەو کەسەیە کە مووی سەری لە ئەنجامی برینی تایبەتی ڕووتابێتەوە . (٢) **ددان** کەوتوو .

**کەلام (کلام)** : قسە ، ووتە ، ڕستەیێك مانای تێدا بێ .

**کەلب (کلب)** : سەگ .

**کەلبی ئاهووگیر** : تانجی ، تاژی ، ئەو سەگەی کە مامز دەگرێ .

**کەللە** : سەر ، جومجومە ، کاسەی سەر .

**کەللەی کەل** : سەری کەچەڵ .

**کەڵ** : داو ، تا ، تاڵ .

**کەم** : (١) هەندێ ، چۆرێ ، دژی

زۆر . (٢) بەش ، ئەندازە ، قەوارە ، ڕوخسار ، ژمارە ، بڕوانە (کەمو کەیف) . (٣) (کم) چەند ، عەرەبی‌یە .

**کەمو کەیف ( الکم والکیف ) :** ژمارەو جۆر ، قەوارەو ناووك ، شێوەو ناوەڕۆك .

**کەمال ــ کەماڵ (کمال) :** تەواو بوو ، کامڵ بوو ، بێ کەمو کووڕی ، خوو و ڕەووشتی تەواو .

**کەمان :** (١) کەوان ، دارێکی خووار کراوەیە هەر دوو سەری بە ژێ بەستراوە ، چەکێکی جەنگی‌ی کۆنە بۆ تیرەندازی بە کار هێنراوە . (٢) هەموو شتێکی چەماوەو خووار ، وەکو برۆو شتی تر .

**کەمەر :** دەوری زگ‌و پشت ، ناوەڕاست ، پشت ، کەمەربەند ، ئەوەی لە پشت دەبەسترێ .

**کەمەرە :** کەمەربەند ، ئەوەی لە پشت دەبەسترێ .

**کەمەند :** تەناف ، پەتێکی درێژی ئەستوورە قولفەیێکی تێدا دەکرێ بۆ گرتنی ئادەمزاد یا ئاژاڵ یا هەڵگەڕان بە سەر دیواردا ، لە سەردەمی کۆندا وەکو چەکێکی جەنگی بوو .

**کەمین :** خۆشاردنەوە لەجێگەیێکی نادیار بۆ ئەوەی لە پڕ بە سەر دوژمن یا نێچیردا بدرێ .

**کەنار :** قەراخ ، ڕۆخ ، دەم ، لای هەموو شتێك ، دژی ناوەڕاست .

**کەنارە :** بڕوانە (کەنار) .

**کەندوو :** (١) شتێکە خڕو گەورەو قووڵ لە گڵ دروست دەکرێ ، لە کوردەواری‌دا بۆ پاراستنی دانەوێڵەو ئاردو میوەی ووشك کراوو شتی تریش بە کار دەهێنرێ . (٢) ماڵی هەنگ .

**کەنز (کنز) :** گەنجینە ، خەزینە، خەزنە .

**کەنزی موتەلسەم :** خەزینەی تەلیسماوی ، بە پێی ئەفسانەی ناو کوردەواری هەموو خەزینەیێك دوو شێر یا مارو ئەژدەهای تەلیسماوی پاسەوانی‌ی دەکەن‌و دەپارێزن .

**کەوا :** (١) کەوێ ، جۆرە جلێکە لە کوردەواری‌دا تایبەتی‌یە بە ئافرەت ، لە کۆن‌دا پیاویش بەکاریان دەهێنا ، بەڵام ئێستاکە باوی نەماوە . (٢) کەواتا ، کەواتە ، دیارە ، دەبێ .

**کەوا تاقە :** کەوای لە قوماشی تاقە دروست کراو ، ئەو کەوایەی لە قوماشی تاقە دروست دەکرێ .

**کەوان :** (١) بڕوانە (کەمان) . (٢) کەوی (کەوە) ، باڵندەیێکی جووان‌و دەنگ خۆش‌و بەناوی کوردستانە ، بڕوانە (کەبك) . (٣) پەلکەزێڕینە ، قەوس‌و قەزەح ، قۆز قەددەح .

**کەوتن :** ڕووخان ، هاتنە

خووارەوە ، هاتنە سەر زەوی ، نزم بوونەوە .

**کەوچك** : مـــلاك ، شـــتێکی دەسکداری سـەر خڕی قووڵە لـە خـوواردندا بـە کـار دەهێنـرێ بەتایبەتی لە خوواردنی شتی شلدا .

**کەوسەر (کوثر)** : (١) نـــاوی ڕووبارێـکی ئەفســـانەیی‌یە لـــە بەهەشتدا . (٢) کەســـی گەورەو مەزن ، کەسی گەورەو خێرخووا . (٣) هەموو شتێکی فراوانو زۆر .

**کەوشـــەك** : یاری‌یێـــــکی کوردەواری‌یە بەتایبەتی فەقێ‌یان لە بەهـــاراندا دەیـــکەن « بـــازو کەوشەك »یشی پێ دەڵێن ، بڕوانە (باز) .

**کەوکەب (کَوکَب)** : (١) ئەستێرە. (٢) گوڵێکە لە باخچەدا شین دەبێ گەورەو درشتە ، ڕەنـگی سوورو زەردو سپی‌و بنەوشەیی‌و سووری کاڵی هەیە .

**کەوکەبە (کَوکَبة)** : (١) پـــۆل ، تـــیپ ، تیپـــی ســـوواران . (٢) ئەستێرە . (٣) گوڵ .

**کەون (کون)** : بوون ، ووجوود ، مانەوە ، زاراوەیێـکی زانســـتی‌ی مەنتیقە دژی فەسادە .

**کەهفـــولئەنام (کهف الانـام)** : ئەشکەوتی ئادەمـــزاد ، ئەشـــکەوتی ئەسحابی کەهف ، بڕوانە (ئەسحابی کەهف) .

**کەهکەشان** : کاکێشـان ، خەتێکی سپی‌یە لــە ئەنجامی ئەســتێرەیێکی زۆری بێ ژمارەی لە یەکەوە نزیك لە ئاســماندا دروست بووە ، وەکـو شەقامێکە کای تێدا ڕژابێ ، ڕێ‌ی کاکێشـانو ڕێ‌ی حاجی‌یـانو ڕێ‌ی شیریشی پێ دەڵێن .

**کەی** : (١) ووشەیێکە لــە کاتی پرسین لە کاتو ســەردەمدا بە کار دەهێنرێ : چ کــات ؟ چ زەمـــان ؟ (٢) پاشـــای هـــەرە گـــەورە ، شاهنشـــا ، لەقـــەبی گـــەورە ترین پاشایانە .

**کەید (کید)** : فێڵ ، حیلە .

**کەیف (کیف)** : (١) خۆشـــی ، گوشادی، بەختیاری. (٢) جەوهەر، ناوەڕۆك ، نەژاد ، بنیـــاد ، نەوع ، بڕوانە (کەمو کەیف) .

**کەیل (کَیل)** : (١) پێوانـــــە . (٢) خـــــووار ، کــــــەچ . (٣) ئەوەی ئارەزوو دەکا ، ئـەوەی ئـارەزووی هەیـە . (٤) گۆیـــژ ، گێووژ ، ئالووباڵووی کێوی .

**کەیـــوان** : (١) زوحـــەل ، ســـاتوورن ، یەکێـکە لە ئەســتێرە گەڕۆکەکـان لــە پاش مشتەری لە هەموویـــان گەورەتـــرە ، هـــەشت مانگی هـــەیە ، وە پشـــتێندێك لـــە ڕووناکی دەوری داوە . (٢) بڕوانە (سەیوان) .

**کیبر (کِبر)** : خـــۆ بـــە گـــەورە گرتن ، خۆ دەرخەر ، خۆپیشاندەر، خۆپەرست .

**کیتاب (کتاب)** : (١) کتێب ، نووسراو ، پەڕەی چاپ کراو و جزو بەند کراو . (٢) قورئان .

**کیزب (کذب)** : درۆ .

**کین** : بڕوانە (قین) .

**کینایەت (کنایة)** : ووشەیێکە لە جێی مانای ڕاستیی خۆی بە کار ناهێنرێ بەڵکو بۆ ماناو مەبەسی تر بە کار دەهێنرێ .

**کیسە** : تۆربە ، هەموو شتێکی لە چەرم‌و قوماش‌و شتی تر دروست بکرێ‌و گەورەو بچووکی هەبێ‌و شتی تری بخرێتە ناوەوە ، پارە ، پووڵ .

**کیسەڵ** : ڕەقە .

**کیسرا** : خوسرەو ، لەقەبی شاهنشاهانی ساسانیانە .

**کێ** : ووشەی پرسیارە لە کەس ، چ کەس ؟ کامە کەس ؟ .

**کێشان** : (١) برۆ کێشان ، جووان کردن‌و ڕەش کردنی برۆ . (٢) وێنە گرتن ، ڕەسم کردن بە دەست . (٣) هەڵسەنگاندن ، دیاری کردنی قورسی شت بە ترازوو . (٤) ڕاکێشان ، دەرهێنانی شت لە جێگەیێک‌و بردنی بۆ جێگەیێکی تر . (٥) تووتن کێشان ، سووتاندنی تووتن .

**کێشمەکێش** : بڕوانە (کەشمەکەش) .

**کێل** : ئەو بەردە پان‌و درێژەیە کە لای سەروو و خوواورووی گۆڕ دەچەقێنرێ .

**کێو** : شاخ ، چیا .

**کێوی توور** : بڕوانە (توور) .

**کێوی نەجد** : چیای نەجد ، بڕوانە (نەجد) .

**کورت** : بچووک ، ئەو کەسە یا شتەیە کە باڵاو درێژی لە چەشنی خۆی کەمتر بێ ، دژی درێژ .

**کورتان** : پاڵان ، بۆ حەیواناتی بارکێش بە کار دەهێنرێ بەتایبەتی کەر ، بەرامبەر بە «زین»ی ئەسپ‌و ماینە .

**کوحل (کحل)** : کل .

**کورد** : (١) نەتەوەی کورد . (٢) ئادەمزادێکی لە نەتەوەی کورد بێ .

**کوردانە** : کوردئاسا ، وەکو کورد ، ئەوەی خوو و ڕەووشتی کوردی هەبێ .

**کوردی** : (١) زمانی کوردی . (٢) نیسبەتە بۆ کورد ، بڕوانە (کورد) .

**کوڕ** : نێرینە ، منداڵی نێرینە ، بەرامبەر بە کچە .

**کوژان** : کورت کراوەی کوژرانە .
- **کوژا بێ** : کوژرا بێ .

**کوژانەوە** : خامۆش بوونی چراو ئاگرو شتی تر .

**کوژتن - کوشتن** : مراندن ،

گیانداریك بێ گیان بكرێ ، گیـان كێشـان .

**كوشته** : كوژراو ، ئەو گیاندارەیە كە سەری دەبڕرێ یا بە هەر جۆرێكی تر بێ گیان دەكرێ .

**كوشتگیر** : زۆران باز .

**كوشنده** : ئەو كەسە یا شتەیە كە گیانداریك بكوژێ .

**كوفر (كُفر)** : ناسوپاس كردن ، خودا نەناسین ، بێ ئیمانو باوەڕی

**كول** : ئێشانی چاو .

**كولانه** : كولانكە ، ئەو كونەی باڵندەی لێ دەنیشێتەوە .

**كولاه** : كڵاو ، ئەو شتەیە كە لە قوماش یا چەرم دروست دەكرێو لە سەر دەنرێ .

**كولبه (كُلبه)** : كۆخ ، كووخ ، خانووی هەژاران ، خانووی بچووك، خانووی گوند .

**كولبەیی تاری** : كۆخی تاریك .

**كولی گریان** : گریانی بە سۆز ، گریانی گەرم .

**كولـۆ** : مەلۆتكەی لۆكە ، پارچەی لۆكە ، زەرراتی بەفر .

**كولم** : گۆنا ، سەری ڕوومەت .

**كون (كُن)** : (١) درزو بەتاڵی لە هەموو شتێكدا ، شتێكی بتەو بۆشایی لە ناودا بێ . (٢) بە فەرمانی ئەمری تاك لە فیعلی عەرەبی «كان» ، ئیشارەتە بۆ ئایەتی «كن فیكون» ، لە قورئاندا .

**كونج (كُنج)** : (١) گۆشە ، سووچ ، (٢) چینو پێچ .

**كونجی ڕاحەت** : گۆشەی ئاسایش ، گۆشەی حەسانەوە .

**كونجی كاشان** : گۆشەی خانووی زستانەی بچووك ، ناو كۆخ ، گۆشەی هێلانە .

**كوندەبوو** : بووم ، باڵندەیێكی ڕەشە لە ناو كەلاوەو جێگەی وێرانو خەرابەدا دەژی ، ڕەمزی كارەساتو بەدبەختیو نالەباری‌یە .

**كون كردن** : سمین ، دوو بە دەركردنی شت ، بۆشایی پەیدا كردن لە ناو شتێكدا .

**كوهنه (كُهنه)** : كۆن ، دێرین ، دێرینە .

**كووپه** : جەڕە ڕەشەبوو .

**كووتاڵ** : كوتاڵ ، قوماشی بازرگانی ، پارچە .

**كووچه** : كۆڵان ، ڕێی باریكی ناو شارو دێهات .

**كوودەك** : منداڵ ، كوڕ یا كچی بە تەمەن بچووك .

**كـووره** : ئاتەشخانە ، ئەو جێیەی ئاگری لێ دەكرێتەوە ، جێی تواندنەوەی مەعدەن ، جێی برژاندنی خشت .

**كۆ** : كۆڵان ، كووچە ، گەڕەك .

**کوتەمە** : کورت .

**کوسار** : ئەو جێیەی شاخو کێوی زۆری لێیە ، جێی شاخاوی .

**کوش** : خووار باوەش ، ئەو جێیەی بەشی سەروو و خوارووی لەشی ئادەمزاد بە یەکتری دەگەن : داوێنی ھاوسوو جۆرە جلو بەرگێك بەرز بکرێتەوەو شتی تێ بکرێ .

**کوشە** : کۆشش، ھەوڵو تەقەلا.

**کوگا** : جێی کۆبوونەوە ، مەجلیس ، جێی شتومەك فرۆشتن .

**کوڵ** : شانو مل ، پشت .

**کومەڵ** : جێی کۆبوونەوە ، جێی گردبوونەوە ، جێی ژیانی خەڵك ، خەڵكو ئادەمزادی زۆر لە یەك جێگەدا بژین .

**کون** : (١) دێرین ، دێرینە ، پێشوو ، قەدیم . (٢) شتێکی زۆر بە کار ھاتبێو لە کەڵك کەوتبێ .

**کونە** : بڕوانە (کون) .

**کوی نوورە** : (١) تەقینو گەرمایی‌و هێزو کەفو کوڵی نوورەیە کە لە ئەنجامی تەفاعولی نوورە لەگەڵ ئاودا پەیدا دەبێ ، کینایەلە بۆ سووتانو بوون بە زوخاڵ ، بڕوانە (نوورە) . (٢) کۆگای نوور ، جێی کۆبوونەوەی نوور .

**کور** : بێچاو ، بێ بینا ، ئەو کەسەی نابینێ .

**کوری** : بێ چاوی ، بێ بینایی .

**کچ** : منداڵی مێینە ، کیژ ، کەناچە ، کەنیژك .

**کرێژ** : قرێژ ، چڵك .

**کردن** : مەسدەری ئیشو کارو پیشەیە .

**کردنەوە** : (١) ئاواڵە کردنی شتی داخراو . (٢) ڕزگار کردن .

**کرم** : جانەوەرێکی بێ دەستو پێو خشۆکە ، ئێسقان لە لەشیدا نییە .

**کرمی قەز** : کرمی ئاوریشم .
**کڕین** : ھەموو شتێکی بکڕێ بە ماڵ بەرامبەر دانی نرخی بە پارە .

**کزە** : شنەی با .

**کزەی دەبوور** : شنەی بای دەبوور ، بڕوانە (دەبوور) .

**کشان** : ڕۆیشتن ، خزین ، بزووتنەوە .

**کل** : سورمە ، تۆزێکی ڕەشە بۆ چاو ڕشتن بە کار دەھێنرێ .

**کلیل** : ئالەتێکی قفلی پێ دەکرێتەوە .

**کلك** : ئەندامێکی درێژی لەشی

ئـاژاڵ‌و باڵندەیە لـە دوواوەیانەوە دەبێ .

**کلك ئێســـتر** : کلکی وەکـو کلکی ئێستر ، کلکی گەورە .

**کلافە** : گلۆلە ، دەزوو یا پەتی هەڵکراوە .

**کلاو** : ئەو شـــتەیە کە لە ســـەر دەنرێ .

**کن** : لا ، نزیك .

## گ = G

**گاه** : کات ، دەم ، ســەردەم ، زەمان .

**گاییَن ـ گان کردن** : جووتبوونی ژن‌و پیاو ، چوونی ئەندامی نێرینە بۆ ناو ئەندامی مێبینـــەو شەهوەت تێ کردنی .

**گەبر** : گـاوور ، زەردەشـــتی ، پێڕەوی ئایینی زەردەشـــتی ، ئاگر پەرست .

**گـەپ** : (۱) تیپ ، حـەرف ، ووشە ، ڕستە ، قسـە . (۲) گاڵتە ، گەمە . ـ **گەپ کردن** : قسەکردن .

**گەپو گۆبەنـد** : دەمەتـــەقێ‌و کۆبوونەوەی ڕابـواردن ، گەمـەو گاڵتە .

**گەدا** : هـەژار ، بێ نـەوا ، ئەو کەسـەیە کە گوزەران‌و ژیانی خۆی لە خەڵکی داوا دەکا .

**گەر** : ئەگەر ، ئەڕ .

**گەروو** : ئەو بەشـــەیە لە لەشی ئادەمزاد کە لە دەمەوە بەرەو خووار دەبێتەوە .

**گەرد** : (۱) بڕوانـــە (تـــۆز) . (۲) بزووتنەوە، شنە ، سووڕانەوە، دوور کەوتنەوە .

**گـــەردان** : (۱) ئـــــــەوەی دەسووڕێتەوە، ئەوەی دەبزوێتەوە، ئەوەی لە گەڕانـدایـە . (۲) جۆرە کەبابێکە لە گۆشتی باڵندە یا مـەڕ لە پێشانا لە ئاودا دەکولێنرێ ئنجا دەکرێ بە شیشدا دەبرژێنرێ .

**گـــەردەن** : (۱) مـــل ، لای پێشـــەوەی مـل . (۲) ملوانـکە ، گەردانە ، گەردەنلغ ، خەناوکە .

**گەردەنلغ** : ملوانـکە ، گەردانە ، خەناوکە .

**گەردەن‌کەچ** : مل‌کەچ، ملخووار.

**گەردی شەماڵ** : شنەی بای شەماڵ.

**گەردو باد** : تۆزو با .

**گەردوون** : چـەرخ ، ئاســمان هەموو شـــتێکی لە دەوری خـۆی بسووڕێتەوە .

**گەردوونی گەردان** : ڕۆژگـــارو چەرخ‌و فەلـەکی کە دەســوورێ ، فەلەکی سەیار .

**گەردش** : گەڕان ، بزووتنەوە ، سووڕانەوە ، گۆڕین ، بوون .

**گەرگین (گرگین)** : گرێ ، گڕوو ،

ئەو کەسەی تووشی نەخۆشیی گەڕ بوون دەبێ .

**گەرم** : دژی سارد .

**گەرما** : گەرمی هەوا ، دژی سەرما .

**گەرمابە** : گەرماو ، حەمام ، ئەو جێیەیە کە ئاوی گەرمی لێیەو لەشی لێ دەشۆرێ .

**گەرم ڕەو** : (١) چالاك ، چاپوك ، ئەو کەسەیە کە بە تیژی دەڕوا . (٢) لە زاراوەی دەروێشیدا ئەو سالیکەیە کە بە شەوق تێدەکۆشێ بۆ گەیشتن بە مەبەس .

**گەڕان** : سووڕانەوە ، بزووتنەوە لە جێیێك بۆ جێیێکی تر .

**گەڕانەوە** : هاتنەوە ، لە جێیێك بوون جارێکی تر گەڕانەوە بۆ ئەوێ .

**گەڕاوە** : بووە بە .

**گەز** : (١) ئەندازەی درێژییە بریتییە لە ١٦ گرێ . (٢) درەختێکی گەورەو ئەستوورە گەڵای وەکو گەڵای سەروە داری دەسووتێنرێ . (٣) جۆرە شیرینییێکە لە داری گەز دروست دەکرێ .

**گەزەند** : ئازار ، ڕەنج ، ئاسیب ، برین .

**گەش** : بە شەوق ، بریقەدار ، ڕووناك ، ئاگری بەهێز . ــ **خوێنی گەش** : خوێنی تازە ڕژاو .

**گەشت** : سەیران ، گەڕان ، سەفەر کردن .

**گەل (گل ــ گێل)** : وەرە ، بە زمانی تورکی .

**گەل** : کۆمەڵ ، تیپ ، تاقم ، خەڵك .

**گەلێ** : زۆر ، فرە ، گەلێك ، دژی کەم .

**گەلوو** : گەروو .

**گەلووگیر** : گەرووگیر ، ئەوەی گەروو دەگرێ .

**گەلا** : پەلك ، بەرگی دارو درەخت .

**گەلاڕێزان** : سەردەمی وەرینی گەڵای درەخت ، پاییز ، کینایەتە بۆ دوا هاتنی ژیان ، کۆچ کردن ، مردن .

**گەنج** : خەزینەی زێڕو زیوو موجەوهەراتو بەردی بەنرخی شارراوە لە جێگەیێکی نهێنیدا .

**گەنجینە** : نیسبەتە بۆ (گەنج) بڕوانە (گەنج) ، جێی گەنج ، جێی دانانی شتی گران .

**گەنجی ویرانە** : خەزینەی نێو کاولگەو خەرابە ، ئەفسانەی کوردەواری دەڵێ خەزینە لە جێی کاولو خەرابە دەشاررێتەوە بۆ ئەوەی کەس هەستی پێ نەکا .

**گەنجوور** : خەزنەدار ، خەزینەدار ، جاوەنی خەزینە .

**گەورە** : سەرۆك ، حاكم ، مەزن .

**گەوهەر** : بڕوانە (جەوهەر) .

**گەه** : بڕوانە (گاه) .

**گەیاندن** : بردنی شتێك بۆ كەسێك .

**گەیشتوو** : گەیو .

**گەیشتن** : دەست خستنی ئامانج ، گرتنی هیوا .

**گیران** : گرتن ، داخستن .

**گیرودار** : شەڕوشۆڕ ، كۆمەڵە خەڵكێكی تێك ترنجاو ، فریادو بانگ‌و هەرا ، كارەسات ، ئاسیب .

**گیرفان** : بەرك ، جێب .

**گێژ** : (١) بایێكی تیژو گەرم‌و تۆزاوی‌یە لە لای خوارووەوە هەڵ دەكا . (٢) وور ، ئەو كەسەی ئاگای لە خۆی نی‌یە . (٣) ناوی عەشیرەتێكی كوردە .

**گێژی جەنووب** : بای جەنووب ، بڕوانە (گێژ) .

**گێژو لوول** : گەردەلوول ، گەردەلوولە .

**گێژو وێژ** : بڕوانە (گێژ) .

**گێسوو** : كەزی ، مووی تەوق‌و پشتی سەری ژنان كە دەهۆنرێتەوەو لە پشتەوە شۆڕ دەبێتەوە .

**گوتن** : قسەكردن ، ووشەو ڕستە لە دەم هاتنە دەرەوە .

**گودروون** : پیرەمەگروون ، ناوی شاخێكی بەرزو بڵندی كوردستانە كەوتۆتە لای باكووری ڕۆژئاوای شاری سلێمانی‌یەوە ، ناوی چاكێكیشە هەر لەو شاخەدا پێوەندی‌ی زۆری بە مێژووی كۆنی ئەو ناوچەیەوە هەیە ، بەتایبەتی ئایینی نەتەوە ئاری‌یە هەرە كۆنەكانی ئەو هەرێمە .

**گورگ** : جانەوەرێكی كێوی‌ی گۆشتخۆرە لە سەگ دەكا ، بەڵام لەو بەهێز ترو دڕندە ترە .

**گورگی سەفەر** : كینایەتە بۆ گورگی زۆر گەرۆك .

**گورگەمێش** : سەگی غەیان ، سەگی خاین ، سەگێك كە یارمەتی گورگ بدا ، كینایەتە بۆ پیاوی دەغەڵ‌و داوێن پیس‌و خۆری .

**گوڕ** : تاو ، دەنگ ، جموجۆڵی ، دەنگی ئاو .

**گوزەر** : (١) پەڕینەوە ، ڕۆیشتن . (٢) گەڕەك ، ناوچەی هەر سنفێك لە بازاڕدا .

**گوشابوون** : كرانەوە ، فراوان بوون .

**گوشایش** : كراوە ، فراوانی .

**گوفتار** : ووتن ، قسەكردن ، ووتار .

**گوڵ** : (١) خونچەی كراوە ، خونچەی پشكوتوو ، بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ كە لە دارو درەخت‌و گیا لە دوواییی‌و نووكی چڵێك پەیدا

دەبێ ، لە پاش ماوەیێك لە جێكەی ئەم بەرگانە تۆو یا میوە دروست دەبێ . (٢) كولم ، ڕوومەت ، دەم و چاو .

**گولاو** : عارەقی گول ، ئاوی گول ، عەتر .

**گولاوی قودس** : گولاوی پیرۆز ، گولاوی بەهەشتی .

**گول ئاتەشی** : گولی سوور ، گولەنار ، گولەهەنار .

**گول ئامێز** : تێكەل لەگەل گول ، گولاوی .

**گولەندام** : لەش ناسك ، ئەو كەسەی لەشی نەرم و ناسك بێ وەكو پەڕەی گول ، بۆ ژنان بە كار دەهێنرێ .

**گولی بەستە** : دەستە گول ، باقە گول .

**گولی ڕوو** : كولم .

**گولی ژالە** : بڕوانە (ژالە) .

**گولینگ** : بڕوانە (گولینگە) .

**گولینگە** : دەستە داوێكی ئاوریشم یا خوری یا هەر شتێكی تر وەكو گول دروست دەكرێ لە قەراخی مشكی و هەوری‌ی سەر و دەسماڵ یا دەسرازە یا بەرماڵ و بەڕە و جاجم و شتی تر شۆڕ دەكرێتەوە .

**گول و مول** : (١) گول و شەراب . (٢) لە سەر شێوەی « كچ و مچ » ، « ڕێكە و مێكە » .

**گولووك** : شاگول ، گولی گەورە و جوان و گەش .

**گولبون** : بنەگول ، بۆتەی گول ، داری گول .

**گولچەهرە** : جوان ، ڕوو جوان ، ڕووی وەك گول ، زیاتر بۆ ژنان و منداڵان بە كار دێ . ووشەكە لە كوردی و توركی عوسمانی‌دا بەم شێوەیە بەلام لە فارسی‌دا «گولچیهرە»یە .

**گولچین** : ئەو كەسەی گول دەچنێ، ئەو شتەیە كە هەلبژێراوە.

**گولخەن** : ئاتەشخانە ، ئاتۆن ، ئاتەشخانەی گەرماو .

**گول خەندەران** : گیایێكە لە لاولاو دەكا ، گولی یاخود بەری لە شێوەی هێلكەدایە بەلام ڕەنگی پرتەقالی و كونجر كونجرە ، لە كاتی گەیشتن‌دا دەتەقێ و وەكو دەمی كراوەی لێ دێ ، تۆوی سووری تەڕی لینج لە ناوی دیار دەبێ .

**گولزار** : (١) گولستان ، باخچە، ئەو جێیەی یەكجار گولی زۆری لێ بێ . (٢) دەمی وەك گول .

**گولستان** : ئەو جێیەی دار و درەخت و گولی زۆری لێیە ، گولزار ، گولشەن .

**گولشەن** : ئەو جێیەی دار و درەخت و گولی زۆری لێیە ، گولزار ، گولستان .

**گولگولی** : ڕەنگی گول ، سوور ، پەمەیی .

**گوڵنار** : گوڵی هەنار .

**گوم بوون** : وون بوون ، بزر بوون ، شتێك لە چاوی ئادەمزاد دوور بکەوێتەوەو دیار نەبێ .

**گومڕەه** : ئەو کەسەی ڕێ وون دەکا ، ئەو کەسەیە کە لە ڕێگەی ڕاست لای‌داوە .

**گوم گەشتە** : گوم بوو ، بزر بوو ، وون بوو .

**گون** : ئەو ئەندامەیە لە ئادەمزادو گیانداری تردا کە ماددەی نێرینەیی تێدایە .

**گوناه** : تاوان ، کاری بەد ، ئیشی خراپ ، ناڕەوایی .

**گوناهکار** : تاوانبار ، ئەو کەسەی کە گوناه دەکا ، ئەو کەسەی کە کاری خراپو ناڕەوا دەکا .

**گونی دێوانە** : گونی شێت ، کینایەتە بۆ ڕووتو قووتیو گەڵو گون لە دەرەوەیی .

**گونبەد** : ئەو بانەیە کە بە شێوەی هێلکە دروست دەکرێ ، بە زۆری بۆ مزگەوتو جێگەی پەرستنو گۆڕو ئارامگا بە کار دەهێنرێ .

**گونجایش** : تووانایی ، قەوارە .

**گوارە ــ گووارە** : خشڵێکە ژنان لە گوێیان دەکەن بۆ جووانی .

**گوهەر** : بڕوانە (جەوهەر) .

**گووش** : بڕوانە (گۆ) .

**گووشوارە** : بڕوانە (گوارە) .

**گۆ** : هەموو شتێکی خڕو گردو بچووك ، وەکو : گۆی مەمك ، گۆی قاشوانێ .

**گۆبەند** : (١) هەراو هووریا ، کارەسات ، ڕووداو . (٢) کۆڕی ڕابووواردن .

**گۆج** : ئەو کەسەیە کە کەموکووڕییێك لە دەستی هەبێو کارکردنی تەبیعی نەبێ .

**گۆچان** : گۆپاڵ ، دارێکی ڕاستو باریکە سەرێکی چەماوەتەوە بۆ یارمەتی‌دان لە کاتی ڕۆیشتن بە کار دەهێنرێ ؛ قاشۆ ، دارێکی ڕاستو باریکی سەر خڕە لەگەڵ گۆ لە یاری‌ی قاشوانێ بە کار دەهێنرێ .

**گۆشە** : کونج ، کەنار ، سووچ .

**گۆشەگیر** : ئەو کەسەیە کە لە ماڵ دادەنیشێو لە خەڵکی دوور دەکەوێتەوە .

**گۆل** : گۆم ، ئاوی وەستاو .

**گۆلی مەرەزانە** : گۆمی مەرەزە ، گیای برنج دەبێ هەمیشە ئاوی لە ژێر بێ .

**گۆم** : بڕوانە (گۆل) .

**گۆنە ــ گۆنا** : (١) چەهرە ، ڕوو ، کولم . (٢) ڕەنگ . ــ **گۆناگۆن** : ڕەنگاو ڕەنگ .

**گۆیا** : (١) گوایا ، دەڵێن ، دیارە، (٢) ئەوەی قسە دەکا ، قسەکەر .

**گۆیابوون** : ووتن ، قسەکردن ، بە قسە هاتن ، هاتنە ووتن .

**گوێ :** ئەندامێکی لەشە ، ئالەتی بیستنە بەهۆی ئەوەوە دەنگو ئاواز دەرك دەكرێ .

**گوێ درێژ :** کەر .

**گوێ کورت :** ئادەمزاد ، مرۆڤ ، ئینسان .

**گران :** (١) قورس ، دژی سووك . (٢) بە نرخ ، دژی هەرزان.

**گرانبار :** ئادەمزاد یا حەیوانێك باری قورسی بە سەر پشتەوە بێ ، ئەوەی ئەرکی یەکجار زۆرە .

**گران ناز :** ئەو کەسەیە کە ئەرکی ناز کردنی زۆرە .

**گرێن :** بڕوانە (گریان) .

**گرێ :** پێچان ، شت بە یەکەوە بەستن ، بەند ، پێوەند .

**گرتن :** (١) خستنە ناو دەست . (٢) داگیر کردن . (٣) بەند کردن ، حەپس کردن .

**گرتنە ناو :** لە ناوی بوون ، لە ناو شت بوون .

**گرد :** (١) خڕ ، هەموو شتێکی لە شێوەی گلۆلەدا بێ . (٢) دەورو بەرو کەناری هەموو شتێك .

**گردی نەمەکین :** گردی جووان .

**گرژ :** کشانەوە پاڵ یەك ، گوریزە ، زولفی بە گوریزە .

**گریان :** گریە کردن ، فرمێسك ڕژاندن .

**گریە :** گریان ، فرمێسك ڕشتن ، ڕشتنی فرمێسکی زۆر لە ئەنجامی پەستیو دڵتەنگیدا .

**گڕ :** گڵپە ، هەڵاو ، هاڵاو . زمانی ئاگر .

**گفتوگۆ :** قسەکردن لەگەڵ یەکتری .

**گلە :** گلەیی ، دەرخستنی دڵتەنگی .

**گڵ :** خاك ، خۆڵ ، قوڕ ، ئەو خۆڵەی کە لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەکرێ .

**گڵاو :** پیس بوون ، پیس بوون لە ئەنجامی لەش بە لەشی سەگ یا بەراز بکەوێ .

**گڵپە :** هەڵاو ، هاڵاو ، گڕی ئاگر .

**گیا :** هەموو سەوزییێکی کە لە سەر ڕووی زەوی دەڕوێ جگە لە دارو درەخت ، گیاو گۆڵ .

**گیاه :** بڕوانە (گیا) .

## ل = L

**لا :** (١) لامەلفەلا ، لام ئەلف لا (تیپی لامو ئەلفە لە ئەلفبای عەرەبیدا) . (٢) کن ، نزیك ، بەش ، لایێك ، جیهەت . (٣) نا ، نەء ، ووشەی نەفیو نەخواستنو ڕەت کردنەوەیە .

**لا پەراسوو :** لایێك لە پەراسوو ڕاست یا چەپ ، بڕوانە (پەراسوو).

**لا جانگ :** لایێکی ڕوومەت ، لا ڕوومەت .

**لا چـــوون** : چـــوون ، دوور کەوتنەوە .

**لا دان** : لا بردن ، خستنە لاوە .

**لا رەیب (لاریب)** : بێ‌گومان ، بێ شك . **لازەمان (لازمان)** : نەبـوونی کات ، نەبوونی دەم ، نەبوونی زمان، زاراوەیێکی زانستی‌ی فەلسەفەیە بۆ خودا بە کار دەهێنرێ .

**لازِب (اللازِب)** : کاری‌گـەر ، کوشندە .

**لازمە** : (۱) پێویستە ، زەروورى. (۲) وەستاو لە جێ ، پایەدار .

**لاشـە** : (۱) لەشـی حەیـوانی مردوو ، مردار . (۲) لەڕ ، پەست ، زەبوون ، سەرکز .

**لاعیب (لاعِب)** : یاری‌کەر .

**لاف** : خۆ هەڵکێشان ، ووتـەی بێ‌مانا ، داوا کردنی زیاد لە ڕاستی.

**لاك** : (۱) کەلاك ، لاشە ، لەشی مردوو ، ئـەو لەشـە مـردووەی بۆگەنی کـردووە . (۲) ماددەیێـکی سوورە لە هیندستان لـە درەخت دەردەهێنرێ‌و بۆ ڕەنگ کردن بە کار دەهێنرێ .

**لاکین (لکن)** : بەلام .

**لالـە** : (۱) گولاڵـە سـوورە ، کولیکی نیسان ، گیایێکی بچووکە بە زۆری لە جێگەی تەڕو ناو شـاخ‌و قەراخ ئاو دەڕوێ ، کێوی‌و مـاڵی هەیە ، هەروەها لـە ڕووی ڕەنگ‌و ژمـارەی پەڕەیەوە جـۆری زۆرە ، کێوی‌یەکەی ڕەنگی سوورە لەژێـر پەڕەکانی‌دا لەککەیێکی ڕەش هەیە . (۲) جۆرە چراداننێـکی بەللووری‌یە مۆمی لە ناو دادەنرێ . (۳) بـڕوانە (لەعل) .

**لاڵ** : ئەو کەسـەیە کە قسـەی بۆ نەکرێ ، ئەو کەسەی زمالی بگیرێ‌و نەتووانێ بە ڕاسـتی دەنگ لە دەمی بهێنێتە دەرێ .

**لام** : تیپـی لام (ل) لە ئەلفبـای زمان‌دا .

**لام ئەلف (لا)** : (لا) .

**لا مەکان (لامکان)** : نەبوونی جێ ، بـۆ خـودا بـە کـار دەهێنـرێ . زاراوەیێکی زانستی‌ی فەلسەفەیە .

**لانك** : ئـەو تەختەیـە کە بـۆ نووانـدنی منـداڵی ساوا بـە کار دەهێنـرێ‌و بـۆ ئـەم مەبەسـە دەهەژێنرێ .

**لایق (لائق)** : شایان ، لێ‌وەشاوە.

**لەئالی (لئالی)** : کـۆی (لۆلۆ = لوئلوئـ)ە ، بڕوانە (لوئلوئـ) .

**لەب** : بڕوانە (لێو) .

**لە باتی** : لە جیاتی ، لە جێگەی ، لە بریتی .

**لەبالەب** : پڕ ، هەموو شتێك لە ئاو یا هەر شلەیێکی تر پڕ بـکرێ‌و لێ‌ی بێتە خووارێ ، هەموو شتێکی زیاد لە پێـویست پڕ بێ‌و لـێ‌ی بڕژێ .

**لەبان** : کۆی (لـەب = لب)ە ،

بڕوانه (لەب) .

**لەبەر** : (أ) جل له بەر بوون ، شیعر له بەر بوون ، قورئان له بەر بوون . (۲) له پێش ، له بەر ئەو .

**لەبەر کردن** : جل لەبەر کردن ، پۆشین ، شیعر لەبەر کردن ، ئەزبەر کردن .

**لەبیب (لبیب)** : به هۆش ، ژیر ، زمان پاراو ، عاقڵ .

**لەب شەکەر** : لێوی شیرین ، دەمی شیرین ، قسه خۆش .

**لەت** : پارچه ، کەرت .

**لەتافەت (لطافت)** : نەرمیو ناسکی ، ئەندامی جوان ، جوانی ، قسه خۆش .

**له تاو** : له حەژمەت ، له تاو .

**لەتیف (لطیف)** : نەرمو ناسك ، دڵسۆز ، میهرەبان ، خووو ڕەووشتی چاك .

**لەت لەت** : پارچه پارچه .

**لەتم (لطم)** : زلله ، شەپازلله ، به دەست له دەمو چاوی یەکێك دان .

**لەجووج (لجوج)** : بزێو ، شەڕانی ، سەرکێش ، هەرزه ، ئەو کەسەی له داوێدا کۆڵ نەدا .

**لەحزه (لحظه)** : نیگایێك ، کات ، دەم ، ئەو ماوەیەیه که جارێك چاو تێیدا دەبزوێتەوە .

**لەحزه ژمێر** : چاوەنۆڕی ، چاوەڕووانی .

**له دەس چوون** : بزر کردن ، وون کردن ، دۆڕاندن .

**له دوو** : له دووا ، یەکێك له پشت یەکێکەوه بڕواو وەکو سێبەر وازی لێ نەهێنێ .

**لەرزان** : بزووتنەوه له جێی خۆ .

**لەرز** : لەرزین ، بزووتنەوه له جێی خۆ له ئەنجامی سەرما یا هەندێ نەخۆشی یا له کاتی ترس‌دا .

**لەرزه وو تا** : نەخۆشی‌ی مەلاریا، لەرزو تا ، تاو لەرز .

**لەرزین** : بڕوانه (لەرز) .

**لەززات (لذات)** : کۆی (لەززەت = لذت)ە ، بڕوانه (لەززەت) .

**لەززەت (لذت)** : خۆشی ، هەست کردن به خۆشی ، مووچڕکی خۆشی .

**لەسەردان** : (۱) گێژ کردن ، گێژ بوون له ئەنجامی ئەوەی بۆنێکی بەهێز ئادەمزاد ووڕ دەکا . (۲) خنکاندن ، له قەنارەدان .

**لەسەرنان** : لەسەرکردن ، پۆشینی سەر به کڵاو یا هەرشتێکی تر .

**لەشکر** : بەشێك له سوپا ، تیپێك له دووازده هەزار سەرباز پێك‌هاتبێ .

**لەشکری قیرووسیا** : لەشکری

داگیرکەر ، ئەو لەشکرەی بایەخ بە هیچ شتێك ناداو لە هیچ شتێك نارەوێتەوە ، ئەو لەشکرەی پێ‌پەروا هەمووشتێك دەکا تا ئەگەر لە ناو چوونی خۆشی تێدابێ .

**لەشکری خەتت** : تیپی خەت‌و خاڵ ، ڕیزی خەت‌و خاڵ .

**لەعین (لعین)** : نەفرەت لێ‌کراو ، لەعنەت لێ‌دراو ، مەلعوون .

**لەعب (لعِب)** : یاری ، گاڵتە ، گاڵتەوگەپ ، شۆخی .

**لەعل** : (١) لال ، یەکێکە لەبەردە بەنرخەکان‌و ڕەنگی سوورە وەکو یاقووت ، چەشنە ئۆکسیدێکی ئالومینی ڕەنگاوڕەنگە لە تەبیعەت پەیدا دەبێ ، جووانترینی « لەعلی بەدەخشان »ە . ــ **لەعلی موزاب (لعل مذاب)** : شەرابی سوور، مەی‌ی ڕەنگ سوور . (٢) کینایەتە بۆ لێو .

**لەعلی ڕوممان** : لەعلی سووری ڕەنگ هەناری ، کینایەتە بۆ دەمی خۆشەویست ، بڕوانە (لەعل) .

**لەعنەت (لعنت)** : نەفرەت لێ کردن .

**لەففو نەشر (لف ّ ونشر)** : (١) پێچانەوەو بڵاوکردنەوە . (٢) لە زاراوەی زانستی‌ی ئەدەبدا ئەوەیە کە شاعیر چەند ووشەیێك یا چەند ناوێك لە دێڕە شیعرێکدا بهێنێ ، وە لە دێڕە شیعری داهاتوودا سیفەت بۆ ئەو ووشانە بهێنێ ، بەو ووشەو ناوانە دەڵێن (لەفف) ، وە بە سیفەت‌و بەراووردەکانیشی دەڵێن (نەشر) ، لەفف‌و نەشر سێ جۆرە : (١) لەفف‌و نەشری مورەتتەب : واتە ووشەی یەکەمی نەشر پێوەندی بە ووشەی یەکەمی لەففەوە دەبێ ، وە دووەم بە دووەم‌و سێ‌یەم بە سێ‌یەم تا دووایی . (٢) لەفف‌و نەشری مەعکووس : واتە ووشەی یەکەمی نەشر پێوەندی بە ووشەی دووایی لەففەوە دەبێ . (٣) لەفف‌و نەشری موشەووەش : ئەوەیە کە تەرتیب‌و دەستووری تایبەتی‌و دیارکراوی نی‌یە .

**لە قالب دان** : کینایەتە بۆ شتی ڕێك‌وپێك‌و جووان‌و بێ کەم‌و کووڕی .

**لەکە (لکە)**: داغ ، خاڵ ، هەموو ڕەنگێکی کە بکەوێتە سەر پارچە یا هەر شتێکی ترو لە ڕەنگی شتەکە نەبێ‌و پێ‌یەوە دیار بێ .

**لە کن** : لە لا ، لەلای .

**لەگەڵ** : بەیەکەوە ، پێکەوە .

**لەگەن** : قاپێکی مەعدەنی گەورەی پەلە .

**لەم** : لە ئەم ، لە ناو ئەم ، لە .

**لەم بەینە** : لەم ماوەیە .

**لەمحە (لمحة)** : ئەو ماوەیەیە کە جارێك چاو تێیدا دەبزوێتەوە ، نیگایێك .

**لە مەی‌دا** : لە ئەمەی‌دا ، لە ئەوەی‌دا ، لە ناو ئەوەی‌دا .

**لەنجە** : ناز ، ڕەوتێك لە ڕووی نازو لە خۆ بایی‌یەوە .

**لەنجە تەزەڕوو** : ڕەوتی باڵندەی تەزەرروو ، بڕوانە (تەزەرروو) .

**لەندەهوور (لَنْدَهور)** : کەسی باڵا بەرزو لەش گەورەو بەهێز ، لەندەهۆڕ .

**لەنگەر (لەنگەری)** : قاپێکی مەعدەنی‌ی گەورەو فراوانە لە سینی دەکا .

**لەوان** : لەو کەسانە .

**لەوح (لَوْح)** : هەموو شتێکی کە پانو لووس بێ لە بەردو دارو ئێسقانو مەعدەن ، پارچەی مەعدەن یا ئێسقان کە لە سەری بنووسرێ .

**لەولاو** : لاولاو ، گیایێکە لە نیلۆفەر دەکا ، لە درەخت دەئاڵێو بە سەر دیوار هەڵدەگەڕێ ، گوڵی لە شێوەی بۆڕی‌و زارکی زوڕنادایە .

**لەوم (لَوْم)** : بڕوانە (لۆمە) .

**لەون (لَون)** : (١) ڕەنگ . (٢) چەشن ، جۆر .

**لەهو (لَهْو)** : یاری کردن ، گەمە کردن ، هەموو کارێکی کە ئادەمزاد مەشغووڵ بکاو خۆشی بکەیێنێتێ

**لەهیب ( لَهیب )** : شوعلە ، زمانی ئاگر ، گڕ ، گڵپە ، گەرمی‌ی ئاگر .

**لەهجە (لَهجە)** : زمان ، بەشێك لە زمان ، ئەو زمانەی کە خەڵکی قسەی پێ‌دەکەن ، شێوەی قسەکردنو دەرهێنانی دەنگی تیپ .

**لەیلا (لیلی)** : کچی مەهدی‌ی عامیری‌یە ، ناوی ژنێکی عەرەب بووە ، خۆشەویستی مەجنوون بووە ، بەڵام باوکی ویستوویەتی بیدا بە کابرایێك ناوی ئیبن سەلام بووە ، بەڵام لەیلا شووی پێ‌نەکردووەو لە داخی دڵداری‌ی مەجنوون مردووە لە پاش ئەو مەجنوونیش کۆچی دوایی کردووە ، نیزامی گەنجەوی (سەدەی دووازدەمی زایین) لە چیرۆکی شیعری « مەجنوون لەیلا » ئەم ڕووداوانەی کردووە بە ئەدەبو هونەرێکی یەکجار نایابو بەرز ، بڕوانە (مەجنوون) .

**لیباس (لِباس)** : جلوبەرگ ، هەموو شتێکی کە لەش دادەپۆشێ .

**لیبس (لبس)** : (١) لەبەرکردن . (٢) جلوبەرگ .

**لینگ** : لنگ ، لا ، بەك پێ‌ی ئادەمزاد ، لایێکی بار ، تاکێکی پێڵاو .

**لێت** : لە تۆ .

**لێدان** : لێدانی دەفو ئالەتی مۆسیقا .

**لێرە** : لە ئێرە ، لەم جێگایە .

**لێژ** : هەموو جێ‌یێکی سەربەرەو خووار یا سەربەرەو ژێر بێ وەکو قەدی شاخو کێوو گرد .

**لێگەڕان** : (۱) وازهێنان ، دەست هەلگرتن لە شت . (۲) پشکنینەوە لە شت ، هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شتی وون بوو .

**لێل** : شێلوو .

**لێلاو** : ئاوی شێلوو .

**لێم** : لە من .

**لێمان** : لە ئێمە .

**لێو** : قەراخی هەموو شتێك ، قەراخی دەم لە سەرەوەو خووارەوە ئەوەی ددان دادەپۆشێ .

**لێوی غونچە** : لێوی بچووك ، لێوی بچووکی قوچاوەی وەك خونچە .

**لوئلوئ (لؤلؤ)** : دوڕ ، مرواری.

**لوئلوئی لالا** : مرواریی دوڕەخشان ، مرواریی ڕووناكو بریسکەدارو ڕوونو ساف .

**لوببی لوباب (لُبّ لُباب)** : لوببی لوبابی مەسنەوی ، هەلبژاردەی مەسنەویی جەلالەددینی ڕۆمییە لە دانانی مەلا حوسێنی کاشیفییە لە سالی (۹۱۰هـ ــ ۱۵۰٤ز ) لە هیرات کۆچی دووایی کردووە .

**لوتف (لطف)** : نەرمی ، ناسکی ، میهرەبانی ، چاکی .

**لوخت (لخت)** : ڕووت ، ڕووتو قووت ، بێجلو بەرگ .

**لوعاب (لعاب)** : ئاوی ناو دەم ، هەموو ئاوێکی پەیتو لنج .

**لوورە لووڕ** : حەوەحەو ، دەنگی سەگو گورگو چەقەڵو ئاژاڵی تر .

**لووس** : (۱) هەموو شتێکی بێ گرێ ، چاپلووس . (۲) شیرینزمان ، کوزکێش ، ئەو کەسەیە کە بە زمانی شیرین خۆی لە خەڵکی نزیك دەکاتەوەو خۆی خۆشەویست دەکا . (۳) لە زاراوەی هەتیوبازاندا ئەو کوڕە جووانەیە کە حەزی لێدەکەن .

**لووسوپووس** : بڕوانە (لووس) .

**لوول** : (۱) گوریزە ، بادراو . (۲) زیرەك ، بێشەرم .

**لۆکە** : پەموو ، پەمۆ ، کینایەتە بۆ هەور .

**لۆمە** : سەرزەنشت ، گلەیی لێکردن .

**لسووق (اللصوق)** : (۱) پێوە نووسان . (۲) ئەو دەرمانەی کە لە سەر برین دادەنرێ بۆ تیمار کردن . (۳) ئەو پارچەیەی برینی پێ دەبەسترێ .

## م = M

**مائ (ماء)** : ئاو .

**ما ئەوحا (ما اوحی)** : ئەوەی بە وەحی نێرراوە ، ئەو ووتانەی لەلایەن خوداوە بۆ پێغەمبەران دەنێررێ ، ئیشارەتە بۆ ئایەتەکانی قورئان کە بە وەحی لەلایەن خوداوە بۆ محەممەد پێغەمبەری موسولمانان نێرراوە .

**مائیده (مائدة)** : خووان ، سفره ، ئەو شتەی خوواردەمەنیی لە سەر دەخورێ ؛ خووانی ڕازاوە بە خوواردەمەنی ؛ خوواردەمەنی ، خوواردن ، تەعام .

**مائولخزر (ماء الخضر)** : (١) ئاوی خدری زیندە ، ئاوی ژیان . (٢) ئاوی خدر (نالی) ، شەهوەتی خدر (نالی) ، بڕوانە (خدر) .

**مات** : (١) سەرسام ، حەیران ، سەرگەردان ، داماو . (٢) لە زاراوەی شەترنجدا بە شا دەووترێ لەو کاتەی کە تەنگەتاو دەکرێ‌و ڕێی ڕزگاربوونی دەگیرێ .

**ماتەم (ماتم)** : پرسە ، تازیە ، تەعزیە .

**ماتەمی** : نیسبەتە بۆ (ماتەم) ، بڕوانە (ماتەم) .

**مات‌و حەیران** : بڕوانە ( مات ) ، ( حەیران ) .

**مات‌و مەبهووت** : بڕوانە (مات) ، (مەبهووت) .

**ماجەرا (ماجرا)** : ئەوەی ڕووی داوە ، ئەوەی بووە ، ئەوەی قەوماوە ، سەرگوزەشتە ، مێژووی ژیان ، ڕووداو ، بەسەرهات .

**ماچ** : بزووتنەوەی دوو لێوی ئادەمزادە لەسەر ڕوومەت یا دەم یا هەر جێگەیێکی‌تری ئادەمزاد یا شتێکی‌تر .

**ماحی** : ئەوەی دەکوژێنێتەوە ، ئەوەی شت لەناو دەبا .

**مادام** : تا کاتێك ، تا سەردەمێك کە ، تا هەیە ، لە بەر ئەوەی .

**مادەر** : دایك ، بڕوانە (دایك) .

**مار** : جانەوەرێکە لە خشۆکەکان، لەشی نەرم‌و درێژە ، جۆری زۆرە ، زەهرداری کوشندەیە .

**ماری ئەژدەر** : بڕوانە (ئەژدەر) .

**ماری سەمەندەر** : جانەوەرێکە لە مارمێلك دەکا ، لە ئاوو ووشکایی‌دا دەژی ، ئەگەر لە ئاگر نزیك ببێتەوە ماددەیێك لە لەشی دێتەدەرێ ئاگرەکە دەکوژێنێتەوە ، لە بەر ئەوە بووە بە ڕەمزی ئەو جانەوەرەی کە ئاگر کاری تێ‌ناکا .

**ماری مەغزی ئادەمی خوار** : ئەو مارەی کە مێشکی ئادەمزاد دەخوا، مەبەس مارەکانی سەرشانی زەححاکە لە ئەفسانەی ناو کوردەواری‌و ئێراندا .

**مارو موور** : مارو مێرووله ، زیندەوەر .

**مارووت** : بڕوانە (هارووت) .

**مازی (ماضي)** : ڕابردوو ، سەردەمی ڕابردوو ، ڕۆژگاری بە سەر چوو .

**ماسی** : حەیوانێکی خوێن ساردە ، هەمیشە لە ناو ئاودا دەژی ، جۆری زۆرە ، گۆشتی دەخورێ ، لەشی بە پوول داپۆشراوە .

**ماسیوا (ماسوا)** : جگە لە ، بێجگە لە ، لەو بەدەر .

**ماقوول (مَعقول) :** ئەوەی عەقل پەسەندی دەکا ، ئەوەی بەهۆی عەقلەوە دەرك دەکرێ .

**ماڵ :** (١) خانوو ، هەموو شتێکی کە ئادەمزاد هەیەتی بە ژنو منداڵیشەوە . (٢) ئەندامی مێینەی ژن .

**ماڵانگەڕ :** ئەو کەسەی سەر بە هەموو ماڵێکدا دەکا ، ئەو کەسەی زۆر دەگەڕێ ، ئەو کەسەی لە هەموو جێیێکدا دیارە ، گەڕۆك ، خۆری .

**ماڵین :** (١) ماشتن ، پاككردنەوە . (٢) لە مالنجدان ، سوواقکردن . (٣) شێلان . (٤) لێدان .

**ماڵبڕین :** دزینی ناوماڵ ، تالان کردن .

**ماڵ وێران :** لێقەوماو ، خانە خراپ ، کەساس .

**ماڵیاوا :** ناوی ئەو گوندەیە کە حەبیبەی خۆشەویستی نالی لێ لە دایك بووە ، بە پێنج شەش کیلۆ مەترەیێك لە قەرەداخەوە دوور بووە، کەوتبووە نێوان گوندەکانی وولیانیو باخان . هەندێ کەس دەڵێن ناوی گوندەکە ( ئالیاوا ) بووە ، هەندێکی تریش دەڵێن ( سالیاوا ) بووە .

**مان :** ژیان ، لە ناو نەچوون .

**مانەند :** وەکو .

**مانەوە :** بەند بوون لە جێیێك ، مان لە جێیێك زیاتر لەو ماوەیەی بۆی دانرابوو .

**مانی :** (٢١٦ز ــ ٢٧٧ز) کوڕی پووتەگ کوڕی بابك بووە ، ناوی دایکی مەریەم بووەو لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەردەوانی شاهنشای ئەشکانی لە دایك بووە ، وێنەی کێشێکی بلیمەتو زاناو داناییکی گەورەو بێ هاوتاو ئاشنایەتیی لەگەڵ پزیشکیی ڕووحانیدا بووە ، داوای پێغەمبەریی کردووە ، بیرو ڕاکانی لە کتێبی « ئەرژەنگ »دا تۆمار کردووە ، لە بەر بیری ئازادو سەربەخۆ مانی خرایە زیندانەوە ، لە دووای ئازاردانێکی دڕندانەو جانەوەرانە لە پاش بیستو شەش ڕۆژ کۆچی دووایی کرد ، لە پاش مردن سەریان بڕیو پێستیان گروو و کایان تێکردو لە دەروازەی شاری جندی شاپوور هەڵیانواسی . تا دەوروبەری ئیسلامیش دەروازەکە بە ناوی مانییەوە بوو ، دەڵێن پێیێکی لەنگبوو .

**مانیع (مانِع) :** قەدەغە، بەربەست کردن ، لێنەگەڕان ، وەستاندن لە کارێکدا .

**مانگە شەو :** ئەو شەوەیە کە مانگ لە ئاسمان دەبێ ، ئەو شەوەی ڕووناکیی مانگی تێدا دەبینرێ .

**ماوەرد :** ئاوی گوڵ ، گوڵاو .

**ماوی :** ئاوی ، ڕەنگی ئاو ، شینی کاڵ ، پیرۆزەیی .

**ماه :** مانگ ، کینایەتە بۆ کچی جووان .

**ماهی تابان** : مانگی درەوشەدار ، مانگی تریفەدار ، مانگی ڕووناك .

**ماهی میسر** : مانگی میسر ، کینایەتە بۆ یووسفی کوڕی یەعقووب ، بڕوانە (یوسف) .

**ماهی نەو** : مانگی یەك شەوە ، مانگی تازە ، هیلال ، مانگی شەوی یەکەمی مانگی قەمەری .

**مایە** : بەش ، چەند ، ئەندازە ، سامان ، بنیادی هەموو شتێك ، دارو درەختی جسنو هەڵبژاردە .

**مایەبەین** : نەژادی تێکەڵاو ، بنچو بناوانی لە دوو شت یا زیاتر پێك هاتبێ .

**مایە پەروەر** : نەژاد پەروەر ، ئەسڵزادە ، ئەوەی لە سایەی دەوڵەتو سامانەوە پەروەردە بووە .

**مایین** : ئاودار ، لە (الماء)ەوەیە .

**مایل (مائل)** : لایەنگر ، ئەوەی ئارەزووی شتێك دەکا ، ئەوەی لە دووای شتێکدا دەگەڕێ .

**مە** : ئێمە .

**مەئال (مَـآل)** : سەرچاوە ، مەبەس ، جێی مەبەس ، ئەنجام .

**مەئلووف (مالوف)** : ئاسایی ، گونجاو ، ئەوەی خوو و ڕەووشتێك ئاسایی‌یە لەلای .

**مەئموور (مامور)** : فەرمانبەر ، ئەوەی فەرمانی بۆ دەرکراوە ، ئەو کەسەیە کە فەرمانی دراوەتێ کە کارێك جێبەجێ بکا .

**مەئموول (مامول)** : ئارەزوو ، خوواهش ، مەبەس .

**مەئوا (ماوی ــ ماوا)** : جێگە ، پەناگا ، ماڵ ، هێلانە .

**مەئیووس (مایوس)** : نائومێد ، بێ هیواو ئامانج ، دەست شوشتن لە شتێك .

**مەبال** : میز کردن ، میزتن ، جێگەی میز کردنو پێشاو . .

**مەبحەس (مبحث)** : باس ، جێی لێکۆڵینەوەو گەڕان بە دووای شتێکدا .

**مەبزوول (مَبذول)** : (١) زۆر ، فراوان ، گەلێك . (٢) بڵاو بوو ، بەخش .

**مەبهووت (مبهوت)** : سەرسام ، سەرسوڕماو ، سەرگەردان .

**مەتاع (متاع)** : کالا ، سامان ، هەموو شتێکی سوودی هەبێ، زێڕو زیو .

**مەتین (متین)** : بەهێز ، بەقەوەت، قایم ، سفت ، چەسپیو ، وەستاو لە جێ .

**مەتبەخ (مطبخ)** : چێشتخانە ، جێی لێنانو ئامادەکردنی خوواردەمەنی .

**مەترووك (متروك)** : دەست لێهەڵگیراو ، واز لێهێنراو ،

فڕێدراو ، ئـەو شتەی بێکەڵكو سوود بێو دوورخرابێتەوە .

**مەتڵەب (مطلب)** : (۱) جێی داوا کـردن ، مەبــەس ، ئـارەزوو ، ویـست . (۲)) مەســەلەیێك لـە زانستیدا ، تیۆری .

**مەتڵەع (مطلع)** : (۱) پێشـــەکی ، ســەرەتای قسە ، یەکەمـین دێڕی غەزەل یا قەسیدە . (۲) ئەو جێو لایەی کە ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانی لێ‌هەڵدێ .

**مەتـن (متـن)** : (۱) پشـــت . (۲) نـاوەڕۆکی هەمـوو شـتێك . (۳) جـێی بلنـد . (٤) ئـەوەی لە لاپـەڕەی کتێب نووسـراوەتەوە ، بەرامبەر پەراوێزە .

**مەتهەر (مطهر)** : (۱) جێگەی پاك بوونەوەی گیانی گوناهبار . (۲) بە پێی باوەڕی دیانە کاتۆلیکەکان ئەو جێگەیـەیە کـە گیان تێـدا پـاك دەکرێتەوە لە پاش مـردن بە ئازار دانێکی دیاری کراو لەلایەن خوداوە.

**مەجاز (مجاز)** : ووشــەیێك لـە جێی ڕاستەقینەی خـۆی بە کار نەهێنرێو بۆ مانایێکی‌تر وەربگیرێ بە مەرجێـك پێـوەندییێك بـە مانـا بنچینەیی‌یەکە بیانبەستێتەوە .

**مەجازی** : نیسبەتە بۆ (مەجاز) ، دژی ڕاستی ، بڕوانە (مەجاز) .

**مەجال (مجال)** : مـاوە ، جێی بزووتنەوەو گەڕان .

**مەجەرە (مَجَرّه)** : کەهکەشان.

**مەجووسی** : ئاگر پەرست ، ڕۆژ پەرست ، گاوور .

**مەجبوور (مجبور)** : ناچـــار ، بێچارە ، ئـەو کەسەی کـاری لە دەست خۆی نەبێ ، ئەو کەسەی بە زۆر کارێکی پێ‌بکرێ .

**مەجرا ( مجری )** : ئەو جێیەی ئاوی پێدا دەڕوا .

**مەجزووب (مجذوب)** : ڕاکێشراو ، ئەو کەســەی گرفتــارو شــەیدای عیشق بووە .

**مەجلیس (مجلس)** : جـــێی دانیشـتن ، جـێی کۆبوونـەوەی خەڵك ، جێی کۆبوونەوەی کۆمەڵە کەسێك بۆ گفتوگۆو وورد بوونەوە یا میوانداریو ڕابواردن .

**مەجمەر (مجمر)** : (۱) بخوردان ، (۲) ئاتەشخانە ، ئەو شتەی ئاگری تێدا دەکرێتەوە .

**مەجنوون (مجنون)** : (۱) قەیسی عامیری ، خەڵکی نەجـد بووە ، لە ڕاستیدا شێت نەبووە ، بەڵکو پلەی دڵـــداریو خۆشەویســـتیی بەرامبـەر لەیلا وای لێ کـــردووە «مەجنوون»و «مەجنـوون لەیلا»ی پێ‌بڵێن ، لەگەڵ لەیلادا ئامۆزا بوون گۆیا پێکەوەش گـەورە بوون ، بەڵام کە ویسـتی لەیلا بخـوازێ بـاوکی نەیدایێ ، سەری خۆی هەڵـگرتو کەوتە شیعر ووتن ، لە بیابانەکانی شـامو نەجـدو حیجـــاز لەگـەڵ کێوییاندا دەبینرا ، تا ڕۆژێك بـــە مردوویی لـە ناو کۆمەڵـە بەردێك دۆزرایـەوە . ئەســـمەعی دەڵێ

مەجنوون نەبووە ، جاحیزیش دەڵێ هەر شاعیرێکی نەناسراو شیعرێکی ووتبێ‌و ناوی لەیلای تێدا بووبێ خراوەتە پاڵ مەجنوون ، گۆیا لە ساڵی (٦٨٨ز) مردووە ، بڕوانە (لەیلا) . (٢) شێت ، دێوانە ، شەیدا .

**مەحاق (محاق)** : سێ شەوی دووایی مانگی قەمەری کە مانگ نابینرێ .

**مەحال (محال)** : (١) نابوون ، ناشێ ، شتێك کە ڕوودانی نەبێ . (٢) قسەی بێ سەرو پاو بێ مانا . (٣) کۆکردنەوەی دوو شتی پێچەوانەی یەکتری لە شتێکداو لە کاتێکدا . (٤) ناهەق ، خووار .

**مەحەببەت (محبّت)** : دۆستی ، خۆشەویستی ، دڵداری ، مەیل بۆ شتێکی کە خۆشی بگەیێنێتە ئادەمزاد .

**مەحەك (محك)** : بەردە زێڕ ، بەردی زێڕ ، بەردێکە بۆ زانینی عەیاری زێڕو زیو بە کار دەهێنرێ .

**مەحەل (محل)** : جێ ، جێگە .

**مەحەللە (محلّه)** : گەڕەك ، کووچە ، زوقاق ، کۆڵان ، بەشێك لە شار .

**مەحوو (محو)** : سڕینەوە ، نەهێشتن ، چوواندن ، قەلاچۆ کردن ، لە ناو بردن .

**مەحبەس (محبس)** : زیندان ، بەندیخانە ، گرتووخانە ، حەپسخانە .

**مەحبووب (محبوب)** : دۆست ، خۆشەویست ، دڵدار ، مەعشووق .

**مەحبووبە (محبوبە)** : مێی (مەحبووب)ە . بڕوانە (مەحبووب) .

**مەحجووب (محجوب)** : (١) لە ناو پەردە ، لە پشت پەردە ، شارراوە ، داپۆشراو ، نادیار . (٢) شەرمن ، بەحەیا .

**مەحرەم (مَحْرَم)** : کەس‌وکاری نزیك ، ئەندامانی بنەماڵە ، ئەوانەی نابێ شووکردن لە نێوانیاندا ببێ .

**مەحرەمان** : کۆی (مەحرەم)ە ، بڕوانە (مەحرەم) .

**مەحرووم (محروم)** : نائومێد ، بێ‌بەش ، بێ‌بەهرە ، دوور لە هەموو خێرو خۆشی‌یێك .

**مەحزەر (محضر)** : (١) ئەو جێیەی کەسی لێ دەبێ ، جێی ئامادە بوونی کەسێك . (٢) دەرگا . (٣) جێی نووسینی گفتوگۆی کۆبوونەوەو فەرمان ، دەفتەری تۆمار کردنی هەموو فەتواو باوەڕنامەیێك .

**مەحشەر (محشر)** : جێی کۆبوونەوەی هەموو خەڵك ، ڕۆژی حەشر ، ڕۆژی قیامەت .

**مەحشەر میسال (محشر مثال)** : وەکو مەحشەر ، وەکو ڕۆژی حەشر ، بە وێنەی مەحشەر .

**مەحفەل (مَحفل)** : کۆڕ ، ئەنجومەن ، جێی کۆبوونەوە ، جێی کۆبوونەوەی دۆست‌و برادەران .

**مەحکەمە (محکمه)** : دادگا ..

**مەحمەل (مَحْمَل)** : (١) کەژاوە ، عەرەبانە ، ئـەو شتەی کەسێك یا شتێك بار بکا . (٢) ئـەو دیاریو خەڵاتانەیـە کە هەموو ساڵێك لە سـەردەمی حـەجدا لـە قاهـیرەو ئەستەموولەوە دەنێررایە مەککە .

**مەحموود (محمود)** : (١) ڕەنگە مەبەس مەحمـوود پاشـای مـیری سـلێمانی بێ لە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەمدا واتـە سـەردەمی ژیانی نالی لە سلێمانی ، مەحموود پاشا یەکێـكبووە لـە میرە هـەرە بەهێـزەکانی ئـەم ناوچەیـە ، لەم بابەتەوە کلۆدیۆس ڕیچ دەڵێ : قەت بە بیرمدا نەهاتووە لە ڕۆژهەڵاتدا پیـاوی وا ببینـم . (٢) سـوڵتان مەحمـوودی غەزنەوی گەورەتـرین پادشـایانی زنجیرەی غەزنـەوییانی ئێرانە ، هیندستانی گرتو بوتەکانی سومنـاتی تەفروتـوونا کـرد ، فـیردەوسی شـانامەی بـۆ ئـەو نووسیوەتەوە ، لە سـاڵی (١٠٣٠ز) کۆچی دووایی کردووە. (٣) پەسند، مەدحکراو ، پێدا هەڵووتراو .

**مەختووم (مختوم)** : (١) مـۆر کـراو ، نەکـراوە ، داخـراو . (٢) ئەنجام ، بەئەنجام گەیشتوو .

**مەخزەن (مخزن)** : گەنجینـە ، عەمار ، جێی پاراستنی ماڵ .

**مەخـزەنی ئەسـرار ( مخـزن الاسرار )** : (١) گەنجی ڕاز، خەزنەی نهێنی . (٢) کینایەتـە بۆ ئەندامی مێیینەی ژن . (٣) ناوی بەرهەمی یەکەمی «خەمسـەی نیزامی»یە کە بریتییـە لـە پێنـج شـاکارە ئەدەبییەکەی ڕۆژهەڵات بـە زمانی فارسی : ١ـ «مخـزن الاسرار» . ٢ـ شیرینو خوسرەو . ٣ـ لەیلاو مەجنـوون . ٤ـ هـەفت پەیـکەر ( بەهرامنامە ـ هـەفت گونبەد ) . ٥ـ ئەسکەندەرنامـە ( شەرفنامە ـ ئیقبالنامە ) .

**مەخزەنی تەبع** : چاپخـانە ، جێگەیچاپ ، شوێنیچاپ .

**مەخزوون (مخزون)** : شـتی عەمارکـراو ، شـتی لە گەنجینـە دانراو ، شتی کۆکراوەو پارێزراو .

**مەخسـووس ( مخصـوص )** : تایبەتی ، نویشك ، هەڵبژێرراو .

**مەخفی ( مخفی )** : داپۆشـراو ، شارراوە ، نادیار ، پەنهان .

**مەخمەر** : بڕوانە (مەخمەل) .

**مەخمەل (مَخمل)** : قوماشـێکی نەرمی لۆکەیی یا ئاوریشمییە .

**مەخموور (مخمور)** : مەسـت ، سەرخۆش .

**مەدار (مدار)** : جێی سووڕانەوەو بزووتنەوە ، ئەو شتەیە کە شتێك لە چووار دەوریدا دەسووڕێتەوە ، ئـەو جێیەیـە کە شـتێك دەورەی دەدا ؛ لـە زاراوەی جوگرافیـادا بریتییـە لەو خەتەی کـە ئەستێرە گەڕۆکەکان تێیدا بە دەوری ڕۆژدا دەسووڕێنەوە ؛ دائیرەیێکی نادیارە لەسەر ڕووی زەوی موازی خەتی ئیستیوایە .

**مەدام ـ مودام (مُدام)** : (١) مەی، شـەراب . (٢) ئەو بارانـەی زۆر دەخایێنێ. (٣) هەمیشـە ، هەردەم، هەرکات .

**مەدەد (مَدَد)** : (١) یاریـــدە ، یارمەتی ، کۆمەك ، بەهانا گەیشتن ، بە هاوار گەیشتن لە کاتی تەنگانەدا. (٢) دۆســـت ، یاریـــدەدەر ، فەریادڕەس .

**مەدەدکار** : بڕوانە ( مـەدەد ) .

**مەدەنی ( مدنی )** : (١) خـەڵکی شاری مەدینە . (٢) شارستانی .

**مەدینە (المدينة)** : (١) شـارێکە لە حیجاز لـە باکووری ڕۆژئـاوای وولاتـی عـەرەبی سـوعوودی ، لە خاکێکی پڕ لە ئاوو میـوەدایە ، لە پێشانا ناوی (یەسریب = يثرب) بـوو ، محـەمەد پێغەمبـەری موسـوڵمانان لـە (٦٢٢ز) ڕووی تێکردو بوو بـە مەڵبەندی پەیـامی ئیسلام ، هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد (٦٣٢ز) ، پایتـەختی دەوڵەتی ئیسلام ، هەر لەوێش کۆچی دوایی خەلیفەکانی پێشووی ڕاشیدیندا ، مەدینـە لەوکاتەوە باوی نەما کە پایتەخت چووە شـام ، لە سـاڵی (١٥١٧ز) کەوتـە ژێـر چنـگی عوسمانییەکان ، لە ساڵی (١٩١٦ز) لـە ژێردەسـتی عوسمانییـەکان دەرچوو ، لە ساڵی (١٩٢٤ز) کەوتە ناو وولاتـی عەرەبی سـوعوودی ، مەدینـە دووەمین شاری پـیرۆزی موسوڵمانانە لە پاش مەککە ، مەزارو مزگـەوتی پێغەمبەرو گـۆڕی ئەبوو بەکرو عومەری لێیە . (٢) شار .

**مەدینـەی مونـەووەرە (المدينـة المنورة)** : بڕوانە (مەدینە) .

**مەدح (مَدْح)** : ستایش ، پێـدا هەڵوتن ، دەرخستنی تەنیا لایەنی چاکەی کەسێك .

**مەدرەسە (مدرسە)** : دەبستان ، قوتابخانە ، جێی خوێندن ، جێی دەرس ووتنـەوە ، ئـەو بەشـەی مزگـەوت کـە زانسـتییەکانی موسوڵمانی تێدا دەخوێنرێ .

**مـەدعوو ( مَدعُـوّ )** : (١) بانـگکراو ، دەعـوەت کـراو . (٢) باسکـراو .

**مەدمەع (مَدمَع)** : چاو ، جێگەی فرمێسك ، ئەو جێیەی فرمێسکی لێ هەڵدەقوڵێ .

**مەرەز (مرض)** : نەخۆشـــی ، ناسافی .

**مەرتەع (مَرتَع)** : لـــەوەڕ ، سەوزایی ، ئەو جێیەی سەوز بێو گیای لێبێ .

**مەرجان** : بەردێـــکی سـووری مەیلەو پەمـەیی بەنرخە لـە جۆرە جانەوەرێکی زەریایی دەردەهێنرێ ، ئەو جانەوەرە لە گیا دەکا هەر وەکو ئـەویش لـە زەوی‌ی بـن زەریـا چەسپاوە ، لە کۆندا وایان دەزانی کە یەکێـکە لە گیـاکانی زەریـا . جۆرێکی مەرجان لە زەڕنگەریدا بە کار دەهێنـرێ بۆ دروست کـردنی خشڵو شـتیتری هونـەری بە نرخ .

**مەرجەع (مَرْجَع)** : جێگەی گەڕانەوە ، جێگەی هاتنەوە ، ئەو جێگەیەی کە پێویستە بەسەری بکەیەوەو بچیەوە ناوی ؛ سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبو هونەرو زانستی .

**مەرحەمە (مَرْحَمَت)**: میهرەبانی، بەزەیی پێدا هاتن ، ڕەحمەت .

**مەرخ** : درەختێکە دارەکەی زۆر زوو ئاگر دەگرێ لەبەر ئەوە ئاگر گیرەشی پێ‌دەڵێن .

**مەردان** : کۆی (مەرد)ە ، پیاو ، نێرینە ، کینایەتە بۆ ئازاو دلێر ـ **مەردی مەردان** : پیاوی یەکجار ئازاو دلێر ئەوەی لە سەرووی پیاوانی ترەوەیە .

**مەردوم (مَرْدُم)** : ئادەمزاد ، ئادەمیزاد ، ئینسان ، خەڵك .

**مەردومی بینایی** : بیلبیلەی چاو ، ئینسانی چاو .

**مەرز (مَرز)** : زەوی ، قەراخی زەوی ، کەناری باخ ، حەد ، سەر حەد ، سنوور .

**مەرزو بووم** : لە دوو ووشە پێك‌هاتووە ، مەرز ـ بڕوانە (مەرز)؛ بووم ـ بڕوانە (بووم) .

**مەرکەز (مرکز)** : (١) ناو ، دائیرە، نوختە،ناوەڕاستی دائیرە ؛ ناوەند . (٢) جێگەی ژیانی کاربەدەستی گەورەی وولات .

**مەرگ** : مردن ، لە ناو چوون .

**مەرهەم (مَرْهَم)** : هەموو دەرمانێکی بۆ برین بە کار بهێنرێ .

**مەڕ** : حەیوانێکی ئالیك خۆرە لە شیرو خوریو گۆشتو پێستەی سوود وەردەگیرێ .

**مەڕمەڕ (مَرْمَر)** : جۆرە بەردێکە لە ئەنجامی کۆبوونەوەی پارچەی بەللووری دروست دەبێ ، لە بەر ئەوەی شتی بێگانەی تێ دەکەوێ خەتو پەڵەی ڕەنگاوڕەنگی دەکەوێتێ ، چاکترین مەڕمەڕ ئەوەیە کە ڕەنگی سپی بێ ، لووس‌و مشتوماڵ دەکرێو شتی بە نرخی لێ دروست دەکرێ ، مەڕمەڕ کینایەتە بۆ شتی یەکجار لووس‌و سفت ، لەگەڵ سنگو مەمکی نازەنینان بەرامبەرو بەراوورد دەکرێ .

**مەڕوا** : بڕوانە (سەفاو مەڕوا) .

**مەڕوە** : بڕوانە (سەفاو مەڕوا) .

**مەزار (مزار)** : (١) زیارەتگا ، جێی زیارەت کردن . (٢) گۆڕ ، قەبر ، ئارامگا .

**مەزایا (مَزایا)** : کۆی (مەزیەت = مزیّت)ە ، زۆریو زیادە لە ڕووی زانستی یا هۆش‌و بیر یا چاوتێری یا ئازاییو دلێری یا شەرەف ، ئەوەیە کە کەسێك یا شتێك بە هۆی ئەوەوە بەرزترو دیارتر بێ لە ناو کەسانی وەك خۆی .

**مەزە (مَزَه)** : (١) تام ، هەست

کردن بە سوێری و تاڵی و شیرینی و ترشی لە کاتی خوواردن و خواردنەوەدا (٢) ئەو خواردنەیە کە لەگەڵ عەرەق و شەراب و خواردنەوەی تردا دەخورێ .

**مەزبەلە (مَزْبَلە)** : گووفەك ، زبڵخانە ، جێی ڕشتنی زبڵ .

**مەزرەع (مَزْرَع ــ مزرعە)** : کێڵگە ، جێی کشتوکاڵ .

**مەزهەب (مَذهَب)** : ڕێ و ڕەووشت ، باوەڕ .

**مەزهەبی دەی** : جەژنێکی مەجووسییانە لە مانگی دەیدا دەبێ .

**مەزهەر (مَظهَر)** : جێی دیار بوون ، جێی ئاشکرا بوون .

**مەساعی (مساعی)** : کۆی (مەسعا = مسعی)یە ، تێکۆشان ، خەبات کردن ، هەوڵدان بۆ هێنانەدیی ئامانجێك .

**مەساف ( مصاف )** : کۆی (مەسەف = مَصَف)ە ، جێی ڕیز بوون و مەیدانی جەنگ ، جێگەی بە ڕیز وەستانی سەرباز و ئەفسەران .

**مەسەل (مَثَل)** : (١) وەکو ، سیفەت . (٢) قسە ، پەند ، پەندی پێشینان ، قسەی نەستەق ، قسەی داهێنراو .

**مەسەلی حاڵ** : زمانی حاڵ ، وەزع .

**مەسیح** : بە لای دیانەکانەوە ئەقنوومی دووەمە لە سێ کوچکەی پیرۆزو کەلیمەی خودایە: کە لە مریەمی کیژدا خۆی نواندووە بۆ ڕزگارکردنی خەڵك ، لە سەردەمی ئوگوستۆسی قەیسەر لە بێت لەحم لە دایك بووە ، لە ناسیرە ژیاوە تا تەمەنی سی ساڵی ، لە بەر ئەوە ناسیرییان پێ ووتووە ، ئینجا دەستی کردووە بە بڵاو کردنەوەی بیروباوەڕی هێزو توواناای خودا ، بۆ ئەم مەبەسە موعجیزاتی هێناوەتەوە، لە سێدارە یاخود لە چەلیپادرا ، بەڵام لە پاش سێ ڕۆژ هەڵسایەوەو دەستی کردەوە بە بڵاو کردنەوەی پەیامی پێغەمبەری ، کلیسەی دامەزراند ، هەواڵی ژیانی عیساو جەوهەری پەیامی پێغەمبەری لە ئینجیلدا نووسراوە .

**مەسیحایی زەمان** : مەسیحی ئەم سەردەمە ، مەسیحی هەموو دەورو زەمانێك ، ئەو کەسەی موعجیزاتی وەك مەسیح دێنێتەوە ، بڕوانە (مەسیح) .

**مەسئەلە (مَسْئَلە)** : پێویست ، حاجەت ، ئەو شتەی دەخوازرێ ، تیۆری .

**مەست ( مَسْت )** : بڕوانە (سەرخۆش) .

**مەستان** : کۆی (مەست)ە ، بڕوانە (مەست) .

**مەستانە** : وەکو مەست ، بڕوانە (مەست) .

**مەستی** : نیسبەتە بۆ (مەست) ، بڕوانە (مەست) .

**مەستوور** : (١) داپۆشراو ، لە پشت پەردە . (٢) داوێن پاك ، بەناموس ، بەحەیا . (٣) ئەندامی مێینەی ژن .

**مەستوورە** : (١) ناوی ماه شەرەف خانمی ئەردەڵانی کوردستانی‌یە کچی ئەبولحەسەن بەگی کوڕی محەمەد ئاغایە ، خێزانی خوسرەو خانی والی‌ی کوردستانی ئێران بووە ، لە ساڵی (١٨٠٥ز) لە شاری سنە لە دایك بووە ، ژنێکی یەکجار جووان‌و شۆخ‌وشەنگ بووە ، شیعری بە کوردی‌و فارسی هەیە ، زۆربەی ئەو شیعرانە لە بابەت دلداری‌یەوەن بەتایبەتی شیعرە کوردی‌یەکانی ( بە شێوەی گۆرانی ) یەکجار بەسۆزن . خوێندەوارو ڕۆشنبیرێکی چاك بووە ، شارەزایی لە زانستی‌یەکانی ئایینی‌دا بووەو دەستێکی درێژیشی لە زانستی‌ی مێژوودا بووە . شیعرە فارسی‌یەکانی لە ساڵی ١٩٢٥ لە تاران لە چاپ دراوە ( دیوان ماه شرفخانم کردستانی ، لناشره آقای حاجی شیخ یحیی معرفت ، تهران ، ١٣٠٤ ه . ش ) ، شیعرە کوردی‌یەکانی لە دەستنووسێکدایە لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٠دا نووسراوەتەوە ئێستاکە لە ئێرانەو هێشتا چاپ نەکراوە ، لە بارەی مێژووی بنەماڵەی ئەردەڵانەوە کتێبێکی داناوە لە ساڵی ١٩٤٧ لە سنە لە چاپ دراوە ( تاریخ اردلان ، لناشره ناصر آزاد پور ، سنندج ، ١٣٢٦ ه . ش ) . مەستوورە هاوچەرخی سولتان خانمی ئەردەڵانی بووە کە خوشکی خوسرەو خانی والی‌یە ، ئەمەش شاعیر بووەو دەستە خوشکێکی نزیکی مەستوورە بووە ، ساڵێك پێش کۆچی دوایی مەستوورە هاتووە بۆ سلێمانی لە ١٨٤٧دا کۆچی دوایی کردووەو لە گردی سەیوان نێژراوە ، دەبێ جۆرە پێوەندی‌یێکی لەگەڵ نالی‌دا بووبێ . (٢) مێی (مەستوور)ە ، بڕوانە (مەستوور) .

**مەسجید (مسجد)** : مزگەوت ، جێی سوجدە ، جێی عیبادەت .

**مەسرەع ( مصرع ـ مصراع )** : (١) لایێکی دەرگا . (٢) نیوە دێڕی شیعر لە دێڕێکدا .

**مەسروور (مَسرور)** : شاد ، شادمان ، گوشاد ، خۆشحاڵ ، کەیف خۆش .

**مەسڵەحەت (مَصلَحَت)**: ئەوەی دەبێتە هۆی چاکەو سوودو قازانج‌و ئاسایشی ئادەمزاد .

**مەسلەك (مَسلَك)** : ڕێ ، ڕێگە ، ڕەووشت ، تەریقەت .

**مەسلوول ( مسلول )** : سیفەتە بۆشیر ، ئەو شیرەی کە برینی کوشندە دبێ . (٢)ئەو کەسەیە کە گرفتاری نەخوشی‌ی سیل‌و وەرەم‌و ئیسقا دەبێ .

**مەسکەن ( مَسکن )** : خانوو ، ماڵ ، جێی ژیان ، مەڵبەند .

**مەسمووع (مسموع)** : گوێ

یوو ، ئەو شتەی دەبیستری .

**مەسنەد ( مَسنَد ) :** ئەو شتەی پاڵی لە سەر دەدرێتەوە ، پلەی بەرز ، مەقام .

**مەسنەوی ( مثنوی ) :** (١) یەکێکە لە بەرز ترینی بەرهەمی شیعری عیرفانی زمانی فارسی لە دانانی مەولەوی بەلخی کە بە **جەلالە ددینی ڕۆمی** ( ١٢٠٧ ز ـ ١٢٧٣ ز ) بە ناو بانگە ، جگە لە مەسنەوی غەزەلیشی هەیە بە ناوی مورشیدی گەورەی خۆی **شەمسی تەبریزی‌یەوە داناوە** . (٢)ئەو شعرەیە نیوە دێڕی یەکەم‌و نیوە دێڕی دووەمی هەموو دێڕە شیعرێکی لە سەر یەك قافیە بێ ، وەکو شیعرەکانی شانامەی فیردەوسی‌و خەمسەی نیزامی‌و **مەسنەوی‌ی جەلالە ددینی ڕۆمی‌و مەم‌و زینی ئەحمەدی خانی** ، شیعری ( موزدەوەج = مزدَوَج )یشی پێ دەڵێن .

**مەشرەب ( مَشرَب ) :** (١)زەوق مەیل ، خەیاڵ ، هەوای نەفس ، شێوەی بیر کردنەوە ، ئوسلووب . (٢)جێی ئاو خواردنەوە .

**مەشعەلە ( مَشعَل ـ مَشعَلە ) :** چرادان ، قەندیل ، شاپلیتە .

**مەشغلە (مَشغَلە) :** کارو پیشە، کارو کاسبی ، ئەوەی ئادەمزاد خەریك دەکا .

**مەشغوول ( مَشغول ) :** ئەوەی لە کاردایە ، ئەوەی سەرگەرمی کارە .

**مەشق ( مَشق ) :** خۆ فێر کردنی یاری‌یەکانی وەرزین یا بە کار هێنانی چەکی جەنگی یا هەر مەسەلەیێکی زانستی‌و شتی تریش ؛ نووسین ، تەمرین .

**مەشکوور ( مشکور ) :** ئەو کەسەی سوپاس دەکرێ ، ئەو کەسەی کارو کردەوەی پەسند دەکرێ ، سوپاس ووتن .

**مەشهەد ( مَشهَد ) :** (١)جێی ئامادە بوون ، ئەو جێیەی ئادەمزادی لێ دەبێ ، جێی شایەدی‌دان ، شایەدگا . (٢)مەزارو ئارامگای کەسی وەلی‌و ئیمام‌و پیاوی خودا .

**مەشهوور ( مَشهور ) :** بە ناو ، بە ناوبانگ ، ناودار ، ناسراو لە ناو خەڵکی‌دا .

**مەعاریج ( معاریج ـ معارج ) :** کۆی ( میعراج = مِعراج )ە ، بڕوانە ( میعراج ) .

**مەعاریف ( مَعارِف ) :** (١) زانستی ، زانستی‌یەکان ، زانیاری . (٢) خەڵکی ناسراو ، داناو زانا . (٣) ناسیاو نزیك .

**مەعبەر (معبر) :** جێی پەڕینەوە، جێی ڕۆیشتن ، هەموو شتێکی کە بەهۆی ئەوەوە ئادەمزاد یا شتی‌تر لە ئاوو ڕووبار بپەڕنەوە .

**مەعدەن (معدن)** : (١) کان ، جێی فلزو بەرد لە ژێر زەوی یا لە سەر زەوی . (٢) ناوەندی شت . ناووکی شت ، ناخ . (٣) نەژاد ، بنیاد ، ئەسڵ .

**مەعدووم (مَعدوم)** : گوم‌بوون ، گوم‌بوو ، نەبوون ، نەبوو .

**مەعرەز (معرض)** : پیشانگا ، جێ پیشاندانی شتێك ، جێی دەرچوونی شتێك ، جێی نواندن.

**مەعرووف (معروف)** : (١)ناسراو، بەناوبانگ . (٢) چاکەو کاری چاك ، کردەوەی باش .

**مەعزوور (مَعذور)** : بەهانەدار ، ئەو کەسەیە کە بەڵگەی بە دەستەوەیە بۆ چاوپۆشین لە کارێکی کە دەبوو بیکاو نەیکرد .

**مەعلووم (مَعلوم)** : دیار ، ئاشکرا ، زانراو ، دژی مەجهوول .

**مەعموور (مَعمور)** : ئاوەدان ، تەعمیرکراو ، دژی کاوول‌و کەلاوە .

**مەعنا (معنی)** : مانا ، ناوەرۆك ، ناوەرۆکی قسە ، مەبەس .

**مەعنی ئارا** : قسەی جووان ، مانای جوان ، ناوەڕۆکی جووان ،

**مەغاك (مَغاك)** : قووڵ ، چاڵ ، جێی قووڵ .

**مەغروور (مَغرور)** : فریو خوواردوو ، لە خۆبایی ، ئەو کەسەیە کە پشتی بە ناهەق بەستووە .

**مەغز (مَغز)** : (١) مێشك ، ئەو ماددە نەرم‌و ڕەنگ خاکی‌یەیە کە لە ناو جومجومە دایە . (٢) مێشك ، ئەو ماددە چەورەیە کە لە ناو لوولاق‌و ئێسقان‌دایە . (٣) ئەو ماددەیەیە کە لە ناو ناووکی هەندێ میوەو ناوەوەی هەندێ میوەی تردایە .

**مەغشووش (مَغشوش)** : ناپاك ، غەشدار ، شتێك شتێکی‌تری تێکەڵ کرابێ وەکو زێڕو پارەی قەڵب ، ووتەو ووتاری نائەدیبانە .

**مەغفەر (مَغفر ـ مغفرە)** : کڵاوی ئاسن ئەوەی جەنگاوەر لە سەری دەکا ، زرێی کە لە ژێر کڵاوی ئاسن لە سەر دەکرێ .

**مەغفەرەت ( مَغفرت )** : لێ‌بووردن ، لێ خۆش بوون ، گەردەن ئازاد کردن ، چاوپۆشین لە گوناهی کەسێك .

**مەقام (مَقام)** : (١) جێگە ، جێی ژیان ، جێی وەستان ، جێی پێ ، بارەگا. (٢) پلەی کۆمەڵایەتی ، پایە، ڕوتبە . (٣) ئاهەنگ ، گۆرانی ، پەردەی مۆسیقا . (٤)ئەو جێگەیەیە لە کەعبە گۆیا ئیبراهیم نوێژی لێ‌کردووە .

**مەقامات** : کۆی (مەقامە = مَقامە)یە ، (١) کۆڕ ، کۆبوونەوە ، خوتبە ، گێڕانەوە ، حیکایەت‌کردن. (٢) لە زاراوەی سۆفیزم‌دا ، ئەو قۆناغانەیە کە پێویستە ( سالیك ) بە تێکۆشان‌و جیهادو ڕیازەت بیانبڕێ ، حەوت قۆناغی ناسراوی

ســولووك بریتییــه لــه : تۆبــه ، وەرەع ، زوهــد ، فەقــر ، ســەبر (صبر) ، تەوەكــول (توكل) ، ڕەزا (رضا) .

**مەقبەرە (مقبره)** : گـــــۆڕ ، گۆڕستان ، قەبر ، قەبرستان .

**مەقتوول (مَقتول)** : کوژراو .

**مەقدەم (مَقدَم)** : لــه ســەفەر گەڕانــەوە ، کاتی هاتــن ، کــاتی پێخستنە سەر زەوی .

**مەقسەد (مقصد)** : (١) مەبەس ، ئەوەی دەخــووازرێ ، ئــەوەی دڵ ئارەزووی دەکــا . (٢) جێ‌یێك کە ئادەمزاد بیەوێ بیچێنێ ، جێ‌یێك کە ئادەمزاد ئارەزووی بکا .

**مەقسوود (مقصود)** : مەبەس ، بڕوانە (مەقسەد) .

**مەکان (مکان)** : جێگە .

**مەکین (مکین)** : جێ‌گر ، ئەوەی جێی خۆی گرتــووە ، خاوەن پلەو جێگەی بەرز .

**مەکووك (مکوك)** : ئالەتێــــکی بزوێنە داوی لە ناو هەڵکراوەتەوە لە دەسگای چنین‌و جۆلاییو مەکینەی دروومان‌دا بە کار دەهێنرێ .

**مەکتووم (مکتوم)** : ئـــــەوەی شارراوەتەوە ، ئەوەی داپۆشراوە ، ئەوەی پەنهان‌و نهێنی کراوە .

**مەکر (مکر)** : فریــو ، فێــڵ ، حیلە ، تەفرە ، جادوو ، سیحر ، ئەفسوون .

**مەکسوور (مکسُور)** : شــکاو ، ئەوەی شکێنراوە .

**مەککە (مکة المکرمة)** : شــارێکی پــیرۆزی موســوڵمانانە لــە وولاتی عەرەبی سوعوودی‌دایــە ، محەمەد لەوێ لەدایك بــووە ، جێــگەیێکی بازرگــانیی گرنــگ بوو لــە پێش ئیسلام‌دا . لــە (٦٩٢ز) لە دەست ئومەوی‌یەکان‌دا بــوو ، لە (٩٣٠ز) قرمیتی‌یەکان وێرانیان کردو بەردی ڕەش (الحجر الاسود) یان تالان‌کرد ، لە (١٥١٧ز) عوسمانی‌یەکان داگیریان کرد ، ئنجا وەهابی‌یەکان ( ١٨٠٣ — ١٨١٣ ز ) ، شەریف حوســێن لـــە (١٩١٦ز)دا جاڕی سەربەخۆیی‌دا ، لە ساڵی (١٩٢٤ز)دا بوو بە شارێك لــە شــارەکانی وولاتــی عــەرەبی سوعوودی ، حەرەم کە بریتی‌یە لە کەعبــەو بــەردی ڕەش لەوێ‌یــە ، هەمــوو ســـاڵێك بــە هــەزاران موسوڵمانانی هەمــوو زەوی ڕووی تێ دەکەن بۆ حەج .

**مەگەر (مگر)** : تیپـــی جــوداکردنەوەیە بە مانــای ، ئەو نەبێ ، تەنیا ، جگە ؛ لە کــاتی گومانیش‌دا مانای (دەبێ)یە .

**مــەلا (مَــلا)** : خوێنـــــدەواری سەردەمی کۆن لــە کوردەواری‌دا ، ئــەو کەســـــەیە کــە خەریــــکی زانستی‌یەکانی ئایینی موسوڵمانی‌یە ، ئــەوەی زانســـتی‌یەکانی ئایینی موســوڵمانی دەڵێتــەوە ، ئــەوەی پێویســتی‌یە گیانی‌یــەکانی ئایینــی موسوڵمانی دێنێتەدی .

**مەلاحەت (مَلاحت)** : پڕ خۆ یوون ، جووانی .

**مەلال (مَـلال)** : مەلـــوول ، مەلـوولی ، دلتەنگی ، بێـزاری ، ڕەنجەڕۆیی .

**مەلاییك (ملائك)** : کـۆی (مەلەك = مَلَك)ە ، فریشتە ، سرووش .

**مەلەکولـموت (مَلَك المـوت)** : عیزرائیل ، ناوی فریشتەی مردن‌و ڕووح کێشانە لە ئایینی جوولەکەو موسوڵمانانەدا .

**مەلیح (مليح)** : (۱) جووان ، ڕوو جووان . (۲) سەوزە ، ئەسمەری گەنم ڕەنگی کاڵ .

**مەلعەبە (ملعبة)** : (۱) هەمـــوو شتێکی کە یاری پێ بکرێ ، بووکە شووشـەو هەمـوو شـتێکی کـە منداڵان یاری پێ دەکەن . (۲) ئەو کراسە بێ قۆڵەیە کە منداڵان لە کاتی یاری کردندا لەبەری دەکەن .

**مەلفووف (مَلفوف)** : لوولدراو ، پێچـراو ، شـتێك بە شـتێکی‌تر بپێچرێ .

**مەم** : بڕوانە (مەمك) .

**مەمە** : بڕوانە (مەمك) .

**مەمك** : ئەندامێـکی جووتـە لە لەشی ژن‌و حەیوانی مێدا ، جێگەی شیرە ، لـە ئادەمزاددا گەرمتـرین‌و پڕ هەستترین‌و خۆشترین ئەندامی مێینەی ژنانـە لە پاش ناوگـەڵ‌و سمت .

**مەملەکەت (مملكت)** : تووانایی‌و پلـەی بـــەرزی پادشـــا ، بەڕێوەبەرایەتی‌ی وولات ، وولات ؛ ئـەو وولاتـەی مەلیـك‌و پادشـا فەرمانڕەوایی تێدا دەکەن .

**مەملووك (مملوك)** : بەنـــدە ، غـولام ، ئـەو کەسـەی بە پـارە دەکڕدرێ ، کەسی بە پارە کڕاو .

**مەنیش (مَنِش)** : (۱) خـوو ، خـوو و ڕەووشـت ، سـروشت ، تەبیعەت . (۲) تووانایی ، کۆشش ، هەوڵ‌و تەقەلا .

**مەنتیق (مَنْطِق)** : (۱) قســـە کردن ، ووتار ، تـرازووی قسە . (۲) نـاوی زانستی‌یێکە بەهـۆی دەسـتووری ئـەوەوە ئادەمـزاد دەتووانێ خۆی لە هەڵە بپارێزێ لە بیرکردنەوە یا لێکدانەوەدا ، دەڵێن ئەرستۆ دەستووری ئەم زانستی‌یەی دۆزیوەتەوە .

**مەنجەنیق (منجنيق)** : چەکێکی جەنگی‌ی کۆن بووە بـۆ هاویشتنی بەرد یا گولۆڵەی ئاگـر بـە کـار هێنراوە .

**مەندەبوور** : (۱) خەمبـــار ، خەمناك ، سەرکز ، بێ‌نەوا ، لێو بە بار ، بەدبـەخت . (۲) چاوبرسی ، چاوچنۆك .

**مەندەل (مَنْدل)** : (۱) داری بۆن خۆش . (۲) ئەو جفزەیە کە لە سەر ئەرز دەکێشرێ‌و خەڵـکی لە ناوی دادەنیشن بۆ بانگ کـردنی ڕووح‌و قسەکردن لەگەڵی‌دا .

**مەنزەرە (مَنْظَرە)** : چاوئەنداز ، دیمەن ، ئەو جێیەی چاو نیگاو سرنج ڕادەکێشێ .

**مەنزوور (مَنْظُور)** : ئەوەی دەکەوێتە بەرچاو ، دیار ، بینراو ، ئەوەی دەبینرێ .

**مەنزیل (منزِل)** : خانوو ، جێگەی دابەزین و دانیشتن و ژیان ، سەرا .

**مەنشوور (مَنْشُور)** : ئاگاداری، فەرمان ، فەرمانی پادشا ، فەرمانی دەوڵەت ، نامەی کراوە .

**مەنع (منع)** : ڕاگرتن، وەستاندن، وەستاندنی کەسێك لە کارێك یا شتێك .

**مەننان (مَنّان)** : (١) ئەوەی چاکە دەکا ، ئەوەی چاکەی یەکجار زۆر دەکا ، **خودا** .

مەنهی (مَنْهِی) : ئەوەی وازی لێ هێنراوە ، ئەوەی فڕێ دراوە ، ئەوەی نەهی لێ کراوە .

**مەوت (مَوْت)** : مردن ، مەرگ .

**مەوج (مَوْج)** : شەپۆل ، جموجۆڵی و بزووتنەوەی نائاسایی ئاو .

مەوجوود ( مَوجُود ) : بوون ، ئەوەی هەستی پێدەکرێ ، داهێنراو، خەڵقکراو ، دژی نەبوو .

**مەودا (مودا)** : (١) هەر یەك لە دوو لای شیر یا خەنجەر کە دووخ لە نێوانیاندا هەیە . (٢) ماوەی سارد بوونەوەی گوللە یا شل بوونەوەی تیژ ؛ ئەو جێیەی گوللەو تیرو شتیتر تێیدا لە جووڵە دەکەوێ و دەوەستێ .

**مووریس (مُورِث)** : هۆ ، سەبەب ، ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی شتێك ڕووبدا یا ببێ .

**مەوزوون (مَوْزُون)** : کێشراو ، ئەوەی قورسایی هەیە ، ئەوەی قالب و ئەندازەی خۆی گرتووە .

**مەه** : کورتکراوەی (ماه)ە ، مانگ .

**مەهار ـ ماهار (مهار)** : دارێکی بچووکە گوریسی ووشتری لێ دەبەسترێ ، جڵەو .

**مەهیب (مَهیب)** : سامناك ، بە هەیبەت ، کەسێك یا شتێك کە ئادەمزاد لێی بترسێ .

**مەهدی (مَهْدِیّ)** : ئەوەی ڕێی ڕاستی پێ پیشاندراوە ، ڕێی ڕاست پێپیشان دراو ، ئەو کەسەی کە خودا هەقی لێ نزیك کردۆتەوە .

**مەهر (مَهْر)** : مارەیی .

**مەهروو** : جووانی وەك مانگ ، چووار دیواری پێ دادەپۆشرێ . منداڵان یاری پێ دەکەن .

**مەهلەکە (مَهْلَکَە)** : جێی لە ناو چوون ، جێی قەلاچۆبوون ، مەیدانی جەنگ کە خەڵکی تێدا دەکوژرێ .

**مەھ مەھ** : بەھ بەھ ، بـۆ سـەر سوڕمان‌و خۆشی‌یە . .

**مەی (مَی)** : شەراب ، شەرابی ترێ ؛ بادە ، هەموو خواردنەوەیێکی کە ئادەمزاد سەرخۆش بکا .

**مەیخانە** : جێی مـەی ، جێی شەراب ، جێی گشتی‌ی کە مەی لێ دەخورێتەوە .

**مەیدان** : گۆڕەپـان ، زەوی‌یێکی پان‌و بێ‌گـرێ ، جـێی تەراتێـن ، گۆڕەپانی تەراتێنی ئەسپ‌و ڕمبازی.

**مەیر** : بڕوانە (سەیرو مەیر) .

**مەیکەدە (مَیکدە)** : بڕوانـــە (مەیخانە) .

**مەیل (مَیل)** : ئارەزووی نزیـك بوونەوە ، ئارەزوو کـردن ، خووار بوونـەوەی ئادەمزاد بۆ ئـەوەی لە شتێك نزیك ببێتەوە .

**مەیل کردن** : چوون بـۆ ، نزیك بوونەوە ، بڕوانە (مەیل) .

**مەیموون (مَیمون)** : جانەوەرێکە زۆر لـە ئادەمزاد دەکا ، لەشی بـە تووکە هەندێکیـان کلکیان هەیـەو هەندێکی‌تر بێ‌کلکن ئەمانـە لە سەر دوو پێش دەڕۆن وەکـو ئادەمزاد ، لە جەنگەڵەکانی ئاسـیاو ئەفەریقادا دەژین .

**مەیموون قەدەم** : پێی وەکو پێی مەیموون .

**میئات** : کۆی (میئە = مائة)یە ، سەد ، ژمـارە «١٠٠» ، سەدان ، چەند سەدێك .

**میچ** : (١) سـاپیتە ، بلنـدترین جێی ناو ژوورو خانوو کە لە دار یا ئاسن یا خشت دروسـت دەکرێ‌و چووار دیـواری پێ دادەپۆشـرێ . (٢) جـگ ، ئێسـقانێکی حەیـوانە منداڵان یاری پێ دەکەن .

**میحەففە (مِحَفّە)** : تەختەڕەوان، تەختێـکە وەکـو کەژاوە وایـە بۆ هەڵگرتنی نەخـۆش یـا ئـەوەی سەفەر دەکا بە کار دەهێنرێ .

**میحـراب (مِحـراب)** : (١) لای ژووروی ماڵ‌و خانوو . (٢) جێی سەرۆکی کۆڕو مەجلیس . (٣) جێ‌و لانەی شێر . (٤) جێی پێش نوێژ لە مزگەوتدا . (٥) قیبلە . (٦) تاقی مزگەوت کـە ڕوو بە ڕووی قیبلـە دەبێ . (٧) کینایەتە بۆ تاقی برۆی جانانە .

**میحـرابی** : وەك میحـــراب ، بڕوانە (میحراب) .

**میحرابی برۆ** : تاقی برۆ ، برۆی کەوانەیی کە وەکو میحراب وایە بۆ دلدار .

**میحرابی دوعا** : میحـرابی نـوێژ کردن ، میحرابی پاڕانەوە ، میحرابی ڕازو نیاز .

**میحرابگەھ** : جێی میحـراب ، بڕوانە (میحراب) .

**میحنەت (مِحنَت)** : بەڵا، ئازار، ئاسیب ، کارەســات ، ئەنـدۆھ ، خەم .

**میر** : بچووك کراوەی (ئەمـیر)ە ، فەرماندە ، فەرمانڕەوا .

**میرات (میراث)** : ئەو ماڵەیە کە لە مردوێك دەمێنێتەوە بۆ نزیکەکانی .

**میرئات (مِرآة)** : ئاوێنـــــە ، نەینۆك ، بڕوانە (ئاوێنە) .

**میران** کـۆی (مـیرە) ، بڕوانـــە (میر) .

**میری میران** : فەرماندەی فەرمان دەران، فەرمانڕەوای فەرمانڕەوایان. میری گەورە .

**میزاب** : سوولاوکە ، ڕێی ئەو ئاوەیە کە لـە سەربان کۆدەبێتەوەو دێتە خوارێ ، پلووسك .

**میزاج (مِزاج)** : (١) سروشت ، خوو و ڕەووشـت ، تەبیعـەت ، وەزعی سایکـۆلۆجی‌ی ئادەمزاد . (٢) ئەوەیە کە لە تێکەڵبوونی شتێکی بێگانە پێك‌دێ وەکو شەرابێك ئاوی تێ‌بکرێ .

**میزاح (مِزاح)** : یاری‌کردن لەگەڵ یەك ، گەمەو گاڵتــە کردن ، خۆش ڕابواردن ، قسەو کردەوەیێك بـە ڕاستی نەبێ .

**میزان** : (١) تەرازوو ، ترازوو ، ئەنـدازە . (٢) نــاوی بـورجی هەفتەمە ، بڕوانە (بورج) .

**میزمار (مِضمار)** : جێی مەشق کردن بـە ئەسپ ، کـاتی مەشـق کردن بە ئەسپ ، ئـەو گۆڕەپانەی مەشقی ئەسپی تێدا دەکرێ ، دووا نوختەی کە ئەسپ لە تەراتێن‌و غار کردن‌دا دەیگاتێ .

**میسباح (مِصباح)** : (١) چرا . (٢) جام یا بادەی کە شەڕابی بەیانی تێدا دەخورێتەوە .

**میسر (مصر)** : وولاتێکـە لــە باکووری ئەفەریقا ، کەوتۆتە سەر زەریای سپی‌ی ناوەڕاست‌و زەریای سوور ، ڕووباری نیلی پێدا دەڕوا لە لای خـوارووەوە تا باکـوورو دەڕژێتــە نـاو زەریـای سـپی‌ی ناوەڕاســـت ، مەڵبەنـــدی شارستانی‌یـەتێکی گەلێ کۆنـە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌دا ، سەردەمی فیرعەونـــەکان پێشـــکەوتووترین ناوچەیێك بـوو لـە سـەر ڕووی زەوی .

**میسری** : نیسبەتە بۆ (میسر) ، کەسـێکی بە نەتەوە میسـری بێ ، ئادەمزادێکی خەڵکی میسـر ، هەر شتێکی لە بنج‌دا سەر بە میسر بێ .

**میسقال (مِثقال)** : پێوانەیێکە بۆ زێڕو زیوو بەردی بـە نرخ بە کار دەهێنرێ ، کێشێکە بەرامبەر ٢٤ دەنك .

**میسقالە زەررە** : شتی یەکجـار ووردو کەم .

**میسل (مِثل)** : وەکو ، وەك ، وەکی ، بەرامبەر ، هاوتا .

**میشکات (مِشكاة)** : ئەو جێ‌یەی کـە چـرای لێ دادەنـرێ ، هـەر جێ‌یێکی کە چرای لە سەر یا لە ناو دابنرێ .

**میعراج (مِعراج)** : پێپلکانــە ، قاڵدرمە ، ئەو شـتەیە کە بەهۆی

ئـەوەوە ئادەمــزاد دەتووانێ بــەرز بیێتەوە .

ــ **شەوی میعراج** : ئەو شەوەیە کە محەمەد بە فەرمــانی خودا بەرز بووەوە بــۆ لای بــارەگای خــودا و گەیشتە مەقامی ئەو ، ئەو جێیەی کەس نەیگەیشتۆتێ .

**میعمار (مِعمار)** : ئەوەی خانوو وبالەخانە دروســت دەکا ، وەستاو پسپۆر لــە دروست کردنی خانــوو بەرەو کۆشك‌و سەرا ، کینایەتە بۆ وەستاو پسپۆر لــە دروست کردنی هەموو شتێك .

**میعوەز (مِعوَذ)** : نوشـــتە ، نوشتی ، ئەو دوعایەیە کە لە سەر کاغــەز دەنووسرێ‌و لــە قومــاش دەگیرێ‌و لەمل دەکرێ بۆ پاراستن لە کارەسات‌و چاوەزار ، ووشەکە لە ڕستەی ( اعوذ بالله من الشیطــان الرجیم)ە .

**میعیار ( معیــــار )** : ئــەنــدازە ، پێوانە ، ئالەتێــکی درێژی‌و بەرینی شت دیــار بکا ؛ سەنگی مەحــەك‌و تەرازوو بــۆ ناســینی زێــڕو زانینی قورسایی .

**میفتاح (مِفتاح)** : کلیل ، ئەو ئالەتەیــە کە قفڵ‌و هەمــوو شتێکی بەستراوو داخراوی پێ بکرێتەوە .

**میللەت (مِلّت)** : (١) کۆمەڵێــك خەڵــك ، خەڵــکی یــەك ووڵات ، کۆمەڵێك خەڵك نەژادیان یەك بێ . (٢) ئایــین ، دیــن ، مەزهــەب ، شەریعەت .

**میم** : تیپــی « م » لە ئەلفبـــای زماندا .

**مینا** : (١) شووشە ، بەللوور ، ئاوێنــە ، نەینــۆك . (٢) هەمــوو شتێکی بە لاجیــوەردو زێڕو زیوو بەردی بــە نرخ نــەخش کــرابێ . (٣) جۆرە ڕەنگێکە بــۆ نەخشاندنی قاپی زێڕو زیو بــە کار دەهێنرێ . (٤) مینیـــاتوور ، وێنەکێشــان‌و نەخش کــردن بە لاجیوەردو زێڕو زیوو ئــاوو ڕەنگ لە ســەر ڕووی کاغــەز یا مەعــدەن . (٥) پێســتی ســپی‌ی ســەر ددان . (٦) نــاوی باڵندەیێکە . (٧) گوڵێکی جووانە ناوەڕاستی خڕو زەردە پەڕەی سپی یا شــینی کــاڵی لێبۆتـــەوە . (٧) جێیێکە لە شاری مەککە وربانی لێدەکرێ ، ئەو قوربانی‌یەی لەوێ دەکــرێ ( نــەحــری مینـــا )ی پێدەڵێن .

**مینبەر (مِنبَر)** : کورســـی‌ی بڵند ، کورسی‌ی بڵند کە بە پێپلکانە بە ســەری دەکەوون ، خــەتیب‌و واعیز لە سەری دادەنیشن‌و خوتبەو وەعز دەدەن‌و ڕووداوو بەسەرهات‌و ئەفسانە لــە بابــەت ئاینـــەوە دەگێڕنەوە .

**میندەف ( مِنْدَف )** کـــەوانی هەلاج ، کوتك‌و کــەوانی لۆکە شی کردنەوە .

**میوان** : مێوان ، ئەو کەسەیە کە دەچێتە مــاڵی کەسێکی‌تر و لــەوێ ڕێــزی لێدەنــرێ‌و حورمــەتی دەگیرێ .

**میهر (مِهر)** : (۱) دڵسۆزی ، خۆشەویستی ، دۆستی. (۲) ڕۆژ. خۆر ، خورشید ، هەتاو . (۳) لە پێش زەردەشتدا ناوی یەکێك لە خوداکان بووە کە لە ڕۆژدا خۆی نوواندوە . (٤) مانگی حەوتەمی ساڵی هیجری خورشیدیی ئێرانییە ، مانگی یەکەمی پاییزە . (٥) ناوی ڕۆژی شازدەمی هەموو مانگێکی خورشیدییە . (٦) جەژنێکە لە کۆندا لە ڕۆژی شازدەمی مانگی میهر بووە، میهرەگانیان پێ ووتووە. (۷) ناوی کچە .

**میهرەبان** : دڵسۆز ، کەسی خۆشەویستو دۆست .

**میهری یەکتا** : خورشیدی یەکانە، ڕۆژی تاكو تەنیاو بێ وێنە .

**مێزەر (مَیزَر)** : عەمامە ، سەرپێچ ، کەشیدە ، ئەو شتەیە کە مەلاو پیاوی ئایینی لە سەریان دەپێچن .

**مێش** : مەگەز ، حەشرەیێکە لە جێی گەرم پەیدا دەبێ ، لە سەر خواردەمەنی دەنیشێتەوە ، بە زۆری لە زبڵخانەو جێگەی پیسدا دەژی .

**مێگەل** : ڕانەمەڕ ، پارچەیێك ماڵاتی مێ ، دەستەیێك لە ئادەمزادی مێ ، کۆمەڵە ژنێك .

**موئەخخەر (مُؤَخَر)** : بەشی دووایی هەموو شتێك ، بەشی پشتەوەی هەموو شتێك ، دووا شت ، دژی (موقەددەم=مقَدَم)ە .

**موبارەك (مبارك)** : پیرۆز ، بە پیت .

**موبالات (مُبالات)** : بایەخدان بە شت ، بیر کردنەوەی قووڵ لە کارو کردەوەیێك .

**موباهات (مُباهات)** : شانازی کردن ، ناز کردن بە کەسێك یا شتێك ، لە خۆبایی بوون .

**موبەڕرا (مُبَرّیٰ)** : ئەو کەسەی لە تاوان پاكو بەدوورە ، ئەو کەسەیە کە لە دووایی‌دا ئاشکرا دەبێ کە تاوانی نەکردووە .

**موبەششەر (مُبَشّر)** : ئەوەی موژدەی دەدرێتێ .

**موبەییەن (مُبَیّن)** : ئاشکرابوو ، دیار بوو .

**موبین (مُبین)** : ئاشکرا کراو ، ڕوون کراو .

**موتابیع (مُتابِع)** : پێڕەو ، ئەوەی پێڕەوی شتێك دەکا ، ئەوەی کاری کەسێك تەواو دەکا .

**موتالا (مطالعة)** : خوێندنی کتێب ، خوێندنی هەموو شتێکی نووسراوو تێگەیشتنی ناوەڕۆکی .

**موتەلسەم (مُطلسم)** : جادوو لێکراو ، تەلیسماوی ، بڕوانە (تەلیسم) .

**موتەنەففیس (مُتَنَفّس)** : ئەوەی نەفەس دەکێشێ ، نەفەسدار ، گیاندار ، زیندوو ، ئادەمزاد ، ئینسان .

**موتەوەححیش ( مُتَوَحّش )** :

(١) جێی وێران ، وێرانە ، کەلاوە.
(٢) ترسان ، کەسێك لە شتێك بترسێ .

**موتەووەق (مُطَوَّق)** : تۆقدار ، ئەوی تۆقی لە ملە ؛ گەردەن بەند ؛ ئەودی دەوری دراوە .

**موتیع (مُطیع)** : ئەوەی سەر دادەنوێنێ ، ئەوەی ئیتاعەت دەکا ، ئەوەی فەرمان دەهێنێتە جێ ، ئەو کەسە بچووکەیە کە هەمیشە فەرمانی گەورە دەهێنێتە دی بێ ئەوەی خۆی بیروڕای هەبێ .

**موتوربە** : لقی دار گوڵێك یا درەختێك وەردەگیرێو ناوئاخنی دار گوڵێك یا درەختێکی تر دەکرێ ، لە ئەنجامدا بنە گوڵەکەو درەختەکە هەر یەکەیان دوو بەری دەبێ ، یا بەرێکی تازە لە کۆبوونەوەی هەردوو شت دروست دەبێ .

**موتتەحید (مُتَّحِد)** : بە یەکتری بەستراو ، یەکێتی ، یەکگرتوو ، بوون بە یەك ، کەسێك یا شتێك پێوەندیی یەکێتی لە نێوانیاندا هەبێ .

**موتریب ( مُطرِب )** : گۆرانیبێژ، مۆسیقاژەن ، سەماکەر .

**موتلەق (مُطْلَق)** : (١) ئازاد ، ڕزگار . (٢) ئەلبەت ، هەڵبەت ، دیارە ، دەبێ ، بە هەموو جۆرێ .

**موتمەئین (مُطْمَئِن)** : دڵنیا ، ئاسوودە ، ئەوەی ئۆقرەی گرتووە ، ئەوەی ئارامی گرتووە .

**موجەڕڕەب (مُجَرَّب)** : شارەزا ، پسپۆر ، ئەو کەسەی لە کاری خۆیدا پسپۆرە ، ئەوەی تاقی کردنەوەی زۆرە .

**موجەڕڕەد (مُجَرَّد)**: (١) ڕووت، بێ جلوبەرگ ، تاكو تەنیا ، پیاوی بێ ژن . (٢) لە زاراوەی زانستیی حیکمەتدا ئەوەیە کە دوور بێ لە (مادده) وەکو بیرو گیان .

**موجەززا (مُجَزَّأ)** : پارچە پارچە بوو ، کەرت بوو ، جودا بوو .

**موجەوهەر** : جەوهەردار ، جەواهیر بەند .

**موحابا (مُحاباة)** : لایەن گرتن ، یاریدەدان ، لایەن گرتنی یەکێك بە بێ هەق .

**موحاسیب (مُحاسِب)**: ژمێریار، حیسابدار ، ئەوەی حیساب دەکا .

**موحەققەق (مُحَقَّق)** : (١) بە ڕاستی ، بە ڕاستی پێویستە . (٢) سفتو ڕێکوپێك ، ڕاستو دروست .

**موحەممەد ـ محەمەد (مُحَمَّد)** : (٥٣ پێش ـ ھ = ٥٧١ز/١١ھ = ٦٣٣ز ) محەمەد کوڕی عبدوللا کوڕی عەبدولموتتەلیب کوڕی هاشم ، پێغەمبەری موسوڵمانانە لە مەککە لە پاش مردنی باوکی لە دایك بووە ، هێشتا منداڵ بووە کە دایکیشی مردووە ، لە تەمەنی چلساڵی پەیامی خودای بۆ هات ، خەڵکی مەککە بەرهەڵستیی ئایینی تازەیان کرد ، لە (٦٢٢ز) لە مەککەوە کۆچی

مەدینەی کرد ، ئەو ساڵە بوو بە سەرەتای ساڵنامەی هیجری ، چەند جەنگ‌و شەڕوشۆڕێکی لەگەڵ عەشیرەتی خۆی‌و خەڵکی ئەو ناوە کرد ، لە شاری مەدینە کۆچی دوایی کردووە .

**موحەووەل (مُحَوَّل)** : نێرراو ، ئەوەی درابێتە یەکێک‌و لە ژێر چاودێری ئەودا بێ ، ئەوەی درابێتە یەکێک‌و چارەنووسی لە دەست ئەودا بێ .

**موحەییا (مُحَیّا)** : ڕوو، چەهرە، ڕوخسار ، دەم‌وچاو .

**موحەییەر (مُحَیَّر)** : ئەوەی سەرسام بووە ، ئەوەی حەیران‌و سەرگەردان بووە .

**موحەییەل (مُحَیِّل)** : فێڵباز ، فێڵاوی .

**موحیت (مُحیط)** : (١) زەریای فراوان ، زەریای گەورە ، ئۆقیانووس . (٢) دەوردراو ، چووار دەور گیراو . (٣) خەتی چووار دەوری دائیرە . (٤) هەموو شتێکی دەوری شتێکی تر بگرێ . (٥) ئەو جێیەی کە ئادەمزاد زیندەگانی تێدا دەکا لە وڵات‌و شارو گوندو هەوارگەی هۆزو بنەماڵە .

**موحتاج (مُحتاج)** : دەست‌کورت، هەژار ، ئەوەی پێویستی بە ماڵ هەیە .

**موحتەرەم (مُحتَرَم)** : ئەوەی ڕێزی لێ دەنرێ ، ئەوەی پێویستە ڕێزی بگیرێ ، پایە بڵند ، کەسی گەورە .

**موحتەشەم ( مُحتشم )** : (١) موحتەشەمی کاشانی بە ناو بانگترین شاعیری سەردەمی سەفەوی‌یە لە ئێراندا ، لە ساڵی (١٥٨٧ز)دا کۆچی دوایی کردووە ؛ لە سەرەتای لاوەتی‌دا خەریکی شیعری دڵداری بووە بەڵام لە سەردەمی پیردا خووی داوەتە ئایینو تەرجیع بەندەکانی لە بابەت کارەساتی حوسێن‌و کەربەلا بە ناو ناوبانگن . (٢) بە ئابڕوو ، بە حەیا .

**موحریم (مُحْرِم)** : ئەو کەسەیە کە ئیحرامی حەجی بەستبێ ، ئەوەی جلی ئیحرامی لەبەرکردووە ، سەری ڕووت کردووە .

**موخاتەب ( مُخاطَب )** : ئەو کەسەی قسەی لەگەڵدا دەکرێ ، لای دووەمی گفتوگۆ ، ئەو کەسەی یەکێکی‌تر قسەی بۆ دەکا .

**موخالیف (مُخالِف)** : (١) دژ ، ئەو کەسەی کە دان بە شتدا نەهێنێ ، ئەو کەسەی پێڕەوی فەرمان یا قسە یا کارێك نەکا ، دژی مووافیق . (٢) ناوی ئاوازو مەقامێکە .

**موخەتتەت (مُخَطَّط)** : خەتە خەت کراو ، خەتدار ، ڕێکە ڕێکە .

**موخەسسەس ( مُخَصَّص )** : دیاری کراو ، دانراو ، دەست نیشان‌کراو، تایبەتی ، هەڵبژێرراو.

**موخەلخەل ( مُخَلخَل )** :

(١) جێی خرخاڵ لە پێدا . (٢) کون بوو ، درز تێکەوتوو .

**موخەییەر (مُخَیَّر)** : ئەوەی ئارەزووی بەدەست خۆیەتی ، خاوەنی ئیختیار ، ئەوەی بە ئارەزووی خۆی دەتووانێ شت هەڵبژێرێ یا بریاری لە سەر بدا .

**موختەلەت (مُختَلَط)**: تێکەڵ یەك بوون ، چوونە ناو یەك‌و تێکەڵاو بوون .

**موودەعی (مدّعی)** : ئەو کەسەیە کە داوای لای یەکێکی تر هەیە ، ئەو کەسەی داوای هەقی خۆی دەکا .

**مودەووەر (مُدَوَّر)** : (١) خڕ ، گرد ، هەموو شتێکی خڕو گردی وەك دائیرە . (٢) لە زاراوەی زانستیی بەدیعدا ئەو نیو دێرە شیعرەیە کە بە شێوەی دائیرە دەنووسرێ واتە بە هەر ووشەیێك دەتووانرێ دەست بە خوێندنەوەی شیعرەکە بکرێ .

**موددە (مُدّة)** : ماوە ، کات‌و سەردەمی دیاری کراو ، بەشێك لە کات‌و دەم زۆر بێ یا کەم .

**موددەت (مُـدّت)** : بڕوانە (موددە) .

**موراد (مُراد)** : مراز ، مەبەس ، ئارەزوو ، ئامانج ، هیوا ، ئەوەی دڵ دەیەوێ .

**موروور (مُرور)** : (١) هاتن‌و چوون ، ڕۆیشتن ، ڕێگە گرتن . (٢) خوێندنەوەی کتێب .

**مورغ (مُرغ)** : باڵندە ، باڵدار ، فڕندە ، هەموو گیاندارێکی پەڕو باڵی هەبێ‌و بفڕێ .

**مورغان** : هێلکەی مریشك .

**مورایی** : چڵکاوخۆر ، کوزکێش ، ماستاو ساردکەرەوە ، موتەمەللیق .

**مورەتتەب (مُرَتّب)** : (١) ڕێك‌و پێك ، هەموو شتێکی کە جێگەی خۆی گرتبێ . (٢) زاراوەیێکە لە ( لەفف‌و نەشر)ی شیعردا بە کار دەهێنرێ ، بڕوانە (لەفف‌و نەشر) .

**مورەخخەس (مرَخّص)** : ئەوەی ڕێگەی دراوە ئازاد بێ ، ئازاد بوو ، ئەوەی ئاسان کراو ، هەرزان کراو ، ئیجازە دراو .

**مورتەعیش (مُرتَعِش)**: لەرزان ، لەرزیو ، ئەو کەسە یا ئەو شتەی کە دەلەرزێ یا دەلەرێتەوە .

**مورەککەب (مُرکّب)** : (١) شتێك لە زیاتر لە جەوهەرێك دروست بووبێ ، شتی تێکەڵاو ، لە زاراوەی زانستیی کیمیادا ئەو ماددەیەیە کە لە چەند جەوهەرێك پێك‌هاتووە وەکو ئاو کە لە ئۆکسجین‌و هیدرۆجین دروست بووە . (٢) مەرەکەب ، حیبر ، ئەو شتەیە کە بۆ نووسین یا چاپ کردن بە کار دەهێنرێ .

**موردە ( مُردە )** : مردوو .

**مورید (مُرید)** : ئەوەی بریار دەدا لە سەر کردنی شتێك ، ئەوەی ئارەزووی شتێك دەکا ، خاوەن ئیرادە ، زاراوەیێکە لە سۆفیزمدا بۆ

لایەنگری تەریقەتی دەروێشی بە کار دەهێنرێ .

**مورسەلین (مُرْسَلین)** : کـۆی (مورسەل = مُرْسَل)ە ، نێرراو ، ئـەو کەسـەی پەیـام دێنـێ ، پێغەمبەر ، بڕوانە (ڕەسوول) .

**موزەخرەف** : شتێکی بێ ئەسڵ و بنیاد ، قسەی بێهوودە و درۆ ، خەریکی شتی هیچ و پووچ بوون .

**موزەففەر (مُظَفَّر)** : بـە مـراز گەیشتوو ، سـەرکەوتوو ، پیرۆز ، بەختیـار ، ئەو کەسـەی کـە بـە ئارەزووی دڵی دەژی .

**موزمەحیـــل (مُضمَحِلّ)** : نەبوونو نابـووت ، لە ناوچـوو ، پەڕاگەندە ، تێك شـكاوو لە كەڵك كەوتوو .

**موزنیب (مُذنِب)** : تاوانبـــار ، گوناهكار .

**موژە** : بژانگ ، برژانگ ، مژۆڵ ، مووی پەلكی چاو .

**موژدە (مژدە)** : مزگێنی ، هەواڵی خـۆش ، خەبـەری خـۆش ، بەشارەت .

**موژگان** : كۆی (موژە)یە ، بڕوانە (موژە) .

**موژگانی زێڕ دووز** : برژانـگی لە زێڕ دروست كراو .

**موساوی (مُساوی)** : بەرامبەر ، وەكیەك ، دوو شتی وەكو یەكتری بن .

**موسەلسـەل ( مُسَلْسَـل )** : (١) بە زنجیر بەستراو ، لە یەكتری بەستراو ، بە یەكتری قایم كراو ، یەك لە یەك قایم كراو . (٢) قژی بە گوریـــزە . (٣) جـۆرە تـــۆپو تفەنگێكە .

**موسەففا (مُصَفّی)** : پاك كراو ، سافو بێ گەرد ، پاكو ڕوون .

**موسەمما (مُسَمّی)** : ئاشـكرا ، ناوبراو ، دیار ، دیاری كراو ، ناو لێنراو .

**موسەییەر (مُسَیِّر)** : ئـــەو كەسـەی یەكێـكی تر دەبڕوێنـێو ڕێـگەی پێ پیشـان دەدا ، ئـەو كەسەی ئارەزووی بە دەستی خۆی نییەو یەكێكی تر لێی دەخوڕێ .

**موسیب (مُصیب)** : لـــــــە نیشـــاندان، ، ئەو كەسـەی كارو كردەوەو قسەی ڕاستو دروستە ، ئەو كەسەی قسەو كارو كردەوەی ڕاست دەكا .

**موسوڵمان (مُسلمان)** : پێڕەوی كەری ئایینی ئیسلام ، ئەو كەسەی لە سەر ئایینی ئیسلامە . بڕوانـــە ( ئیســلام ) .

**موسبەت (مُثبَت)** : ئەو شتەی كە خۆی گرتووە ، ئارامو قـەرار گرتـوو ، وەستان لە جێو قایـم بوون .

**موستەحەقق ( مُستَحَقّ )** : شایان ، لایەق ، وەشاوە .

**موسوەددە (مُسَوَّدە)** : لە بنجدا ووشەكە (موسەووەدە =مُسَوَّدە)یە

بەڵام لە کوردیدا بووە بە (موسوەددە) ، هەموو نووسینێکی کە دەنووسرێتەوە لە پاش بژار کردن پاك نووس دەکرێتەوە ، نموونەی چاپکراو کە چاپخانە دەیدا بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەکانی .

**موشابیه (مُشابه)** : وەکو ، لە یەك چوو ، شتێك لە شتێکی تر بچێ ، وەك یەك .

**موشەخخەس ( مُشَخّص )** : دیاریکراو ، دەست نیشانکراو ، دانراو .

**موشەررەف ( مُشَرّف )** : ئەوەی شەرەفی دەدرێتێ ، ئەوەی بڵند و پایەبەرز و گەورە دەبێ .

**موشەووەش (مُشَوّش)**: نارێك، پەراگەندە ، ئاڵۆزو تێكترنجاو ، پەرێشانو بڵاو ، زاراوەیێکە لە (لەففو نەشری)ی شیعردا بە کار دەهێنرێ ، بڕوانە (لەففو نەشر) .

**موشك** : ماددەیێکی بۆن خۆشە لە ناووکی مامزی موشك دێتە دەرێ . ـ مامزی موشك جۆرە مامزێکە دوو کەڵبی درێژی هەیە وەکو نابی فیل ، زۆرتر لە شاخەکانی هێمالایای هیندستان دەژی ، لە ژێر زگی کیسەیێکی بچووکی وەکو دومەڵ هەیەماددەیێکی یەیتی تێدا کۆ دەبێتەوە ، هەر کاتێکی کە کیسەکە پڕ دەبێ مامزەکە هەست بە ئازارو خارشت دەکا ، ناچار لە بەردی دەخشێنێ تا دومەڵەکە دەتەقێو ئاوی پۆرگەکە دەڕژێتە سەر ڕووی زەویو ووشك دەبێتەوە ، ئەمە ماددەی موشکی بۆن خۆشە . مامزی تاتارو مامزی تەتەرو مامزی خوتەنو مامزی خەتاو مامزی موشکینیشی پێدەڵێن .

**موشکی تەتار** : بڕوانە (موشك) .

**موشکی خەتا** : بڕوانە (موشك) .

**موشکین** : نیسبەتە بۆ (موشك) . (١) ئەوەی بۆنی موشکی هەیە . (٢) ڕەش ، ئەوەی ڕەنگی موشکی هەیە .

**موشەببەك ( مُشَبّك )** : کونکون وەکو پەنجەرە ، وەکو تۆڕ .

**موشتاق (مُشتاق)**: ئارەزوومەند، ئەوەی مەیلی بۆ شتێك هەیە ، خاوەنی شەوقو ئارەزوو .

**موشتەری (مُشتَري)** : کڕیار ، ئەو کەسەیە کە شتێك دەکڕێ . (٢) ئەستێرەی گەڕۆکی جۆبیتەر ، ئەستێرەی هورمز ، گەورەترینی ئەستێرە گەڕۆکەکانی بنەماڵەی ڕۆژە ، لە ڕووی ڕووناکیشەوە دووەمین ئەستێرەیە لە پاش زوهرە .

**موشکیل (مُشکِل ـ مُشکِلە)** : کاری سەختو قورسو دژوار ، ئاڵۆزو داپۆشراو .

**موعامەلە (مُعامَلە)** : کڕینو فرۆشتن ، ئاڵوێری ، سەواد ، پرسینی‌نرخ .

**موعەببەر (مُعَبّر)** : لێکدراوە ،

شیکراوه ، ڕوون کردنەوه ، خەونی لێکدراوه .

**موعەتتەر (مُعَطَّر)** : بۆن خۆش ، عەتـراوی ، عەترامێز ، گـولاوی ، ئەوەی بە گولاو ڕشێنرابێ .

**موعەللا (مُعَلّی)** : بلند بـوو ، بەرز بوو ، پایە بلند .

**مەعەللەق (مُعَلّق)**: (۱) پێوەندی، هەلواسراو ، بەستراو ، شتێك بە شـتێكی ترەوە بەسـترابێ ، شۆڕ بووەوه . (۲) زاراوەیێکە لە زانستی نەحوودا بە کار دەهێنرێ .

**موعەللەم (مُعَلّم)** : فێـرکراو ، پەروەردەکراو ، دەرس‌کراو .

**موعەییەن (مُعَیَّن)** : دیاریکراو، دانراو ، بڕیار لە سەری‌دراو .

**موعتەدیل (مُعتَدِل)** : ڕاست ، دروست ، بەرامبەر ، ناوەند .

**موعتەریف (مُعتَرِف)** : ئەوەی دان بـە شتدا دەهێنێ ، ئـەوەی هەموو شتێکی کە دەیزانێ دەیلێ .

**موعتەقید (مُعتَقِد)** : خـاوەن باوەڕ ، خـاوەن عەقیدە ، خـاوەن ئیمان ، ئیماندار .

**موعجیز (مُعجِز)** : ئەو شتەیە کە کـردنی زۆر قورس بێ ، ئـەو شتەی کە ئادەمزاد بـۆی نەکرێ ، کاری لە ئاسایی بە دەر ، کاری لە عەقل بە دەر ، هەموو شتێکی کە لە خوو و ڕەووشتو تەبیعەت بچێتە دەرێ ، کارێـك کـە پێغەمبـەران دەیکەن .

**موعجیزه (مُعجِزه)** : مـــێ ی (موعجیز)ه ، بڕوانە (موعجیز) .

**موعریب (مُعرِب)** : ئەو کەسەی کە ووشەو ڕستە ئیعراب دەکا .

**موغیلان (مُغیلان)** : درەختێـکە درکی درشتو خوواری زۆره ، لە پێشانا سەوزەو لـە پاش ماوەیێك ڕەش یا سووری تۆخ دەبێ ، بەری وەکو پاقلەیــە لە هەر قەپێلکێـکدا پێنج تا نۆ دەنکی تێدایە ، سەمغی ئەم دارە سەمغی عەرەبی پێ دەلێن، بە عەرەبی ناوی (أم غیلان)ه .

**موغبەر (مُغبَر)** : (۱) تۆزاوی ، خۆلاوی ، خاکی ، ڕەنگی وەکو ڕەنگی خاك . (۲) دل شکاو ، مونفەعیل .

**موغلـەق (مُغلَـــق)** : دژوار ، داخراو، پڕ لە تەنگوچەلەمە، قسەو ووتەیێك کە تێگەیشتنی قورس‌بێ ، قسەی پێچراوی قورسی نائاشکرا .

**موفلیس (مُفلِس)** : بێ‌پـاره ، بێ‌مالو سامان ، بێ‌شت ، دەستە کورت ، نابووت .

**موقتەبـــەس ( مُقتَبَس )** : وەرگـیراو ، سـوود وەرگـرتن لە یەکێکی‌تر ، دژی ڕەسەن .

**موقتەدا (مُقتَدی)** : پێشـــەوا ، ئەو کەسەی خەلکی پێڕەوی دەکەن، ئەو کەسەی دەبێتـە ڕەمزو خەلکی لاسایی دەکەنەوه .

**موقەددەر (مُقَدَّر)** : بــەش ، بـەخت ، نەسیب ، چـارەنووس ، ئەوەی دانراوه دەبــێ ببێ ، ئەوەی

له ڕۆژی یەکەمەوە بۆ ئادەمزاد دانراوە دەبێ ببێ .

**موقەددەم (مُقَدَّم)** : پێشرەو ، پێشەنگ ، ئەوی لەپێشەوەیە .

**موقەددیمە (مُقَدَّمه)** : پێشەکی، سەرەتا ، پێشەکی‌و سەرەتای هەموو شتێك ، بەشی یەکەمی هەموو شتێك ، شتێکی لە پێش‌دا بووترێ بۆ تێگەیشتنی شتی تر ، ئەوەی لە سەرەتای کتێب‌دا دەنووسرێ .

**موقەررەر (مُقَرَّر)** : بڕیار دراو ، شتێك‌بڕیاری لە سەر درابێ .

**موقیڕ (مُقِرّ)** : دان پێداهێنراو، یاوەڕ پێکراو ، کەسێك دان بە شتێك‌دا بنێ .

**موکەددەر (مُکَدَّر)** : شێلوو بوو، دڵتەنگ ، شێواو ، خەمبار ، هەڵوول .

**مولازیم (مُلازِم)** : هاوڕێ ، کەسێك هەمیشە لەگەڵ کەسێکی‌تردا بێ ، هەموو شتێکی کە لەگەڵ شتێکی تردا بێ .

**مولاقات (مُلاقات)** : بە یەکتری گەیشتن ، یەکتری بینین ، ڕوو بە ڕوو بوون .

**مولەووەس (مُلَوَّث)** : پیس ، پیس‌و پۆخڵ، لەپیسایی وەردراو.

**مولووك (مُلوك)** : کۆی (مەلیك = مَلِك )ە ، بادشا ، شا ، سوڵتان .

**مولغا (مُلغا)** : (١) دەست لێ هەڵگیراو ، سڕراوە ، لە ناو براو ، نەخستنە ژمارەوە . (٢) زاراوەیێکە لە زانستی‌ی نەحوودا بە کار دەهێنرێ .

**مولهەم (مُلهَم)** : کەسێك کە دەبێتە هۆی ئیلهام بۆ یەکێکی تر ، هەموو شتێکی کە هێزو توانای داهێنان دەداتە ئادەمزاد .

**موڵ ــ مول (مُل)** : (١) شەراب، مەی . (٢) هەرمێ ، گوڵاوی . (٣) بڕوانە اگوڵ‌و موڵ) .

**موڵك (مِلك)** (١) هەموو شتێکی لە دەست ئادەمزاددا بێ لە زەوی‌و شتی‌تر کە هی خۆی بێ . (٢) **(مُلك)** : گەورەیی‌و سەڵتەنەت‌و پادشاهی .

**مومتاز ( مُمتاز )** : هەڵبژێراوو جودا کراوە ، خاوەنی شەوق ، چاکی‌و جووانی .

**مومکین (مُمکِن)** : ڕەوا ، ئاسان، ئەوەی دەست دەکەوێ ، ئەوەی دەشێ ڕوو بدا .

**موناجات (مُناجات)** : ڕازو نیاز کردن ، ڕازی دڵ بە یەکێکی تر بووترێ ، پاڕانەوەو نیاز لە دەرگای خودا .

**مونەججیم (مُنَجِّم)** : ئەستێرەناس ، ئەستڕۆنۆم ، کەسێك کە زانستی‌ی ئەستێرەناسی‌ی بزانێ .

**موونەووەر (مُنَوَّر)** : ڕووناك ، درەخشان ، نوورانی ، ئەوەی ڕووناکە .

**مونیر (مُنیر)** : ئەوەی ڕووناکی دەدا ، ڕووناکی‌دەر .

**مونتەزیر (مُنتَظِر)** : کەسێك

چاوەڕووانی شتێك یـا كەسێكی تر بكا ، چاو گرتنە ڕێ .

**مونتەفیع (مُنتَفِع)** : كەسێك لە كارێك یا شتێك سوود وەربگرێ ، ئەو كەسەی قازانج دەكا .

**مونتیج (مُنتِج)** : ئەوەی ئەنجام دەدا بە دەستەوە ، سوودو كەڵك ، بەبەر ، بەردار .

**مونجەمید (مُنجَمِد)** : بەستوو، سەهۆڵبەند، ئاو یا هەر شتێكی‌تری بەهۆی ساردی‌یەوە ببەستێ‌و ڕەق‌و سفت ببێ .

**مونزەجیر (مُنزَجِر)** : دەركراو ، ترسێنراو ، دوور خراوە .

**مونزەوی (مُنزَوی)** : گۆشەگیر ، گۆشەنشین ، ئـەو كەسەیە كە لە خەڵـــكی دوور دەكەوێتـــەوەو گۆشەنشینی دەكا .

**مونعەقید ( مُنعَقِد )** : بەستن ، بەیمانێك كە دەبەسترێ ، شلەیێك كە سفت‌و ڕەق دەبێ .

**مونكەر (مُنكَر)** : (١) كـــاری نابەسـند ، كاری نـاڕەوا ، كاری خراپ . (٢) زیـرەك ، بەهـۆش . (٣) نـاوی فریشتەیێكە ، بـڕوانە (نەكیرو مونكەر) .

**موهر (مُهر)** : (١) مۆر ، ئالەتێكی مەعدەنی یا پلاستیكی یا عەقیقی‌یە ناوی كەسی لە سەر هەڵدەكەندرێ لە باتی ئیمزا لە نامـەو شتی تردا چاپ دەكرێ ، یا شتێك دادەخرێ بۆ ئـەوەی نەكرێتەوە مـۆری لێ دەدرێ. (٢) كیسـەی سەربەستراو، كیسەی نەكراوە .

**موهرە** : گلۆڵەی بچـووكی درز داری‌چینی یا شووشە ، شتی خڕی بچـووكی درزداری چـینی یـا شووشە .

**موهرە گوشا** : كیســەی كراوە ، شتێكی سەر مـۆر بێ‌و بكرێتەوە ، مۆركراو بشكێنرێ ، نەسمراو كون بكرێ ، كچ بكرێ بە ژن .

**موهەییا (مُهَیّا)** : ئامادە ، كاری ئامادە بوو .

**موو** : تـووك ، تـەلی باریـك‌و ناسكە لە سـەرو لەشی ئادەمزاد ، شتی زۆر باریك .

**موو بە موو** : موو لە دووای موو، موو لەگەڵ موو ، موو و موو .

**مووچە** : بـەش ، ئـەو مـاڵ‌و پارەیەی لە باتی كارێك دەدرێ .

**مووسایی ئیبنی عیمران** : مووسا (سەدەی سـێزدەمی پێش زایـین) گەورەتـرین پیـاوان‌و قارەمـانانی تەوراتە ، لە میسر لە دایك بووە ، كچی فیرعەون لـە خنكانی ڕووباری نیـل ڕزگاری كـرد ، لە قەسـری باوكی پەروەردەی‌كردو پێ‌ی‌گەیاند، لە تەمـەنی چل سـاڵی‌دا پەیـامی پێغەمبەری بۆ هـات ، گۆیا خودا نـاردی بـۆ ڕزگار كـردنی بـەنی ئیسرائیل لە زۆرداری‌ی فیرعەون ، ڕووی‌كردە سینا لەگەڵ نەتەوەكەی‌و چل ساڵ لەوناوە مایەوە ، لە سەر

شناخی حوٚریب « ده ئاموٚژگاری »یه‌کانی له خودا وه‌رگرت‌و بوٚ نه‌ته‌وه‌که‌ی گێڕایه‌وه ، ده‌ستووری بوٚ دانان ، له‌قه‌بی « کلیم الله »یه له قورئان‌دا باسی کراوه .

**مووسیم (مَوسِم)** : (١) کات‌و سه‌رده‌می شت ، کاتی گه‌یشتنی شتێك ، کاتی کوٚبوونه‌وه‌ی خه‌ڵك بوٚ حه‌ج . (٢) که‌ژ ، فه‌سڵ .

**مووسیمی باران** : که‌ژی باران ، فه‌سڵی باران ، زستان‌و به‌هار .

**مووسونبول** : مووی جووان‌و بوٚن خوٚشی وه‌کو سونبول .

**مووکار** : زوٚر تیژ ، ئه‌وه‌ی موو ده‌کا .

**مووکه‌مه‌ر** : که‌مه‌ری باریکی وه‌کو موو ، قه‌دی باریکی وه‌کو موو .

**مووم** : بڕوانه (موٚم) .

**مووی میان** : ناو قه‌دی باریکی وه‌کو موو .

**موٚدنه** : دار جێگه‌ره .

**موٚر** : بڕوانه (موهر) .

**موٚسیقار** : (١)ناوی باڵنده‌یێکه ، ده‌نگ و ئاوازی زوٚر خوٚش و جوٚراوجوٚره چونکه کونێکی زوٚر له ده‌نووکی‌دا هه‌یه ، که ده‌بێته هوٚی ڕه‌نگاوڕنگی ئاوازه‌کانی . (٢) ناوی ئاله‌تێکی موٚسیقایه له قامیش دروست ده‌کرێ .

**موٚم** : شه‌مێ ، مووم .

**محه (محی‌الدین)** : ناوی کوڕانه ، له بنج‌دا (محیه‌ددین = محی‌الدین)ی عه‌ره‌بی‌یه ، له کوردی‌دا کورت کراوه‌ته‌وه‌و بووه به « محه » .

**مرده** : مردوو ، بێ‌گیان بوون ، له ناو چوون ، نه‌بوون .

**مردوو** : ئاده‌مزاد یا حه‌یوانێکی که بێ گیان بێ ، دژی زیندوو .

**مردن** : بێ‌گیان بوون ، له ناو چوون ، نه‌بوون ، نه‌مان .

**مرواری** : (١) گه‌وهه‌رێکی سپی‌و دره‌وشه‌داره له ناووکی سه‌ده‌فی مرواری په‌یدا ده‌بێ ، بڕوانه (سه‌ده‌ف) . (٢) کینایه‌ته بوٚ فرمێسك .

**مرووه‌ت (مُرُوَّت)** : پیاوه‌تی ، جووانمه‌ردی ، مه‌ردانه‌یی ، دڵ ناسکی .

**مس** : مز ، مه‌عده‌نێکی ڕه‌نگ سووره ، زوٚر سه‌خت‌و قایمه ، ته‌به‌قه‌ی ناسك‌و ته‌نك‌و ته‌لی لوولدراوی لێ دروست ده‌کرێ .

**مست** : ده‌ست ، له‌پ ، ناوله‌پ ، مشت .

**مسکین** : هه‌ژار ، بێ نه‌وا ، ده‌روێش ، بێ ماڵ‌و سامان .

**مشت** : په‌نجه‌کانی ده‌ست که به هوٚی ئه‌وانه‌وه حیساب ده‌کرێ‌و شت ده‌پێورێ ، ئه‌و به‌شه‌یه له شتێك که له ده‌ستێك‌دا جێ‌ی ببێته‌وه وه‌کو مشتێ گه‌نم .

**مشك** : جانه‌وه‌رێکی بچووکه ، له ژێر زه‌وی‌و کونی ناو دیواران‌دا ده‌ژی ، زاووزێ کردنی فره‌یه .

**مشك‌و مار** : زینده‌وار .

**مـفت (مـفت)** : شـتێك بدۆزرێته‌وه ، شـتێك به بێ ڕه‌نج‌و به‌لاش چنگ بكه‌وێ .

**مل** : ئه‌ستۆ ، گه‌رده‌ن ، گه‌ردن .

**ملخوار** : مل شـۆڕ ، سـه‌ركز .

**من** : ئه‌من .

**منداڵانه** : وه‌كو منداڵ ، به وێنه‌ی منداڵ ، منداڵ ئاسا .

**مننه‌ت (مِنّت)** : چاكه‌و یارمه‌تی، یاریده‌دان ، چاكه‌و پیاوه‌تی‌یێك كه كه‌سێك به‌رامبه‌ر كه‌سێكی تر بیكاو به چاویدا بداته‌وه .

**میان** : ناو قـه‌د ، ناوه‌ڕاست ، ناوه‌ند ، لا .

## N = ن

**نائی** : دوور

**نائیم (نائم)** : نووستوو ، خه‌و لێ كه‌وتـوو ، كه‌سـێكی چووبێته خه‌وه‌وه .

**ناجی ـ ناجیه** : (١) ڕزگار بوو ، ئـازاد بـوو ، قورتـار بـوو . (٢) ووشـتری خۆشـڕه‌و ، ئـه‌و ووشـتره‌ی ئه‌وه‌نـده خۆشـڕه‌وه سـوواره‌كه‌ی لـه هه‌مـوو ته‌نگوچه‌ڵه‌مه‌یێك ڕزگار ده‌كا .

**ناچار** : بێ چاره ، بێ نه‌وا ، بێ توانا ، ناعیلاج .

**ناحه‌ق** : ناڕاست ، نادروست .

**ناحیه** : لا، قه‌راخ، ڕۆخ، به‌شێ له وولات ، ناوچه ، هه‌رێم .

**نادان** : نـه‌زان ، نه‌خوێنده‌وار ، بێهۆش ، بێ‌عه‌قڵ .

**نادانی** : نه‌زانی ، نه‌خوێنده‌واری .

**نادیده** : نادیار ، ئه‌و شته‌یه كه به چاو نه‌بینـرێ ، كه‌سێك شـتێكی نه‌دیبێ .

**نار** : (١) ئاگر . (٢) كورتكراوه‌ی (هه‌نار)ه .

**نارسه‌ر** : سه‌ری ئاگـر ، سه‌ر ئاگر .

**ناره نار** : ئاگره‌و ئاگر .

**ناره‌وه‌ر** : به‌ری هه‌نار .

**نار به‌ر** : به‌ری هه‌نار .

**ناروه‌ر** : ئاگرین .

**نـاروه‌لان ( نـاره‌وه‌ن )** : بـووز ، دره‌ختێكی گه‌وره‌یه لق‌و گـه‌ڵاو پۆپی زۆره ، گه‌ڵای له شێوه‌ی هێلكه‌دایه‌و ددان داره ، له بـاخ‌و قه‌راخ شـه‌قام‌دا ده‌چێنرێ .

**ناز** : شانازی ، لووت به‌رزی ، عیشوه ، ناسكی ، قسـه كردن به چاوو برۆ .

**نازه‌نین** : نازدار ، خـاوه‌ن ناز ، ناسك ، ناسك ئه‌ندام ، نه‌رمونۆڵ .

**نازیر (ناظِر)** : ئه‌وه‌ی چاودێری ده‌كا ، ئه‌وه‌ی ده‌بینـێ ؛ سه‌ركار ، پاسه‌وان .

**نازیم (ناظِم)** : ڕێکخەر ، ئەوەی شت ڕێك دەخا ، کەسێك کارێك یا شتێك ڕێك بخاو جێبەجێی بکا .

**نـاس** : خەڵـك ، ئادەمـزاد ، ئادەمیزاد ، ئەهالی .

**ناسیخ (ناسِخ)** : (١) ئـەوەی شتێك ڕەت دەکاتـەوە ، ئـەوەی شتێك بە درۆ دەخاتـەوە ، ئەوەی شتێك بەتـاڵو پووچ دەکاتـەوە . (٢) ئەو کەسەی نووسـینێك ڕوو نووس دەکاتەوە ، ئـەو کەسەی لە سـەر نووسـینێکدا دانەیێـکی تر دەگرێتەوە .

**ناسیـیە ( ناصیة )** : ناوچەوان ، مووی پێش سەر .

**ناسوفتە** : دەست لێ نـەدراو ، کون نەکراو ، نەسمراو ، نەکراوە .

**ناسك** : نـەرم ، نەرمـونۆڵ ، باریك .

**ناسك بەدەن** : لەش نەرمونۆڵ ، کەسێك لەشی نەرمونۆڵ بێ .

**ناعیـلاج** : بێچـارە ، بێ داوو دەرمان .

**ناف** : (١) ناووك . (٢) ناوەڕاستو ناوەندی شت .

**نافە** : وەکو ناووك ، ناووك ئاسا ، نـاووکی ئاسکی موشـك ، بڕوانە (موشك) .

**ناکـام** : بێبـەش ، بێمـراز ، نامراد ، ئـەو کەسەی بە هیـواو ئامانجی نەگەیشتبێ .

**نال** : قامیش ، ئەو قامیشـەی بۆ نووسین بە کار دەهێنرێ ، ناووکی قامیش ، قەڵەم .

**نالی** : (١) نازناوی خدری کوڕی ئەحمـەد شـاوەیسی ئـالی بـەگی مکایێلی شارەزووری‌یە خاوەنی ئەم دیوانەیە . (٢) نیسبەتە بۆ ( نال ) ، بڕوانە ( نال ) .

**ناڵە** : ئـاوازی بەسـۆز ، ئـەو دەنگەیە کە لە دەردو ئازارو سۆزی دڵەوە دەردێ .

**ناڵین** : ناڵە ، ناڵەناڵ ، ناڵەکردن ، گریانو زار .

**نام** : بڕوانە (ناو) .

**نامە** : نووسین ، نووسـراوە ، کاغەز ، کتێب ، **لاپەڕە** .

**نامە سـیاه** : **لاپـەڕە** ڕەش ، کینایەتـە بـۆ کـەسی تاوانبـارو گوناهکار .

**نامووس** : ووشەیێکی گریکی‌یە ، (١) ئابڕوو ، پایەی بڵند ، گەورەیی ، داوێـن پاکی ، نەگـەڕان بە دووای شەهوەتدا ، دوور کەوتنەوە لـە گوناه و تاوان . (٢) ئاگادار لە کاری نهێنی ، کەسی پسپۆڕو بە هۆش . (٣) ئەو جێیەی کـە ڕاوکەر خۆی تێدا دەشارێتەوە .

**نانی نانی** : چڵێسـی ، چـاو چنۆکی ، ماڵان گەڕی ، نەوسنی ، ئەو کەسەی هەموو بێبەروایی‌یێك بکا بۆ نان .

**ناو** : ووشەیێکە کەس یا شت بە ئەوەوە دەناسرێ .

**ناوبراو** : ناو نراو ، ئەوەی ناوی هاتووە .

**ناودان** : سولاوکە ، پلووسك ، لوولەیێکە لە دار یا مەعدەن دروست دەکرێ‌و لە قەراخ سەربانەوە شۆڕ دەبێتەوە خووارەوە بۆ ئەوەی ئاوی بارانی پێ بڕژێتە سەر زەوی .

**نایب (نائِب)** : جێ‌نشین ، جێ‌گر ، کەسێکە لە باتی یەکێکی تر کاروبار دەگەیێنێتە ئەنجام .

**نەباتات (نباتات)** : کۆی (نەبات = نبات)ە ، گیا ، هەموو شتێکی کە لە سەر ڕووی زەوی بڕوێ ، وەکو گوڵ‌و گیاو دارو درەخت .

**نەپشکووتوو** : (١) نەکراوە ، دەم نەکراوە ، لە چرۆ دەرنەچوو . لە قاووغ‌و قەپێلك دەرنەچوو . (٢) سەرمۆر ، دەست لێ‌نەدراو ، کون نەکراو ، نەسمراو .

**نەتیجە (نتیجە)** : ئەنجام ، زادە ، ئەو شتەی لە شتێکی تر دێتە دەرێ .

**نەجات (نجات)** : ڕزگار، ڕزگاری، ئازاد ، ئازادی .

**نەجاشی ـ نەجاشی (نجاشی)** : لەقەبی پادشایانی حەبەشەیە ، کینایەتە بۆ ڕەشی .

**نەجد (نَجد)** : (١) هەرێمێکی گەورەیە ( ٠٠٠ر٣٩٠ر١کم٢ ) لە جزیرەی عەرەب ، کشتوکاڵی دار خورمایە ، ماڵاتیشی لێ پەروەردە دەکرێ . (٢) بیابانی گەورەو فراوان‌و بڵند .

**نەجم (نَجم)** : ئەستێرە .

**نەجمی ڕەجمی شەیتان** : کشان‌و ڕژانی ئەستێرە ، دەڵێن تیرە مەلایکەتان لە شەیتانی دەگرن .

**نەحیف (نحیف)** : لەڕ ، لاواز ، تەنك .

**نەحوو (نحو)** : (١) زانستی‌یێکە لە بابەت ئیعراب‌و دەستووری ڕاست خوێندن‌و دروست نووسینی زمانی عەرەبی‌یەوەیە . (٢) وەکو ، لا ، ڕێکە .

**نەحر (نَحر)** : سەربڕین ، کوشتنەوە ، قوربانی‌کردن ، سەربڕینی ووشتر .

**نەحل (نَحل)** : هەنگ ، مێشەنگوین .

**نەخیل (نخیل)** : دارخورما .

**نەخۆش** : دەردەدار ، ناساغ ، بریندار .

**نەخت** : کەم ، بەش ، چۆر ، هەندێ .

**نەختێ** : بڕوانە (نەخت) .

**نەخچیر** : (١) ڕاو ، ڕاوو شکار . (٢) نێچیر ، ئەو حەیوانەی کە ڕاو دەکرێ . (٣) بزنە کێوی .

**نەخل (نَخل)** : دارخورما .

**نەدامەت (نَدامت)** : پەشیمانی ، درێغ ، حەسرەت ، خەم ، دڵگیری .

**نەدەم (نَدَم)** : بڕوانە (نەدامەت)

**نەدب (ندب)** : ڕۆ ڕۆ و گریـــان و لە خۆدان و شین و شەپۆڕ بۆ مردوو .

**نەرد** : تاوڵە، یاری‌یێکە ئالەتەکەی لە شـتـرەنج دەکـا بریتـی‌یە لـە تەختەیێک‌و سی پووڵ‌و دوو زار ، دوو کەس بەجارێ یاری دەکەن .

**نەرم** : هەمـوو شـتێکی ووردو لووسی وەکو ئـارد ، دژی ڕەق ؛ ڕاست‌و لووس .

**نەرم‌و زەرق** : ڕەنگ ، ئەلوان .

**نەرمی** : نیسـبـەتە بۆ (نـەرم) بڕوانە (نەرم) .

**نەر** : نێر ، هەمـوو ئادەمـزادو حەیوانێکی خاوەنی ئەندامی پیاوەتی ، بێ ، دژی مێ .

**نەزارەت (نظارت)** : (١) بینین ، ڕووانـین ، تەماشـا کـردن ، چاوەڕووانی ، چاو لـە ڕێ بوون . (٢) زیرەکی ، فەراسەت .

**نەزاکەت** : بێ گەردی ، خوو و ڕەووشتی چاك ، ئەدەب ، کردەوەی پەسند ، نازکی ، ناسکی .

**نەزەر (نظر)** : (١) ڕووانـین ، نووارین ، نیگا کـردن ، تەماشـا کـردن . (٢) دوور بینـی ، بـیر ، خەیاڵ ، لێکدانەوە .

**نەزەرباز** : چاو باز ، ئەو کەسەی تەماشای جوانان دەکا .

**نەزەرکردن** : تەماشـا کـردن ، ڕووانین .

**نەزەرگە** : جێـگەی ڕووانـین ، ئەو جێ‌یەی تێیدا تەماشای جووانان دەکرێ ، ئەو جێ‌یەی جووانانی لێ دیارە .

**نەزیر (نذیر)** : ترسێنەر ، ئەوەی ترس دەداتە خەڵکی ، ئەوەی خەڵکی دەترسێنێ ، ئەوەی ئاگاداری خەڵکی دەکـاو ترسیان دەداتێ بـۆ ئەوەی کاری خراپ نەکەن .

**نەزیر (نظیر)** : وەك ، وەکو ، وەك یەك ، بەرامبەر ، هاوتا .

**نەزدیك** : (١) نزیك ، شتێك کە لە ژێر دەستـدا بێ ، ماوەی کەم ، دژی دوور . (٢) پێش هەمـــوو شتێك ، کن هەموو شتێك ، خۆیی‌و کەس‌وکار ، هاوسێ .

**نەزع (نزع)** : هەڵکەندنی شتێك لە جێی خـۆی ، گیان کێشـــان ، گیان‌دان .

**نەزم (نظم)** : (١) شیعر ، قسەی کێش‌و قافیەدار ، دژی پەخشـان . (٢) ڕێکوپێك کردن ، جووان کردن ، بە ڕستەوەکردنی مرواری .

**نەسیب (نصیب)** : بـــەش ، بەهرە ، بەخت .

**نەسیم** : بڕوانە (شەماڵ) .

**نەسب (نصب)** : (١) تیپـــی سـەردار لـە زمـانی عـەرەبی‌دا نیشـانەی « ً »یە . (٢) دانـان ، دامەزران ، ڕێك‌خستن .

**نەسترەن** : گوڵێکی بۆن خۆشە، ڕەنگی سوور یا سپی دەبێ ، لـە سەر هەر لقێك چەند گوڵێـــك دەپشکوێ ، دارەکەی دڕکاوی‌یە .

**نەستەق** : بە ڕێ‌و جێ .

**نەسج (نسج)** : چنین ، چنراو ، تەنین ، تەنراو .

**نەسر (نثر)** : پەراگەندە کردن ، پەخشان ، قسەو ووتەیێك شیعر نەبێ .

**نەسرین** : گوڵێکی سپی‌و بۆن خۆشە لە کوێستانان دەڕوێ .

**نەسس (نص)** : قسەی بە جێ ، قسەی دیارو ئاشکرای کە لە مانایێك زیاتر هەڵنەگرێ ، تێکست .

**نەشات (نشاط)** : شادی ، شادمانی ، خۆشی ، بەختیاری ؛ جموجۆڵی ، گەرمی‌و بەهێزی لە کار کردندا .

**نەشئە (نشأة)** : تازە پەیدا بوو ، پێ‌گەیشتوو ، زیندوو بووەوە .

**نەشئەگاه** : جێ‌ی پەیدابوون‌و پێ‌گەیشتن ، جێ‌ی ژیان ، جێ‌ی زیندەگانی کردن، جێ‌ی نەشئونەما.

**نەشئونەما** : پەیدا بوون‌و پێ‌گەیشتن ، گەورە بوون .

**نەشر (نشر)** : (١) بڵاو کردنەوە ، پەراگەندە کردن ، بڵاو کردنەوەی دەنگوباس . (٢) هەڵخستنی جلوبەرگ‌و پارچەی شووراو . (٣) زیندوو کردنەوە ، زیندوو کردنەوەی مردووان لە ڕۆژی قیامەتدا . (٤) دژی (لەفف) ، زاراوەیێکە لە شیعردا بە کار دەهێنرێ . بڕوانە (لەفف‌و نەشر) .

**نەشکفتە**: نەکراوە، نەپشکووتوو.

**نەعت (نعت)** : (١) پێدا هەڵگوتن، وەسف کردنی یەکێك بە چاکی ، دەرخستنی چاکەی کەسێك ، ستایش . (٢) ئەو جۆرە شیعرەیە کە بۆ وەسف‌و مەدحی پێغەمبەری موسوڵمانان دادەنرێ .

**نەعش (نعش)** : دارەمەیت ، تابووت ، جەنازە .

**نەعلەین (نعلین)** : جووتی (نەعل = نعل)ە ، جووتە پێڵاوێکە پاژنەی نی‌یەو سەری دانەپۆشراوە ، بە زۆری پیاوانی ئایینی لە پێ‌ی دەکەن ، سۆل .

**نەغمە (نغمە)** : ئاواز ، ئاهەنگ ، سروود ، گۆرانی .

**نەفەس (نفس)** : با ، هەوا ، هەناسە ، ئەو بایەیە کە لە کاتی هەناسەکێشاندا لە نێوان سی‌و دەمدا دێ‌و دەچێ .

**نەفی (نفی)**: (١) دوورخستنەوە، نەبوون کردن . (٢) دەرکردن ، ئاوارە کردن ، دوور خستنەوەی کەسێك لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر .

**نەفیس (نفیس)** : شتی نایاب‌و بەنرخ ، شتی گران‌و جوان ؛ ماڵ‌و سامانی زۆر .

**نەفخ (نفخ)** : (١) فوو تێ‌کردن ، با تێ‌کردن ، پف کردن . (٢) شانازی‌و لووت بەرزی .

**نەفخی سوورِ (نفخ صُور)** : لێدانی شەیپوور لەلایەن ئیسرافیلەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ، بڕوانە (سوورِ) .

**نەفس (نَفْس)** : گیان ، لەش ، تەن ، جەستە ، خوێن ، جەوهەری هەموو شتێك .

**نەفسی ئەممارە (نفس امّارة)** : گیانی شەیتانی کە ئادەمزاد فریو دەداو هەڵیدەخەڵەتێنێ بۆ کاری ناپەسەندو خراپ .

**نەقد (نَقد)** : (١) پاككردنەوە ، جودا کردنەوەی پارەی ساغ لە قەڵب ، دەرخستنی جوانیو ناشیرینی قسەو ووتارو شیعر . (٢) پووڵ ، پارە ، نرخ .

**نەقدیدڵ** : زێڕی دڵ ، دڵی بە برەو .

**نەقش (نَقش)** : ڕەنگ ڕشتن ، کێشانی وێنەو ڕوخساری کەسێك یا شتێك .

**نەقشین** : نەقشکراو ، بڕوانە (نەقش) .

**نەقشبەند** : (١) وێنەکێش ، ئەو کەسەی وێنە دەکێشێو نەقش دەکا . (٢) نەقشبەند=نەقشبەندی، ناوی تەریقەتێکی دەروێشی‌یە گۆیا شێخ بەهائەددین (١٣٨٩ز مردووە) دایهێناوە ، دوو ڕا بەرامبەر لەقەبی بەهائەددینەوە هەیە کە نەقشبەندی‌یە ، یەکەمیان دەڵێ : نەقشبەند ناوی گوندێکە لە گوندەکانی شاری بوخارا مەڵبەندو جێگەی ژیانی شێخ بووە ؛ دووەمیان دەڵێ : لە بەر ئەوەی شێخ هەموو کاتێکی بە زیکرو تەهلیلە بردۆتە سەر ناوی حەق لە دڵیدا نەقشی کێشاوە لە بەر ئەوە نەقشبەندیان پێ ووتووە . تەریقەتی نەقشبەندی لە ووڵاتانی چینو هیندستانو تورکستانو کوردستاندا بڵاو بووەوە ، دامەزرێنەری ئەم تەریقەتە لە کوردستاندا خالیدی شارەزووری‌یە (١٧٧٩–١٨٦٢ز) .

**نەك** : نەوەك ، تەنیا .

**نەکیر** : (١) بڕوانە (نەکیرو مونکەر) . (٢) (نەکیرە = نکِرە) ، نەناسراو ، زاراوەیێکی زانستی‌ی نەحوی عەرەبی‌یە .

**نەکیرو مونکەر** : ناوی دوو فریشتەیە لە ئەفسانەی ئاینیدا دەڵێ لە پاش مردنی ئادەمزادو ناشتنی دێنە ناو گۆڕەوەو لە کارو کردەوەی سەر دنیای دەپرسن .

**نەکس (نکس)** : سەراو ژێر کردن ، سەرەو خووار کردن ، سەرنگوون کردن ، سەر کردنە ژێرەوە ، هێنانە خووارەوە .

**نەگەیشتوو** : نەگەیبو ، کامڵ نەبوون .

**نەم (نَم)** : (١) نم ، تەڕی ، تەڕایی ، دڵۆپە . (٢) بۆن .

**نەما** : نوواندن ، پیشاندان ، ئاشکرا ، دیار ،، ڕووناك .

**نەمام** : گیاو داری تازە

پێگەیشـــــتوو ، هەموو کەس و شتێکی تازە پێگەیشتوو .

**نەمەت (نمط)** : ڕێـــــگە ، ڕێو شوێن ، شـێوە ، جـۆر ، خـوو و ڕەووشت ، ڕوخسار .

**نەمەد (نمد)** : پینەو پەڕۆ ، ئەو پارچە درشتەو بێ کەڵکانەیە کە لە قوماش دەمێننـەوەو لـە یەکتـری دەدرێـنو کڵاو یـا ڕایەخیـان لێ دروست دەکرێ .

**نەمەد پۆش** : ئەو کەسەی جلو بەرگـی پینەو پـەڕۆی دەرویێشـی دەپۆشێ .

**نەمەك (نمك)** : خوێ .

**نەمەکین (نمکین)** : نیسبەتە بـۆ (نەمەك) . (١) بەخوێ ، پڕخوێ ، بەتام ، (٢) جووان ، ڕەنگین .

**نەمەك پاش** : سوێری پژێـن ، خوێواو بڵاو کەرەوە .

**نەو** : نوێ ، تازە ، هەموو شتێکی تازە ، دژی کۆن .

**نەوا** : (١) ئـاواز ، ئاهەنـگ . (٢) نـاوی ئاوازێکی تایبەتی‌یـە . (٣) ماڵو سامان ، هۆی زیندەگانی . (٤) خواردەمەنی .

**نەوالە (نوالە)**: (١) گونکە هەویر ، ئەنگوتك ، مـستێك لە هەویـری ئاردی گەنم . (٢) پـاروو ، توێشە ، ئەو خۆراکەی بەشی ژمێك دەکاو بۆ یەکێك دەنێررێ .

**نەوبە (نوبَت)** : نۆبـەت ، کاتو سەردەمی شتێك یا کارێك .

**نەوبەر** : نۆبەرە ، میوەی تازە ، ئـەو میوەیـەی کە تـازە هاتۆتـە بازاڕەوە ، منداڵی یەکەمی ئادەمزاد،

**نەوبەهار** : (١) سەرەتای بەهار ، کـــەژی بەهـــار . (٢) نـــاوی ئاتەشگەدەیێك بووە لە شاری بەلخ ، هەندێ دەڵێن بوتخانەی بوودی‌یان بووە . (٣) جێگەی نوستن ، جێگەی نوستنی ژنو مێرد .

**نەوحوسن** : تازە جووان .

**نەورەستە** : تـازە ڕوواو ، تازە شین بوو ، نەونەمام ، نەو نیهال .

**نەو شکوفتە** : تازە پشکووتوو ، گوڵێك تازە کرابێتەوە ، گوڵی تازە .

**نەوشکۆفە** : خونچەی تـازە ، بڕوانە (غونچە) .

**نەوع (نوع)** : (١) چەشـــن ، جۆر ، تاقم ، پۆل . (٢) لە زاراوەی زانستی‌ی مەنتیقدا نەوع لە جنس تایبەتی‌ترە ، جنس لـە نەوع پێك دێ ، نـەوع لە سنف پێـك دێ ، سنف لە فەرد پێك دێ .

**نەومێد** : نائومێد ، ئەو کەسەیە کە ئومێـدی بە گەیشـتن بە ئامانـج نەبێ .

**نەومێدی** : نائومێدی .

**نەونەمام** : نەمامی تـازە بڕوانە (نەمام) .

**نەوێژ** : نەبێژ ، ئەوەی قسە ناکا، ئەوەی نابێژرێ .

**نەهار (نهار)** : ڕۆژ ، دژی شەو .

**نەهی (نهی)** : ڕێ لێ گرتن ، ڕێ نەدان ، مەنع کردن .

**نەهرەین (نَهرَین)** : دوو ڕووبار ، دوو زێ ، کینایەتە بۆ دوو چـاوی فرمێسکاوی .

**نەهرەینی دوو چاو** : فرمێسکی زۆری دوو چاو .

**نەهری** : نیسبەتە بۆ (نەهر) ، ڕووبار ، زێ .

**نەهری کەوسەر** : ڕووبـــاری کەوسەر ، ئاوی کەوسەر ، بڕوانە (کەوسەر) .

**نـەی** : (١) قامیش ، قەمیش . (٢) نای ، ئالەتێـکی مۆسیقایە لـە شمشاڵو بلوێر دەکا .

**نەیرەنگ** : فێڵ ، فریو ، مەکر ، حیلە ، ئەفسوون ، سیحر .

**نەی سووار** : کینایەتە بۆ باڵووڵی دانـا ، بـــڕوانە ( بەهلــوول ) ، نێزەدار .

**نەیســـتان** : قامیشــــەڵان ، قەمیشـەڵان ، ئەو جێیەی قامیشی زۆری لێ بڕوێ .

**نەیشەکەر** : قامیشی شەکر .

**نەیر (نَیّر)** : ئـەوەی ڕوونـاکی دەدا ، ئەوەی ڕۆشنایی دەدا ، زۆر ڕووناكو درەوشاوە .

**نەیری ئەعـزەم (نَیّر اعـظم)** : ڕۆژ ، خۆر .

**نیزاع (نِزاع)** : شـــەڕو شـــۆڕ کردن ، دوژمنایەتیو سەرکێشی ، جەنگ کردن ، کێشمەکێش .

**نیسار (نِثار)** : (١) پەراگەندەیی ، پەرش‌وبڵاوی . (٢) ئەو شتانەیە کە بە سەر بووك یا هەر کەسێکی تردا دەکـرێ لە ســەردەمی خۆشـــیو بەختیاریدا لــە شیرینیو پـارەو شتیتر .

**نیسان** : مانگی گوڵان ، مانـگی چووارەمی ســاڵنامەی ڕۆژئاوایە ، مانگی دووەمی بەهارە .

**نیسبەت (نِسبَت)** : خـــزمی ، نزیکایەتی ، پێوەندی لە نێوان دوو شت یا دوو کەس ، لە یەك چوون لە نێوان دوو شت .

**نیسوان ( نێسوان )** : ژنان ، لـە ( النسـاء )ەوەیە ، کۆی (المــراة)ی عەرەبییە ، ژن ، ئافرەت .

**نیشان** : (١) ئامانجی تیر ، ئـەو جێیەی خاوەن چەك دەیەوێ لێی بدا . (٢) شوێن ، وێنەی بەجێماو . (٣) مەدالیە ، پارچەیێکە لە زێڕ یا زیو یا مەعدەنی تر دروست دەکرێ بۆ ڕێــز لێنـان دەدرێتــە کەســی سەرکەوتوو یا گەورە .

**نیشانە** : نیشان گرتن ، ئاراستە کردن ، ئـەو جێیەی کـە خاوەن چەك دەیەوێ لێی بدا .

**نیشاندان** : ئاراســتە کـردن ، ڕابەری کردن .

**نیشتن** : (١) لە سەر ڕووی ئاودا وەستان . (٢) هاتنــە خووارەوەی باڵندەو وەستانی لـە سەر ڕووی زەوی .

**نیعـــــەم (نِعَم)** : کـــــوی ( نیعمە = نِعمة ) یە ، بڕوانـــــە ( نیعمەت ) .

**نیعمەت (نِعمت)** : چاکە ، چاکی ، خۆشـی ، دەوڵەمەنـدی ، مـاڵو سامان .

**نیفـاق (نِفـاق)** : دوو ڕوویـی کردن ، دوو ڕوویی ، مەکـرو ڕیا کاری .

**نیك** : چاك ، باش ، جوان .

**نیکاح (نِکاح)** : مارەبڕین ، شوو کردن ، مێرد کردن ، ژن هێنان .

**نیگاه (نِگاه)** : چـــاو ، تەماشـا کردن ، ڕوانین ، نووڕاین ، ڕوو تێ کردن .

**نیگار (نِگار)** : (۱) بـــــوت ، خۆشەویست ، دلبەر، مەعشووق، مەحبووب . (۲) نـەقش ، وێنە ، دیمەن .

**نیگارین** : ڕەنگـــین ، هەمـــوو شـتێکی ڕەنگاوڕەنگ ، جـــووانو ئارایش بوو ؛ جووان ، مەعشووق ، مەحبووب .

**نیگارش (نِگارش)** : نووسـین ، نەقشو نیگار کردن ، وێنە کێشان .

**نیگاھ** : بڕوانە (نیگا) .

**نیگەھ** : بڕوانە (نیگا) .

**نیگەھبان (نِگهبان)** : پاسەوان ، دەرگاوان .

**نیگەھدار (نِگهدار)** : پارێزەر ، ئەوەی چاوی لە شتەو دەیپارێزێ .

**نیل** : (۱) ڕووبارێکە لە ئەفەریقا (٦٥٠٠کم)ە درێژترین ڕووبارە لـە جیهاندا لە زەریاچـەی ڤیکتۆریاوە هەڵدەقوڵێ بە ئۆگەندەو سـۆداندا تێدەپەڕێ ، لەگەڵ زەریای غـەزال تێکەڵ دەبێ ، ئنجا دەچێتە وولاتـی نۆبەو میسرو دەڕژێتە ناو زەریـای سـپی‌ی ناوەڕاست . (۲) مـۆر ، ڕەنـگی نیلـی ، ووشـــەیێکی سانسکریتی‌یە ، گیایێکە لە وولاتانی گەرمی وەکو هیندسـتان دەڕوێ ، بڵندی‌ی دەگاتە مەتـرەیێك ، لق‌و پۆپی دەچنە ناو یـەك ، گوڵی وەکو هێشوو وایە ، سـوورو بێ‌بۆنە . لق‌و پۆپی نیل لە پاش دوورینەوە لە ناو ئاو دادەنـرێ دووای ١٧ تا ٢٠ سەعـات لە ئاو دەردێنـرێ لە بەر هەتـاو دادەنرێ ، تا بە تـەواوی ووشك دەبێتـەوە ، ئەمە مـاددەی نیللی‌یە کە لە نەقش کردنو وێنە کێشـانو ڕەنگ‌ڕێـژی‌دا بـە کار دەهێنرێ .

**نیلۆفەر** : گیایێـکی خشـۆکە لە لاولاو دەکا ، لـە دەوری شتومەکی نزیك خۆی دەئـاڵێ ، یا بە سـەر دیواردا هەڵدەگەڕێ ، شـێوەی گوڵی شەیپووری‌و ڕەنگی نیلی‌یە .

**نیم** : (۱) نیو ، بەشێك لـە دوو بەشـی شـت . (۲) ووشـەیێکی هیندی‌یە ، درەختێـکی گەورەیە ، گەڵای ووردو ناسکە ، گوڵی وەکـو هێشـوو وایـەو بۆن خۆشـە ، لە هیندستاندا دەڕوێ .

**نیمەر** : نیـوەڕۆ ، ناوەڕاسـتی ڕۆژ .

**نیم نیگاھ** : نیـوە تەماشا ، لـە

تێلآیی چاوەوە تەماشـــا کردن ، بە دزی تەماشـــا کـــردن لـــە ڕووی نازەوە .

**نیوە :** نیو ، بەشێك لە دوو بەشی شت .

**نیهـــال :** (١) دارو درەختـــی جووانو ڕێك ، درەختێك کە تـازە ڕووابێ‌و پشـکووتبێ . (٢) ئـەو دارەیە کە ڕاوکەر بـە دەستی‌یەوە دەگـرێ بـۆ ترسـاندنی نێچـیر . (٣) ڕاوو شکار .

**نی‌یە :** نەبوون ، نادیار .

**نییەت (نِیَّت) :** بڕیار ، هەوڵو کۆشش ، مەبەس .

**نێرگەل :** کۆمەڵێك پیاو ، تیپێك نێرینە ، دری مێگەل .

**نێرگس :** گوڵێکی سپی‌ی بچووکی بۆن خۆشە ، لە ئەدەبیاتدا کینایەتە بۆ چاوی دلبەری خۆشەویست .

**نێرگس نیـگەھ :** چـــاوی وەك نێرگس .

**نێژتن :** ناشتن ، شاردنەوە .

**نێش :** (١) نووکی تیـژ ، وەکـو دەرزی‌و خەنجەرو نەشتەرو هی‌تر . (٢) چـزووی هەندێ زینـدەوەری وەکو دووپشك‌و زەردەواڵەو مار کە زەهریان بەهۆی ئـەوەوە دەڕژێننە ناو لەشی ئادەمزاد .

**نێشان :** کـۆی (نێش)ە ، بڕوانە (نێش) .

**نێو :** ناو ، ناوەڕاست ، نێوان ، بەین .

**نێو چەوان :** پێشی سەر لە ژێر مووەوە تا برۆیان .

**نوتفە (نُطفە) :** (١) ئاوی سافو پاك ، ئاوی زوڵاڵ . (٢) ئـەو ئاوە کەمەی کە لە بنی دەولك یا مەشکە دەمێنێتەوە . (٣) ئاوی پیاو یاژن ، تـــۆوی پیـــاو یـــا ژن . (٤) ئەو جانـەوەرە بچـووکەیە کە شەهوەت پێك دێنێ .

**نوتق (نُطق) :** گوتن ، قسەکردن ، بە زمان هاتن .

**نوجووم (نُجوم) :** کۆی (نەجم = نجم)ە ، بڕوانە (نەجم) .

**نوخوون :** سەراوژێر ، سەرەو خووار .

**نوزهەتگەھ :** سەیرانـگا ، جێی سەیرانو گەشت‌و ڕابواردن .

**نوشوور (نُشُور) :** زینـــدوو کردنـەوە ، زینـــدوو بوونـەوەی مردووان لە ڕۆژی قیامەتدا .

**نوفوور (نُفُور) :** ڕاکردن ، دوور کەوتنەوە ، لێ دوور کەوتنەوە .

**نوقەبا (نُقَباء) :** کۆی (نەقیب = نقیب)ە ، سەرۆك ، پیاوی ماقووڵ ، گەورەی خێڵ‌و قەوم .

**نوقەت (نُقَط) :** کۆی (نوقتە = نقطە)یە ، بڕوانە (نوقتە) .

**نوقووم بوون :** گوم بوون ، وون بوون ، لە پێش چاو بزر بوون وەکو ئەوەی ئادەمزاد بکەوێتە ژێر ئاو یا لمی بیابان یا ناو چاڵ یا هەر شتێکی تر .

**نوقته (نقطه)** : نیشـــانەیێکی بچووکو خـڕە لە ژێر یا لـە سەر هەندێ تیپی نووسیندا هەیە ، وەکو نوقتەی ژێر تیپی « ب » .

**نوقته نوقته** : نوقته لە دووای نوقته ، نوقته بە نوقته .

**نوقسان (نقصان)** : کەمی ، کەم بوون .

**نوقل** : (١) ئەوەی دەبێتە مەزەی شەرابو تامی دەم دەگۆڕێ وەکـو فندقو فستقو بادام . (٢) جۆرە شرینی‌یێـکە لە شـەکر دروسـت دەکرێ بە شێوەی فندق یا بادام .

**نوکته** : (١) نوختـەی ڕەش لـە ڕووی شتێکی سپی ، یا نوختەی سپی لـە ڕووی شـتێکی ڕەش . (٢) مەسەلەیێکی وورد لە ئەنجامی بیرکردنەوەیێکی قووڵ پیاو تێی بگا . (٣) قسـەی خۆش کـە کار لە پیاو بکاو ببێتە هۆی بزەو پێکەنین .

**نوکته سەنج** : کەسی ووردبـینو زیرەکو قسە خۆش .

**نوور** : ڕۆشـنایی ، ڕوونـاکی ، ڕۆناهی ، ڕووناکی‌ی چرا یا ڕۆژ .

**نـووره** : (١) ئۆکسـیدی کالیسـیۆم ، شـتێکی سـپی‌یە لە برژاندنی جۆرە بەردێك دروسـت دەبێ ، هەر کاتێ ئاو بکرێتە سەری دەتەقێو گەرمایی لێ پەیدا دەبێ ، لە کارخـانەی سابوونو شـەکرو دەبـاغیو شـتی تردا بـە کـار دەهێنـرێ . (٢) ئۆکسـیدی کالیسیۆمو زرنیخە بۆ کردنی مووی لەشی ئادەمزاد بە کار دەهێنرێ .

**نووری** : دەبێ نـاوی کابرایێك بـووبێ بـە ڕوودباری ناسـراوە ، هـاوڕێی نـالی بـووە ، بـڕوانە (ڕوودبار) .

**نووری عەلا نوور (نور علی نور)** : نوور لە سـەر نوور ، ڕووناکی‌ی زۆر ، نووری زۆر .

**نووزه کردن ــ نووزین ــ نووزان** : دەنگی ناڵەو گریان .

**نووسین** : بیرێك بە قەڵەم بخرێتە سەر ڕووی کاغەز .

**نووکه** : بڕوانە (نووکە نووك) .

**نووك** : (١) سەری تیژی هەموو شتێك ، وەکو دەرزی ، قەڵـەم ، شیر ، خەنجەر ، چەقۆ .. هتد .. (٢) بڕوانە (نووکە نووك) .

**نووکه نووك** : گریـان ، ناڵـە ، ناڵەو گریان .

**نوون** : تیپی « ن » .

**نۆ** : ژمارە « ٩ » ژمارەی پاش هەشتو پێش دە .

**نۆ ئاسمان** : بە پێی ئەفسانەی ئایینی ئاسمان حەوت یا نۆ چینە ، بارەگـای خـودا لـە ئاسـمانی دووایی‌دایە .

**نۆ چەرخی ئەخزەر** : نۆ فەلەکی سـەوز ، نـۆ فـەلەکی شین ، بڕوانە (نۆ ئاسمان) .

**نۆ سەحیفه** : نۆ پەڕە ، نۆ چین ، بڕوانە (نۆ ئاسمان) .

**نۆش :** هەنگوین ، هەموو شتێکی شیرین ؛ هەمــوو خواردەمەنییێکی خۆش‌و بەتام، خواردنێك زوو هەزم ببێ .

**نۆکـەر :** خزمەتــکار ، پێش خزمەت ، غولام .

**نوژ ـ نوێژ :** پەرســتن ، نیاز ، بەندەیی نوانــدن ، خـۆ خـووار کردنەوە بۆ پیشـــاندانی بەندەیی ؛ پەرستنێکی تایبەتی‌یە لـە ئایینی ئیسلام‌دا ڕۆژی پێنج جار دەکرێ .

**نوژی شێوان :** نوژی مەغریب ، نوژی کاتی ڕۆژ ئاوا بــوون ؛ کاتی ڕۆژئاوا بوون ، ســەردەمی دەست پێ‌کردنی تاریکی .

**نزانم ـ نەزانم :** نازانم ، کورت کراوەی « نازانم »ە ، لە شــێوەی کرمانجی‌ی سەرووی زمانی کوردی بەم‌جۆرە لە دەم دێتە دەرێ .

**نشینگا :** جێ‌ی دانیشتن ، جێ‌ی نیشـــتنەوەی باڵنــدە ، جێ‌ی نشینەوەی باڵندە .

**نموونە :** (١) وەکو ، وەك ؛ پەیداو ئاشکرا . (٢) بەشێك لە شتێك بۆ پیشـاندان . (٣) ناتەواو ، نەزان لە کارو کردەوە .

**نواڕین :** تەماشـــا کــردن ، ڕوانین .

**نواندن :** پیشـاندان ، دەرخستن .

**نوێژ :** بڕوانە (نوژ) .

**نیاز :** پێــویست ، مەیــل‌و ئارەزوو ، دیــاریی دەروێشان ، نەزرێك ،کـە دەگیرێ بۆ بـە ئامانج گەیشتن‌و دەدرێتە جێ‌یێك .

**نیەت (نیـَّت) :** مەبەس ، بڕیار ، ئاهەنگ بڕوانــە ( نییەت ) .

## و = w

**وا :** (١) ئاوا ، بەم جۆرە ، بەم چەشــنە ، بــەم شێوەیــە . (٢) کرانــەوە ، کردنەوە ، فــراوان کردن . (٣) لە عەرەبی‌دا ووشەی هــاوارو دادو فەریــادە بۆ بەهــانا گەیشتن بە کار دەهێنرێ .

**واجیب (واجِب) :** پێویســت ، ئــەو شتەی کــردنی پێویســتەو نەکردنی گوناه و تاوانە .

**وادی :** گەلی ، دەربەند ، دەرە ، شیو ، بۆشایی ، نێوان دوو شاخ .

**وادی‌یی ئەیمەن :** خاکی پیرۆز ، ناوچەی کەنعان ، ئەو جێ‌یەی دەنگی حــەق بــە موســا پێغەمبــەری جوولەکان گەیشت .

**واریس (وارِث) :** مــیرات گر ، ئەوەی میرات دەبــا ، ئەو کەسەی میراتی بــۆ دەمێنێتەوە لــە یەکێکی ترەوە .

**وازیح (واضِح) :** ئاشکرا ، دیار ، ڕووناك .

**واسیتە (واسِطە) :** مــــێ‌ی (واسیت = واسِط)ە ، هۆ ، بــە هۆی ، ئەوەی لە ناوەڕاست دەبێ ،

ئـەو کەسـەی ناوبـژی دەکا بـۆ سەرگرتن و بە ئەنجام گەیشتنی کارێك .

**واسیع (واسع)** : فـراوان ، بەرین ، دژی تەنگ .

**واسیل (واصل)** : پێوەندی لەگەڵ شتێك ، کەسێك یا شتێك پێوەندی‌یان لەگەڵ یەکتری‌دا بێ‌و بە یەکتری‌یەوە بەسترابن .

**واسیل کردن** : بردن ، گەیاندن ، بردنی شتێك یا کەسێك بۆ لای شتێکی تر یا کەسێکی تر .

**واعیز (واعظ)** : ئەوەی پەندو ئامۆژگاری دەدا ، ئەوەی نەسیحەت دەکا ، ئەوەی وەعز دەدا .

**واعیزی** : نیسبەتە بۆ (واعیز) ، بڕوانە ( واعیز ) .

**واقیف (واقف)** : (١) وەستاو ، ڕاوەستاو . (٢) شارەزا ، پسپۆر .

**والا** : (١) بالا ، بڵند ، بەرز ، پایە بڵند . (٢) جـۆرە قوماشێکی ئاوریشمی‌یە ، (وال)و (والە)ش دەووترێ .

**واو** : تیپی « و » .

**واوەی** : سووك کراوەی ( واوەیل )ە ، بڕوانە ( واوەیل ) .

**واوەیل ! (واویلا) !** : ووشەی داخ و جیگەر سووتانە لە گریان و شین و شەپۆڕی ماتەمدا بە کار دەهێنرێ .

**وە** : وا ، ئاوا ، بەم جۆرە .

**وەبەر** : بە بەر ، کەوتنە ناو .

**وەتەن** : نیشتمان ، مەڵبەند ، جێی لەدایك بوون و ژیان و زیندەگانی .

**وەجاهەت (وَجاهت)** : (١) بوون بە خاوەنی جێ و پایەی بەرز ، ڕێزو گەورەیی . (٢) جوانی و ڕوخساری دڵگیر .

**وەجه (وَجـه)** : (١) ڕوو ، چەهرە ، ڕووی هەموو شتێك . (٢) ڕێگە ، ڕێ و شوێن . (٣) لا . (٤) مەبەس ، بڕیار .

**وەحدەت (وَحدَت)** : تەنیایی ، تەنهایی، بەتەنیا ژیان ، گۆشەگیری.

**وەحشی (وحشی)** : کێوی ، جانەوەری کێوی ، حەیوانێك کە مالی نەبووبێ و لە ئادەمزاد بڕەوێتەوە .

**وەخت (وقت)** : وەقت ، کات ، سەردەم ، بەشێك لە زەمان و ڕۆژگار .

**وەختە** : کاتی هاتووە ، سەردەمی هاتووە .

**وەر** : کورت کراوەی (ئەگەر)ە .

**وەرەق (وَرَق)** : (١) بەرگی گوڵ ، پەڕەی گوڵ ، پەلکی گوڵ ، گەڵا . (٢) پارچەی کاغەز یا کتێب یا دەفتەر .

**وەرەقی دیدە** : پەڕەی چاو ، قەپیلکی چاو ، قاووغی چاو .

**وەرین** : گەڵاڕێزان ، هاتنە خوارەوەی تەرزە ، یا گەڵای دار یا هەر شتێکی تر .

**وەرد (ورد)** : گوڵ ، گوڵی سوور .

**وەردە سوورگە :** گوڵی سووری بچووك .

**وەردی :** نیسبەتە بۆ (وەرد) ، بڕوانە (وەرد) .

**وەڕ :** بڕوانە (وەڕین) .

**وەڕین :** دەنگی سەگ ، حەپە .

**وەزارەت (وِزارت) :** وەزیری ، پایەی وەزیری .

**وەزان (وَزان) :** بزووتنەوەی با ، شنەی شەماڵ ، هاتنی با .

**وەزیر (وَزیر) :** (١) ئەو کەسەیە کە سەرۆکی وەزارەتێکە ، یەکێك لە ئەندامانی دەوڵەت . (٢) دەستوور ، ڕێگەدان ، ڕێ خۆش کردن .

**وەزع (وَضع) :** (١) دانان ، خستن . (٢) شێوە ، ڕوخسار ، شکڵ . (٣) نەژاد ، بنیاد .

**وەسەت (وَسَط) :** ناوەڕاست ، ناوەندی هەموو شتێك ، هەموو شتێکی نە باش بێ و نە خراپ .

**وەسیلە (وَسیلە):** هۆ، بەهۆی ، ئەوەیە کە بەهۆی ئەوەوە کەسێك لە یەکێکی تر نزیك دەبێتەوە .

**وەستان :** لە سەر دوو پێ بوون، قیت بوون ، دژی دانیشتن.

**وەسف (وَصف) :** پێداهەڵووتن، دەرخستنی شێوەی شتێك یا کەسێك ، دەرخستنی وەزعی شت .

**وەسڵ (وَصل) :** پێوەندکردن ، بەستن بە یەکتریەوە ، بە یەکتری گەیشتن .

**وەسمە :** ڕەنگێکە لە نیلی دەکا ، ژنان لە ئاودا دەیتۆننەوەو برۆو قژی سەریان پێدەڕێژن یا ڕەش دەکەن .

**وەسمەکێشان :** وەسمە ڕشتن ، وەسمە کردن ، ڕەنگ کردنی برۆو قژی سەر بە وەسمە ، بڕوانە (وەسمە) .

**وەسواسە ـ وەسواس :** ئەندێشەی بەد کە بە دڵدا تێدەپەڕێ ، ئەندێشەی شەیتانیو ئەهریمەنی ، دوو دڵی .

**وەسوەسە :** وەسواسە پەیدا کردن ، ئەندیشەی بەد پەیدا کردن ، بزووتنەوەی هەواو هەوەسی شەیتانی لە ناو دڵدا .

**وەعدە :** (١) بەڵێن ، پەیمان . (٢) سەردەم ، کات .

**وەعدەیی بانگ :** کاتی بانگدان ، کۆتایی شەوو دەست پێکردنی ڕۆژ .

**وەعز (وَعظ) :** پەندو ئامۆژگاریدان ، ئامۆژگاری کردن ، ئاراستە کردن بۆ کاری چاك .

**وەفا (وفاء) :** بە جێ هێنانی بەڵێن ، ڕەچاوکردنی پەیمان ، پاراستنی پێوەندیی دۆستیو هاوڕێیەتی .

**وەفات (وَفات) :** مردن ، مەرگ .

**وەقت :** بڕوانە (وەخت) .

**وەك** : وەکو ، بە وێنەی .

**وەکیل (وکیل)** : نوێنەر، جێگر ، ئەوکەسەی کە باوەڕی پێدەکرێو کارێکی پێ دەسپێرێ ، کەسێك لە لایەن یەکێکی ترەوە دادەنرێ کە کارێك بەئەنجام بگەیێنێ .

**وەکو** : وەك ، بە وێنەی .

**وەگەر** : ئەگەر .

**وەلی** : (١) خاوەن دۆست ، دۆستدار ، یارو ئەو کەسەی بە هانای خەڵکی دەگا لە کاتی تەنگانەدا ، ئەوەی چاودێری‌ی شت دەکاو یاریدەی دەدا ، ئەوەی بەڵێنی چاك کردنی کاری کەسێکی تر دەدا . (٢) بەندەی نزیك لە بارەگای خودا .

**وەلێ** : بەڵام ، مەگەر .

**وەلوەلە (ولولە)** : هەریادو هاوار کردن ، هانا بردن ، ناڵەو شینو شەپۆڕ کردن ، جۆشو خرۆش ، هەراوهووریا .

**وەڵڵاهـ (والله)** : بە خودا ، سوێند خواردن بە خودا .

**وەنەوشە** : گیایێکی کورتە قەدی باریكو گوڵی بچووکی هەیە ، ڕەنگی شین یا زەرد دەبێ ، لە باخچەدا دەڕوێنرێ ، لە تەبیعەتیش‌دا بەهاران لە پێش هەموو گوڵێك‌دا دەردەچێ ، بۆنی خۆشەو گوڵاوی لێدەردەهێنرێ .

**وەها** : بەم جۆرە ، بەم ڕەنگە ، بەم شێوەیە ، ئاوا .

**وەی !** : ئەی ! .

**وەی‌شووم** : لێقەومان ، پەژارە ، کارەسات .

**وەی کردووە** : وای کردووە .

**وەی وەی** : تەعبیرێکە بۆ سەیرو سەرسوڕمان بە کار دەهێنرێ .

**وەیس** : (١) وەیسی قەرەنی ماهیدەشتی ، بە نەتەوە کورد بووە، یەکێکە لە ئایینداروباوەڕ بەهێزانی سەرەتای بڵاو بوونەوەی ئایینی موسولمانی ، گۆیا لە چۆڵو بیاباناندا دەژیا ، دەڵێن لەسەردەمی پێغەمبەردا هێشتا مابوو بەڵام چاوی پێی نەکەوت ، عومەری کوڕی خەتتابی دیوە ، دەڵێن لە شەڕی داگیر کردنی کوردستان لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا کوژراوە (٣٧هـ ـ ٦٥٧ز) ، لە ناو کوردەواری‌دا وەکو وەلی‌یێك پایەیێکی بەرزی هەیە . (٢) هەژاری، دەروێشی . (٣) خوواستەی دڵ ، ئەوەی دڵ دەیەوێ .

**ویساڵ (وصال)** : پێوەندی ، بە یەکتری گەیشتن ، بە یەك گەیشتن .

**ویستن** : خوواستن ، داواکردن .

**ویقار (وقار)** : لە سەرخۆیی ، هێمنی ، گەورەیی .

**ویلایەت (ولایت)** : (١) بەشێك لە وولات کە والی‌یێك فەرمانڕەوایی تێدا دەکا ، بەشێك لە وولات کە بریتی‌یە لە شارێكو دەوروبەری لە دێهاتو ئاوەدانی. (٢) فەرمانڕەوایی،

میرنشـــینی . (٣) نزیکایـــەتی ، خانەخوێی .

**ویلدان (وِلْدان)** : کۆی (وەلەد = وَلَد)ە ، کوڕ ، منداڵی نێرینە .

**وێران** : بڕوانە (وێرانە) .

**وێرانە** : خرابە ، خەرابە ، جێی خرابەو وێران ، دژی ئاوەدانی .

**وێژ** : بڕوانە (گێژ) .

**ویلداش** : هـاوڕێ ، هـەواڵ ، رەفیق ، بـرادەر ، دۆسـت ، لـە ووشەی (یولداش)ی تورکی‌یەوەیە .

**ووجوود (وجود)** : (١) بـوون . (٢) لەش ، جەستە .

**وورد** : ناسك ، بچووك ، باریك . دژی درشت .

**وورده خەیاڵ** : خەیاڵی ناسك .

**ووریا** : هوشیار ، بـە هۆش ، چالاك ، زرنگ .

**ووشك** : (١) بێ ئـاوی ، هـەر شتێکی ئاوو تـەڕایی تێدا نـەبێ ، دژی تەڕ . (٢) گیـای مردووی بێ بەر . (٣) ئادەمزادی نزم .

**ووشکه مەلە** : مەلـە کـردن لە ووشکایی ، ئەو بزووتنەوانەی لـە کاتی مەلە کردندا دەکرێ لە نـاو ئاودا لـە دەرەوەی ئاودا بکـرێ ، بزووتنـەوەو شـایی‌و سـەمای دەروێشـان لـە کاتی هایـو هـوو و تەهلیلەو زیکرو حاڵدا .

**ووشکی** : نیسبەتە بۆ (ووشك) ، بڕوانە (ووشك) .

**ووقوود (وُقود)** : کلپەدار‌بوون، بلێسـەدار بوون ، هاڵاودار بوون .

**وولات** : بڕوانە (مەملەکەت) .

## ه = H

**هاتو نەهات** : بوو و نەبوو ، دووا ڕۆژێك ئەنجامی ئاشکرا نەبێ ، چوونە ناو شتێکەوە ئەنجامی ئاشکرا نەبێ ، فەلسـەفەی (دەبێ یا نابێ ؟) .

**هاتن** : گەیشتن ، ئامادە بوون لە جێ‌یێك .

**هاتنەوە** : گەڕانەوە ، یەکێك لە جێ‌یێك بووبێ‌و بەجێ‌ی هێشتبێ‌و دووبارە گەڕابێتەوە .

**هادی** : پێشـەوا ، ڕێگەی ڕاست پیشاندەر ، ئەوەی ڕێگەی ڕاست پیشان دەدا .

**هادیم (هـادِم)** : وێرانـــکەر ، ئەوەی وێران دەکـا ، ئەوەی شت دەڕووخێنێ‌و لە ناوی دەبا .

**هادیمی لەززات ( هادم اللذات)** : لە ناوبەری خۆشی ، کینایەتە بـۆ مردن .

**هارووت** : ناوی یەکێکە لە دوو فریشـتە ، ئەویتـریان نـاوی (مارووت)ە ، ئەمانە تووشی غەزەبی خودا بوون لە بەر ئەوە لە بیری بابل سەرنگوونی کردن ، ئەگەر کەسێك بۆ مەبەسی فێربوونی جادوو بچێتە ئەوێ فێری دەکەن ، لـە قورئاندا باسیان کراوە .

**هاژە (هاژ)** : سەرلێشـــێواو ، زەبوون ، دەربەدەر .

**هاژەهاژ** : دەنگی ئاو ، خـوڕەی ئاو .

**هالیك (هالِك)** : لـە ناوچـوو ، هیلاك بوو .

**هامـوون** : بیابـان ، دەشـت ، پانایی ، دژی کێو .

**هاوار** : بانگ ، دەنگ ، فریاد ، فەرهاد .

**هاوین** : یەکێ لە چووار کەژەکانی سالە ، لە پاش بەهاردا دێ ، بـە پێی سالنامەی ڕۆژئاوایی بریتی‌یە لەمانگەکانی حـــەزیران و تەمووز و ئاغستۆس .

**هاوی‌یـە (هاوِیـة)** : دۆزەخ ، جەهەننەم .

**هە** : ئـەی ، ووشـــەیێکە بـۆ هاندان‌و ووشیار کردنەوە بـە کار دەهێنرێ .

**هەتا** : تـا .

**هەتاو** : تیشکی ڕۆژ ، شەوق .

**هەتیو** : (١) منـداڵی بێ باوك ، منداڵی باوك مردوو . (٢) تەنیا ، یەکتـا . (٣) منـــداڵی حیـز ، قووندەر .

**هەتك (هَتك)** : (١) پەردەدڕین ، پارچە کردنی پـەردە ، ڕاکێشان‌و هەڵکەنـدنی پەردە لە جێی خـۆی (٢) ڕیسـوا کردن ، ئابڕوو بردن .

**هەدی‌یە (هَدِیّة)** : دیـــاری ، پێشکەش ، ئەرمەغان ، سەوقات .

**هەر** : تەنیا، هەمیشـە، هەموو .

**هەراسان** : (١) ترســـان ، لـە وەزعی ترس‌و لەرزدا . (٢) تەنگ پێ‌هەڵچنین ، تووڕە کردن .

**هەرەس** : ڕووخان، قلیشانەوە، ڕمان .

**هەرچەندە** : لەگەڵ ئەوەی .

**هەرد** : ئەرز ، زەوی .

**هەردوو** : دوو شت پێـکەوە ، دوو کەس پێکەوە .

**هەرزە** : بێ‌بـاك ، بێ‌کەڵـك ، دەبەنگ ، بێ‌کار ، بێ‌سوود .

**هەرزەگو** : ئەوەی قسـەی بێ‌ماناو بێ‌سوود دەکا .

**هەرزە مەرەس** : قرخە مەرمز ، بە تاژی‌یێك دەڵێن کە بغەزرێ‌و بـە چاکی نەکێشرێ ، سـەگی بێ‌قەڵێتەی بەرەڵڵا ، سـەگی خۆری بەرەڵڵا .

**هەرگیز** : هیچ کات ، هیچ‌دەم ، هەمیشـە بۆ نەفی‌یە .

**هەروا** : بەم جۆرە بەم چەشنە .

**هەرومك** : بە وێنەی .

**هەڕاکردن** : ڕاکردن ، غاردان .

**هەزار** : (١) زۆر ، فرە ، گەلێك ، ژمارە « ١٠٠٠ » . (٢) بلبل ، جۆرە بلبلێکە .

**هەزل (هَزل)** : گاڵتـە ، گاڵتەو گەپ ، شۆخی ، قسـەی بێ‌مانا .

**هەست** : بوون ، ووجوود .

**هەسـتان** : هەڵســان ، هاتنـە دەرەوە ، دروست بوون .

**هەستانەوە** : ڕاست بوونەوە لە

پاشێ کەوتن ، فیت بوونەوە لە پاش کەوتن .

**هەل** : فرسەت ، بوونی ماوە .

**هەل** : فرسەت ، بوونی ماوە ، بوونی کات ، بۆ هوشیار کردنەوەیە .

**هەلهەلە** : ئەو دەنگەیە کە لە گەروو دێتە دەرێ ، دەنگی هەراو هوریای خەڵکی لە کاتی ئاهەنگی جەژنو خۆشیو شادمانیدا ، هەراو هووریای دەروێشان .

**هەڵاتن** : (١) ڕاکردن ، مەیدان بەجێ هێشتن . (٢) دەرچوونی ڕۆژو مانگو ئەستێرە . (٣) بزووتنەوەی چاو ، کرانەوەی چاو .

**هەڵاو** : هاڵاو ، گڵپە .

**هەڵدان** : لێدان ، فڕەدان ، هاویشتن .

**هەڵستان** : بڕوانە (هەستان) .

**هەڵکەندن** : لە ڕیشە دەرهێنان ، ترزاندن لە جێی خۆ .

**هەڵکردن** : (١) بڵند کردن . (٢) داگیرساندن، چرا داگیرساندن ، پێ کردن .

**هەڵگرتن** : (١) بڵندکردن ، هێنانە لای خۆ . — (٢) **دەست هەڵگرتن** : وازهێنان لە کار ، ڕاگرتنی کار .

**هەڵواسین** : (١) بەند کردنی شتێك بە شتێکی ترەوە . (٢) لە قەنارەدان ، لە سێدارەدان .

**هەڵهێنان** : کردنەوەی چاو .

**هەم** : (١) بڕوانە ( هەمم ) . (٢) هاو ، وەکو . (٣) لەگەڵ ووشەی عەتفە .

**هەموو** : گشت ، تەواو .

**هەمتا (هَمتا)** : وەکو ، وەك ، وەك یەك ، بەرامبەر ، هاوسەر .

**هەمدەم (هَمدَم)** : هاودەم ، هاوڕێ ، دوو کەس پێکەوە بژین .

**هەمرەنگ** : هاوتا ، وەکو ، دوو شتی لە یەك ڕەنگ بن .

**هەم ریکاب (هَم رِکاب)** : دوو سووار ڕکێفیان ڕاستەو ڕاستی یەك بێ ، کینایەتە بۆ دوو کەسی وەك یەك .

**هەمسەر (هَمسَر)** : هاوسەر ، بەرامبەر ، ژن یا مێرد ، دوو کەس بە باڵا وەکو یەکبن .

**هەم عینان (هَم عِنان)** : دوو کەس جڵەویان وەك یەك بێ ، بڕوانە (هەم ریکاب) .

**هەم قەدەم (هم.قَدَم)**: دووکەس پێیان وەك یەك بێ ، بڕوانە (هەم ریکاب) .

**هەمم (همّ)** : (١) هەم ، غە م. (٢) بڕیار ، مەبەس .

**هەنار** : میوەیێکی درشتە تۆکلی سوور یا زەردی هەیە پڕ لە دەنکی ئاوداری سوورە ، بۆ پاككردنەوەی خوێن بەکەڵکە ، لە ئاوی ڕبەنار دروست دەکرێ ، دەنکەکانی ووشك

دەکرێتەوە (بورمنان)ی پێدەڵێن ، دارى زۆر گەورە نیيە ، گەڵای وووردی سەوزە گوڵی سوورو جووانە .

**هەناسە** : نەفەس ، بزووتنەوەی هەوا .

**هەنای** : کورت کراوەی (هێنای)یە .

**هەنجیر** : میوەیێکی شیرین‌و بەگوشتە ، تۆکڵی زۆر ناسکە لە کاتی شکاندندا ئاوێکی وەکو شیری لێدەردێ ، ناوەوەی پڕە لە دەنکی یەکجار بچووك ، ووشك دەکرێتەوە ، گەڵای دار هەنجیر درشت‌و گەورەیە .

**هەنگ** : مێشەنگوین .

**هەنگوین** : شیرەی هەنگ .

**هەوا** : (۱) با . (۲) ئارەزوو ، مەیل ، هەوەس . (۳) ڕەنگ ، وەکو ، **هەوای ئەوی گرتووە** : وەکو ئەوی لێهاتووە .

**هەوا خواە** : پارێزەر ، لایەنگر ، دۆست ، یار ، کەسێ لایەنگری کەسێکی تر بکا .

**هەوار** : (۱) مەڵبەندو جێگەی ژیانی کۆمەڵە کەسێك ، ئەو جێیەی کە عەشیرەتە کۆچەرەکان لە هاوینان‌دا لە زۆزانان تێیدا دەژین . (۳) کۆلان ، گەڕەك ، گوند ، لادێ ، شار .

**هەودا** : کلافەی دەزوو .

**هەور** : هەڵمێکی تیرە لە ئاسمان کۆدەبێتەوە بەفرو باران‌و تەرزەی لێ پەیدا دەبێ .

**هەوراز** : بەرەوژوور ، بڵندایی .

**هەورە تریشقە** : دەنگی هەور ، گوڵە گۆلی هەور .

**هەوری** : قوماشێکی نەرم‌و ناسکی ئاوریشمی‌یە ژنان لە سەری دەپێچن یا لەچەکی دەکەن ، بڕوانە (دەسرۆکە) .

**هەورین** : سیفەتە بۆ (هەور) ، ئەو جێیەی هەوری لێبێ .

**هەوەس** : (۱) دێوانەیی ، شێتی ، شێتی‌یەتی ، کەم عەقلی ، جۆرە شێتی‌یێکە . (۲) ئارەزوو ، مەیل .

**هەوسار** : جڵەو .

**هەول (هَوْل)** : ترس ، ترس‌و لەرز .

**هەی** : ئەی ، ووشەیێکە بۆ هاندان‌و ووشیار کردنەوە بە کار دەهێنرێ ، بڕوانە ( هە ) .

**هەیاسە** : پشتێندێکە لە مەعدەن دروست دەکرێ ژنان بۆ جووانی لە پشتیان دەبەستن .

**هەیئەت (هَیْئَت)**: (۱) روخسار ، سیما ، حاڵ ، شێوە ، ئەدگار ، ڕوخسارو وەزعی هەر شتێك . (۲) پۆلێك خەڵك ، تاقمێك خەڵك .

**هەیوولا (هَیولا)** : ووشەیێکی گریکی‌یە ، (۱) مادده ، ماددەی خاو ، نەژادی هەموو شتێك ،

بنیادی هەموو شتێك ، ئەو وێنەیەی فیکر هەستی پێدەکا ، ئەو وێنەیەی لە بیرو هەستدایە . (٢) وێنە ، ڕوخسار ، ئەدگار ، پەیکەر .

**هەیبەت (هَیْبَت)** : ترسناك ، ترس و لەرز . (٢) گەورەیی و مەزنی ، شکۆو پایەبڵندی .

**هەیوان** : بڕوانە (ئەیوان) .

**هەی هەی** : ووشەیێکە بۆ سەر سوڕمان بە کار دەهێنرێ .

**هیجر (هِجْر)** : دووری ، جودا بوونەوە ، لە یەك دووركەوتنەوە .

**هیجران (هِجْران)** : دووری لە دۆست و یاران ، جودایی .

**هیجرەت (هِجْرَت)** : دوور کەوتنەوە لە نیشتمان ، کۆچ کردن لە نیشتمان و چوون بۆ جێیێکی تر ، بە جێهێشتنی مەڵبەندی خۆو لە جێیێکی تر ژیان .

**هیجرەت گوزین** : هەڵبژاردنی ئاوارەیی لە ژیاندا ، ڕازی بوون بە ئاوارەیی و دوور کەوتنەوە لە یارو دیار .

**هیچ** : (١) نەبوو . (٢) بێ هوودە . (٣) هەندێ .

**هیدایەت (هِدایَت)** : ڕێ پیشاندان ، ئاراستەی ڕێی ڕاست کردن .

**هیزە** : (١) پێستی حەیوانێکە لە مەشکە دەکا ڕۆن و دۆشاوی تێدا دەپارێزرێ . (٢) ووشەیێکە بۆ یارمەتی داوا کردن بە کار دەهێنرێ وەکو تەعبیری : « لە منت نەکەوێ !» .

**هیزوم (هِیزْم)** : دارو دەوەنی ووشکی کە بۆ سووتاندن بە کار دەهێنرێ .

**هیلال (هِلال)** : مانگی تازە ، مانگی سەرەتای مانگ تا سێ شەو کە بە شێوەی کەوان لە ئاسماندا خۆی دەنوێنێ ، کینایەتە بۆ برۆی دلبەرو لەڕولاوازیی عاشق .

**هیلالانە** : وەك مانگی یەك شەوە .

**هیلالی سەری ماه** : برۆی سەر ڕوو .

**هیلاك (هلاك)** : لە ناو چوون ، نەبوون ، مردن لە کارەساتێكدا .

**هیممەت (هِمَّت)** : بڕیارو کۆششی بەهێز ، مەبەس ، توانا .

**هیندوو (هِندو)** : هیندی ، خەڵکی هیندستان ، تیرەیێکە لە هیندستان مەزهەبی تایبەتیی خۆی هەیەو هیندووسیشیان پێ دەڵێن ، موسوڵمانانی هیندستان ، کینایەتە بۆ زولف و خەت و خاڵی ڕەشی مەعشووق .

**هیندوویی** : خاڵی ڕەش .

**هیندووس** : بڕوانە (هیندوو) .

**هیندوویی خاڵ** : خاڵی ڕەش .

**هیندوویی سەححار (هندوی سحّار)** : (١) کچی جادووگەر . (٢) چاوی ڕەشی تەلیسماوی . (٣) کەسێکی هیندیی جادووگەر .

**هێرو :** ناوی گوڵێکە ، بڕوانە ( خەتمی ) .

**هێشتا :** جارێ ، تا ئێستا ، تا ئەم کاتە .

**هێشتاکو :** بڕوانە (هێشتا) .

**هێلانە :** (١) لانە ، ماڵی باڵندەو فڕندە. (٢) خانوو ، ماڵ ، مەڵبەند.

**هێلەك :** ئالەتێکە وەکو بێژنگ وایە بەڵام کونەکانی لە هی ئەو زۆر بچووکترن بۆ جودا کردنەوەی بەشی ووردی ئاردو شتی تر لە بەشی درشتی بە کار دەهێنرێ .

**هێنان :** نزیك کردنەوەی شتێك ، هەڵگرتنی شتێكو نزیك کردنەوەی.

**هێند :** هێندە ، بەش ، کەمێك لە شت .

**هێندە :** بڕوانە (هێند) .

**هودا (هُدی) :** خودا ، ڕاستی ، ڕێی ڕاست ، ڕابەر ، ڕێ پیشاندەر .

**هودهود :** پەپووسلێمان ، پەپوولە سلێمانکە، باڵندەیێکە ڕەنگی خۆڵەمێشی‌یە خاڵی زەردو ڕەش‌و سپی‌ی هەیە ، لە کۆتر بچووکترە ، چۆپیتەیێکی وەکو تانج لە سەر سەری‌دا هەیە ، دەڵێن چاوی گەلێك تیژو دووربینە .

**هوشیار :** ووشیار ، هۆشمەند ، بەهۆش ، چالاك ، زرنگ .

**هوما :** باڵندەیێکی ئەفسانەیی‌یە، دەڵێن ئەگەر سێبەری بکەوێتە سەر هەر کەسێك بەختیارو کامەران دەبێ ، لە ئەفسانەی بەر گوێ ئاگردانی کوردەواری وا دەگێڕنەوە کە گۆیا لە ڕۆژگارانی کۆن‌دا ئەگەر پادشایێك بمردایە خەڵکی مەملەکەت هەموویان لە گۆڕەپانی شار کۆ دەبوونەوەو باڵندەی هومایان هەڵدەدا ، لە سەر هەر کەسێك بنیشتایەوە دەکرا بە پادشا .

**هووەیدا :** ئاشکرا ، دیار ، پەیدا ، ڕووناك .

**هۆردوو :** جێی لەشکر ، لەشکرگا ، جێی سوپا .

**هۆردوو هەڵدان :** نیشتەجێ بوونی سوپا ، دانانی خێوەت‌و دام‌ودەسگای لەشکر .

**هۆش :** (١) فام ، عەقل ، بیر ، هەست ، زرنگی ، زیرەکی . (٢) گیان ، ڕەوان . (٣) مەرگ . لە ناو چوون .

## ی = Y

**یا :** (١) تیپی پێوەندی‌و عەتفە ، یاخود . (٢) تیپی بانگ‌کردنە ، ئەی .

**یاخۆ :** بڕوانە ( یا ) .

**یاد :** بیر ، بیرەوەری ، هۆش .

**یار :** دلبەر ، هاوڕێ ، دۆست ، هاودەم ، مەحبووب ، مەعشووق ، یاریدەدەر .

**یاران** : کۆی (یار)ە ، بڕوانە (یار) .

**یا ڕەب !** : ئەی خودایە ! .

**یا ڕەببی !** : ئەی خودایە ، ئەی خودای من .

**یاری** : گەمە ، وازی ، گاڵتە ؛ وەرزین ، ڕابواردن ، قومار ، سەرگەرمی لە هەموو شتێکدا .

**یاسەمەن** : گوڵێکی بۆن خۆشە ڕەنگی زەرد یا شین یا سپی دەبێ ، سەمەن‌و یاسەمین‌و یاسیشی پێ دەڵێن .

**یاغی** : ووشەیێکی مەنگوڵی‌یە ، سەرکێش ، لاسار ، هەرزە ، بەرەڵڵا ، لووت بەرز ، ئەوەی هیچ فەرمانێك ناهێنێتە دی .

**یاقووت** : بەردێکی بەنرخە لە مەعدەن دروست دەکرێ ، ڕەنگی سوورو زەردو شین‌و سەوزو سپی‌ی هەیە ، یاقووتی سوور لە پاش ئەڵماس جووانترین‌و چاکترین بەردی بەنرخە ، هەرچەندە گەورەترو ڕەنگ ڕوونتر بێ گرانترە .

**یاقووتی ڕەوان** : کینایەتە بۆ فرمێسکی خوێنین‌و شەرابی سوور .

**یەتیم (یَتیم)** : بڕوانە (هەتیو) .

**یەدوڵلا (یدالله)** : دەستی خودا ، کینایەتە بۆ یارمەتی خوداو ئاگاداری کردنی خەڵك .

**یەزدان** : خودا ، ئێزەد .

**یەزدانی** : نیسبەتە بۆ (یەزدان) . بڕوانە (یەزدان) .

**یەسار (یَسار)** : (۱) چەپ ، لای چەپ ، دژی لای ڕاست . (۲) شووم‌و ناپاك . (۳) فراوانی‌و ئاسانی ، بەختیاری لە ژیاندا .

**یەشم** : بەردێکە لە عەقیق‌و زەبەرجەد دەکا ، ڕەنگی سپی‌و شین‌و سەوزی تۆخی هەیە ، یەشپیشی پێ دەڵێن .

**یەعقووب** : کوڕی ئیسحاقە ، بەناوبانگترین‌و گەورەترینی پیاو ماقووڵانی عیبرانی‌یە ، لەقەبی ئیسرائیلە ، بەنی ئیسرائیلی بردە میسرو ماوەیێك لەوێ زیندەگانی‌ی کرد ، دووازدە کوڕی هەبوو بەناوبانگترینیان یووسف بوو ، دووازدە تیرەکانی بەنی ئیسرائیل بەناوی ئەوانەوەیە ، لە قورئاندا باسی کراوە .

**یەعنی (یَعنی)** : واتا، واتە ، یانی، سیغەی تاکی نێری غایبی فیعلی ئێستایە بە مانای دەیەوێ ، وا دەزانێ ، بۆ ڕوون کردنەوەی قسە بە کار دەهێنرێ .

**یەقین (یَقین)** : بێ‌گومان ، بێ‌شك ، هەر کارێکی کە ڕوون‌و ئاشکرا بێ .

**یەك** : ژمارە « ۱ » ، یەکەم. ژمارە لە زانستی‌ی ژمارەدا .

**یەکبارە (یکبارە)** : (۱) یەك‌جار ، جارێك . (۲) لە پڕ ، لە نەکاو ، لە ناکاو ، یەکسەر .

**یەك بەر** : (۱) یەك لا ، قوماشێك یەك لابێ ، قوماشی تەسك . (۲) ئەو درەختەی جارێك بەر بدا .

**یەکتا (یکتا)** : تەنیا ، یەکانە ، تاق ، بێهاوتا ، بێوێنە ، بێنەزیر .

**یەکجاری** : دووایی ، تەواوی ، هەموو پێکەوە ، بە جارێك .

**یەگدی** : یەکتری .

**یەکسەر** : یەك جار ، هەموو پێکەوە .

**یەککە** : تاك ، تەنیا ، بێهاوتا ، بێنەزیر .

**یەککەناس** : ئەوەی یەك کەس دەناسێ ، ئەو کەرەی تەنیا خاوەنی دەناسێ یا ئەوەی ئالیکی دەداتێ .

**یەك یەك** : یەك لەدووای یەك .

**یەم** : زەریا ، دەریا ، بەحر .

**یەمین (یَمین)** : (۱) دەستی ڕاست ، لای ڕاست ، دژی چەپ . (۲) باوەڕ ، ئیمانو باوەڕ . (۳) سوێند .

**یەنبووع (یَنبوع)** : سەرچاوە ، کانی ، جۆگەلە .

**یەوم ( یَوم)** : ڕۆژ .

**یەومی نەفخی سووڕ** : ڕۆژی قیامەت ، بڕوانە (سووڕ) .

**یووسف** : (سەدەی ١٣ای پێش زایین) کوڕی یەعقووبو ناوی دایکی ڕاحێلە ، باوکی منەشێو ئەفرایمە ، ڕەمزی جووانییە لە ناو پیاواندا ، بە پێی تەوڕات براکانی فرۆشتیانە هەندێ بازرگانان ، لە پاشانا بوو بە وەزیری فیرعەونی میسرو بەڕێوەبەری ئازووقە لە برسییەتییەکەدا ، بە پێی قورئانیش براکانی خستیانە بیرێکەوە بەهۆی هەندێ کاروانچییان ڕزگاری بوو و بردیانە میسرو فرۆشتیانە پوتیفار واتە عەزیزی میسر ، زلێخای ژنی عەزیز گیرودەی یووسف بوو ، بەڵام یووسف دەستی لەگەڵدا تێکەڵ نەکرد ، لە بەر ئەوە لای مێردی بوختانی پێ کردو خرایە زیندانەوە ، لە ئەنجامدا لە زیندان دەرچوو و بوو بە وەزیری فیرعەونو یارمەتیی یەعقووبو بەنی ئیسرائیلیدا کە سینا بکەن بە مەڵبەندی زیندەگانییان .

# ديوان الشـــاعر الكردي

# نــالى

# ١٨٠٠ ــ ١٨٥٦

# و

# معجم ديــوان الشـــاعر

بحث ودراسـة وتحقيق

**الدكتور معروف خزنەدار**

اسـتاذ مسـاعد بكلية الآداب

جامعة بغداد

ان صاحب الديوان هو خضر بن احمد شاويس آلي بكي الميكائيلي الشهرزوري الملقب بـ « نالي » ، ولد في قرية « خاكو خول » بشهرزور في اصقاع السليمانية عام ١٨٠٠ م

درس المبادىء الاولية للقراءة والكتابة في مسقط راسه ، وقضى فتوته وقسما كبيرا من ايام شبابه في منطقة قرەداغ حيث تلقى العلم في مدارسها الدينية الشهيرة التي كانت تزخر بعلمائها الذين طبقت شهرتهم الآفاق ، واخيرا استقر في مدينة السليمانية الحديثة التي لم يمض على تأسيسها من قبل ابراهيم باشا عقد من الزمان .

من المرجح انه طاف اكثر المدن التي كانت تشتهر بعلمائها الاعلام وبمدارسها الدينية . ففي أيام استيلاء العثمانيين على مدينة السليمانية والقضاء على الاماره البابانية في منتصف القرن التاسع عشر ، هجر الشاعر البلاد يائسا مهموما على مصير مدينته وابناء جلدته حيث حج البيت الحرام وعاش فترة في دمشق الشام وقضى حياته الاخيرة في استانبول حيث وافاه الاجل فيها عام ١٨٥٦ .

كان الشاعر نالي من رجال الدين المتعلمين الاذكياء ولو قدر له ان يستخدم عبقريته الفذة لتطوير العلوم الاسلامية الدينية لاستطاع ان يأتي بأضافات فيها اشياء جديدة كثيرة . ولكنه حرك تلك العبقرية وذلك الذكاء لصالح الشعر الكردي حيث لم تكن اللهجة الكرمانجية الجنوبية لغة الشعر الكلاسيكى قبل الشاعر نالي ، انه هو الاول الذي اتى بأبدع الصور واجل المعاني وارفع التشبيهات واجمل الاستعارات فأصبح شعره ليس من ارقى ما قيل باللغة الكردية وانما دخل الادب الاسلامي الكلاسيكي من اوسع ابوابه . انه استمرار لارقى ما قيل من الشعر ( الغزل والقصيدة ) الذي تكون نتيجة لالتقاء حضارات الشعوب التي دخلت في الاسلام بعد انتشاره على يد الشعب العربي في الجزيرة واطرافها ثم في عالم اوسع وارحب .

يتألف الكتاب الذي بين يدى القارىء من اقسام ثلاثة :

القسم الاول عرض وتحليل وتقييم لطبعات الديوان المختلفة والنسخ المخطوطة التي توفرت لدينا ، وعلى ضوء هذه المصادر استطاع الباحث ان يحقق الديوان وان يعثر على عدد من القطع الشعرية وابيات منفردة لم تنشر سابقا .
يستعرض الباحث في هذا القسم تاريخ نشر قصائد الشاعر وما كتب عنه منذ منتصف القرن التاسع عشر والى الوقت الحاضر سواء كان في الشرق من قبل الباحثين الكرد انفسهم او في الغرب من قبل المستشرقين والمعنيين بالدراسات الكردية .

كان المستشرق الروسي القنصل خودزكو اول من تطرق الى الشاعر في سنة ١٨٥٣ حيث كان الشاعر لا يزال في الحياة ، ثم ذكره المستشرق الانكليزي سون ونشر نماذج من شعره ، اما الاختصاصي الكبير في الدراسات الكردية مينورسكي فيقول ان الحركة الادبية الكردية قد انتقلت الى السليمانية في النصف الاول من القرن التاسع عشر حيث ظهر الشاعر الكبير نالي ، والمستشرق الآخر نيكيتين يعتبره من ابرز شعراء عصره ، وتطرق جميع المستشرقين الى حياته وشعره حيث وضعوه في ارفع مكان في تاريخ الادب .

يستعرض الباحث تاريخ نشر شعره وديوانه والدراسات التي انشئت للبحث في حياته وشعره ، فيقرر ان مجلة « روژ كرد = شمس الكرد » كانت من اولى المصادر التي نشرت قسما من ديوان الشاعر عام ١٩١٣ ، وقد طبع ديوانه مرات عديدة في بغداد واربيل وسنندج الا ان تلك الطبعات ليست علمية ولا تعكس الوجه الحقيقي الناصع لشعر الشاعر . ان منزلة الشاعر جعلت الصحف الكردية ان تكون متفقة في اهمية نشر ديوانه ، ثم يذكر الباحث في هذا القسم من دراسته جميع الذين كتبوا عن نالي منذ اوائل القرن العشرين والى الوقت الحاضر .

يشير الباحث الى القصائد التي نشرت باسم الشاعر وهي في الحقيقة ليست من نتاجه ، ويثبت رايه في هذا الموضوع بدلائل علمية مقنعة ، ثم يتطرق الى القصيدة الشعرية باللغة التركية وهي مدونة في عدد من مخطوطات الديوان ، يستبعد ان تكون تلك القصيدة للشاعر ، ولا يأخذ بالراي القائل للشاعر قصيدة واحدة ايضا باللغة الفارسية ، وان انتماء القصيدة الفارسية الوحيدة الى الشاعر لا يعني بالضرورة انتماء القصيدة التركية الوحيدة اليه ايضا .

اما القسم الثاني من الكتاب فهو ديوان الشاعر ، اعتمد الباحث في تقريره النهائي للنصوص الشعرية وتثبيتها على مصادر كثيرة من طبعات الديوان والمخطوطات الفريدة التي دونت في اوقات مختلفة في النصف الثاني من القرن التاسع عشر واوائل القرن العشرين حيث يربو عدد تلك المخطوطات على العشرين ، وكذلك اعتمد على ما يحفظه المعجبون بالشاعر من شعره .

ان منهج الباحث في اختيار النص الصحيح هو اقرب تلك النصوص الى الجو الشعري للشاعر ، واما في حالة وجود اختلاف بين نص ونص آخر او نصوص اخرى فقد دون تلك النصوص في الحواشي ايضا ، وحين كان الباحث يقف عند معنيين كلاهما في اسلوب الشاعر كان يقوم بتدوين الاول في المتن والآخر في الحاشية .

اما القسم الثالث والاخير فهو معجم لديوان الشاعر ، يتناول شرح وتفسير جميع الكلمات والمفردات والمصطلحات والتعابير الشعرية التي وردت في النصوص ، ان جانبا كبيرا من تلك المفردات هي مشتركة وردت في الشعر الكلاسيكي للشعوب الاسلامية ، فالمعجم هو ليس لديوان نالي فقط ، او لديوان الشعر الكلاسيكي الكردي وانما يمكن الافادة منه حتى لتفسير جوانب مهمة في الادب الكلاسيكي للشعوب الاسلامية المختلفة هذا بالاضافة الى كونه معجما لتفسير ديوان الشعر الكلاسيكي الكردي منذ بدايته والى نهايته التي تمتد الى ما بعد الحرب العالمية الاولى .

## پاشـــەکی

ئەم کتێبە بەشێکە(۱) لەو بەرهەمەی کە لە ئەنجامی بیرکردنەوە و خـۆ خەریك کردن بە نالی‌یەوە هاتۆتە کایەوە ، ئەمە لە دەرەوە و ناوەوەی وولاتدا بووە لە سالی ۱۹٦۳ەوە تا سالی ۱۹۷۰ . دیارە مەبەسیشـــــم ژیان و وورد بوونەوەیە لە دنیای نالی ، ئەگینا ناسین و خۆشەویستی‌ی و گرفتار بوون بـە نالی دەگەڕێتەوە سەردەمی مندالیم و ناوی « نالی »م پێش چوونە حوجرەی مەلا عەبدوللای مزگەوتی ناو بازێڕی هەولێر و پێش قوتابخانەی سـەرەتایی یەکەمی هەولێر بیستووە .

لە سالی ۱۹۷۰ بەدوواوە کاتێکی دیار کراووم بۆ هێنانەدی ئەم کتێبـە تەرخان‌کرد ، بەلآم لە بەهاری سالی ۱۹۷٤ەوە تا بەهاری ۱۹۷٥ هەموو دەمو کاتێکم هەر بۆ ئەمە تەرخان کرد و لە یەکی نیسانی سالی هەزار و نۆسەد و هەفتا و پێنج لە هەموو شتێکی بوومەوە .

بێ گومان دەرچوونی ئەم کتێبە زۆر دووا کەوت ، لەگەل ئەوەشدا دەبێ ئەوە بزانرێ کە چاپی هەموو بەشەکانی ئەم کتێبە کۆتایی هاتبوو ، بە تایبەتی پێشەکی و تێکستی شیعرەکان کە چاپی « دیوانی نالی »ی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و فاتیح عەبدولکەریم و محەمەدی مەلا کەریم کـەوتە دەســـتی خۆندەوارانەوە . ئەوی ڕاستی بێ ئەوەیە ئەگەر تاقە ووشەیێکیشی چـــاپ نەکرایە و یەك دوو سالی تر ئەم چاپەم دووا خستایە ، چاپەکەی ئەوان نەدەبوو بە سەرچاوەیێك بۆ ئەم چاپە ، چونکە مەبەستی ئێمەو ئەوان لە بلآوکردنەوەی دیوانی نالی و ئوسلوبی بۆ چوونمان بۆ مەسەلەکە لە یەکتری جیاوازە . لێرەدا بە کورتی هەندێکی ڕوون دەکەمەوە :

۱ ـ من بە ئیملایێك تێکستی شیعرەکانم تۆمار کردووە دەتوانـم بلێـم ترانسکریپتی شیعرەکانی نالی‌یە بە ئەلفبایێکی زانستی لە سەر بنچینەی تیپی عەرەبی ، ئەگەر لە دووا ڕۆژدا ئیملای ستانداردی ئێستای زمانی کـــوردیش بگۆڕێ ، ئەم ئیملایەی ئێمە وەکو ئیملایێکی زانستی لە کەلك ناکەوێ ، بـەلآم ئەوان جۆرە ئیملایێکیان بەکار هێناوە ، ئەو دەسگایەی داناوە نەبێ کەسـی‌تر دانی پێدا نەهێناوە .

---

(۱) بەشەکەی تر لێکولینەوەیێکی فراوان‌و دوور و درێژە لە ڕوخســـار و ناوەرۆکی شیعری نالی ، هەروەها دیار کردنی جێگەی شاعیری مەزن لە ئەدەبی کوردی ، ڤنکە فراوانترین کتێبی کوردی بێ کە لە سەر شاعیرێك نووسرابێتەوە .

٢ ــ ئەوان دێڕ دێڕ شیعرەکانیان لێکداوەتەوە و شییان کردووە ، لەمەدا بە لای ئێمەوە دوو نهێنیی دنیای شیعری نالییان ئاشکرا کردووە ، یەکەمیان دەست نیشان کردنی ئەو ڕەمز و ئیشارەتەی بۆ ئایەتی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر لە شیعرەکاندا هاتوون ، دووەمیان پیشاندانی ئەو موحەسسەناتی لەفزییەیە کە لە شیعرەکاندا بەکار هێنراوون ، دیارە ئەم دوو لایەنەی شیعری کلاسیکی بە مەلایانی شارەزا و دەرچووانی بەشی زمانی عەرەبی لە کۆلێجەکانی ئەدەبیات و پەروەردە و هیتر یەبێ ئەرکێکی یەکجار زۆر و گران دێتە دی .

بەڵام بەلای ئێمەوە لە هەموو شتێك گرنگتر ساغ کردنەوەی تێکستی شیعری نالییە ، ئەویش نەك دەست نیشان کردنی ئەو جیاوازییانەی لە تێکستی دەسنووس و دیوانە چاپ کراوەکاندا هەیە ، چونکە زوربەی جیاوازییەکان هەڵەی نووسینەوەی ناشارەزاییانەی ئەو خەڵکە نیمچە خوێندەوارەیە کە دەسنووسەکانیان ڕوونووس کردووە . ئەوجا پێویستە بایەخ بە فەرهەنگی نالی بدرێ . بۆیە ئێمە ئەم ڕێگەیەمان گرتە بەر ، ڕاستە ئەم فەرهەنگە بە تەواوی نالی ڕوون ناکاتەوە ، بەڵام ئەوەندە هەیە هەموو ووشەیێکی تێکستی نالی ڕوون دەکاتەوە ، نەك تەنیا ئەو مانایانەی نالی مەبەسیەتی بەڵکو هەموو ماناکانی تریش ، ئیتر پێویستە خوێندەوار شارەزایی و زانایی خۆی بەکار بهێنێ بۆ تێگەیشتنی شیعرەکە ، ئەمە پلەیێکی گرنگە و کەمتر تەنگو چەڵەمە دروست دەکا و دەبێ پێش لێکدانەوە و شی کردنەوە و شەرح کردن بکەوێ .

٣ ــ بەراووردێك لە نێوان سەرچاوەی ئێمەو ئەوان ئەوە دەردەخا کە سەرچاوەکانی ئێمە زۆرتر و دەوڵەمەندترن بە بەڵگەی ئەوەی هەموو شیعرە ڕاستەقینەکانی نالی[١] ئەوەی لە چاپی ئەواندا هەیە لە چاپی ئێمەش هەن[٢] ، سەرەڕای ئەوانیش گەلێ‌دێڕە شیعری وا لە چاپەکەی ئێمەدا هەیە ، لای ئەوان نییە .

---

(١) ئەو شیعر و دێڕە شیعرانەی لە چاپی ئەواندا هەیە و لای ئێمە نییە بە شیعری نالی نازانین .

(٢) کەڵکێکی زۆر لەو دوو دەسنوسە نایابەی کە لە ئەوروپا پارێزراوون وەرگیرا ، لەکاتی چاپکردنی ئەم کتێبە کۆپیەی دەسنووسەکان پێمان گەیشت ، سوپاسیش بۆ ئەو کەسەی نایەوێ ناوی بهێنرێ .

ئەمەو دنیای نالی ئەوەندە فراوانە ، ئەوەندە قوولە ، ئەوەندە جووانە ، هەر « نالی ناسێك » یا « نالی زانێك » یا « نالی پەرستێك » ، سەد قسە لە نالی‌یەوە بكا و تەنیا قسەیێكی ڕاست‌بێ ، بەلای ئێمەوە دۆزینەوە و داهێنان و ئاشكرا كردنی نهێنی‌یێكە لە دنیا بێ پایانەكەی نالی .

پێش كۆتایی هێنان بەم « نالی »یەم ، پێویستە سوپاسی قوتابی‌ی ماوەیێك لەمەوبەرم و كارگەری ئێستای دەسگای بلاوكردنەوە و ڕۆشنبیری كوردی كاك ئەكرەم مەحموود سەمین بكەم ، بۆ هەموو ئەو ئەركانەی لە دلسۆزی‌یەوە خەرجی‌كرد بۆ لە چاپدانی ئەم كتێبە .

**مارف خەزنەدار**

# ناوەرۆکی دیوانی نالی

## بە پێی قافیەی شیعر


| نیوە دێری شیعر ( غەزەل ) | لاپــەڕە |
|---|---|
| **ـ أ ـ** | |
| ریشـەکەی پانو درێژە بووریا خزمەت دەکا | ٤٣ |
| تا تایی ســـەری توورەیی پڕ پێچشــی بادا | ٤٤ |
| ئەســـتێرە هەموو مەحوە لە نێو نووری قەمەردا | ٤٥ |
| جۆششی تاوە لە نێو دیدەیی گریانمدا | ٤٦ |
| گـەر بێیە دەرێ سەروی ڕەوانی لە ئیرەمدا | ٤٧ |
| تەبەسسوم دەردەخا حوققەی دەمی جەوهەر لە نێو ئەودا | ٤٧ |
| ئەی جیلوە دەری حوسنو جلـەوکێشی تەماشا | ٤٨ |
| یا بَدْرُ عَلُوّاً وضیاءً وکمالا | ٤٩ |
| حیرەت زەدە وا دیدە وەکو حەلقەیی دەرما | ٥٠ |
| جەنانی وەك جینان کـردم بە مەئوا | ٥١ |
| پێچەیی پەرچەمیو پرچی ســـیا | ٥١ |
| تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا | ٥٢ |
| ئەحوەلی تەفریقە نەزەر تەقوییەتی سەبەب دەکا | ٥٣ |
| پێم دەڵێن مەحبووبە خێڵو قیچە مەیلی شەڕدەکا | ٥٤ |
| چـاوەکەت ئاگـر لە ســـینەی عاشـــقی مســـکین دەکا | ٥٤ |
| بلبلی تەبعـم ئەوا دیســان سەنا خـوانی دەکا | ٥٥ |
| **ـ ب ـ** | |
| زولفـەینی بەخـەم مارو بـە حەلقەن وەکو عەقرەب | ٥٦ |
| **ـ ت ـ** | |
| مووی سـپی کردم بە شـــوشتن ئاوی عەینی شۆرەشەت | ٥٧ |
| چاووت لـە برۆ یەعنی لە ژێر تاقی نەزارەت | ٥٨ |
| مەکـە ئیخلافی ئـەو وەعدەی کـە فەرمووت | ٥٩ |
| ئەی سـەروی بڵند قەددو برۆ تـاقو مەمك جـووت | ٦٠ |
| **ـ ح ـ** | |
| ســـاقی وەرە ڕەنگن کە بە پەنجە لەبی ئەقـداح | ٦٠ |

| نیوە دێڕی شیعر ( غەزەل ) | لاپــەڕە |
|---|---|
| **ـ د ـ** | |
| ابروان تـو طبیبــان دل افکاراند | ٦١ |
| **ـ ر ـ** | |
| ئیلتیقــای پۆلادو ئاســن هەر نیزاعەو گیرودار | ٦٢ |
| **ـ ز ـ** | |
| خـــاو و بێ خاوی دوو زولفی خــاووم ئەز | ٦٣ |
| **ـ ژ ـ** | |
| هەی کەرێکم بوو چ پەیکەر تەی کەری هەورازو لێژ | ٦٤ |
| **ـ س ـ** | |
| کــە تۆ هــاتی لــە نەومێدی نەمــا باس | ٦٥ |
| لــە کــن ئــەو جەوهەرە فەردە لە هەیوولا نی‌یە باس | ٦٦ |
| عــومری بێ حاســـیلی من چوو بە عەبەس | ٦٧ |
| ســـابوونی کەفقی پێتە کەفی زاری چاپلووس | ٦٧ |
| **ـ ق ـ** | |
| قوربــان مەحــالە پێکەوە بێ سەبرو ئیشتیاق | ٦٨ |
| چی‌یە گوارە گوناهی وا بــە نەستەق | ٦٩ |
| **ـ ك ـ** | |
| ئەی شۆخی بێ نیازو گران نازو غەمزە سووك | ٧٠ |
| **ـ م ـ** | |
| بە زســـتان دڵ شکستەی بەردو ســـەرمام | ٧١ |
| ( فاتیحە ! ) تەسخیرە شاری دڵ بە تابووری ئەلەم | ٧٢ |
| دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خـۆشە جەوابی نادەم | ٧٢ |
| وەی کە ڕوو زەردی مەدینەو ڕوو سیاهی مەککە خۆم | ٧٣ |
| گەر دەپرسی من لەبەر چی کەم دەخـۆم | ٧٤ |
| لەبت میمو قــەدت ئەلفو زولف چیم | ٧٥ |
| حەنایی کردووە پەنجەی بەخوێناوی دڵی زام | ٧٥ |

| نیوە دێڕی شیعر ( غەزەل ) | لاپەڕە |
| --- | --- |
| دەورانی‌یە وەك هێلەکی سەودا سەری گێژم | ٧٦ |
| عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم | ٧٧ |
| شەو هات‌و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم | ٧٧ |
| لایقی مەخزەنی تەبعە هەموو کەنزی غەزەلم | ٧٨ |
| **ـ ن ـ** | |
| کە تۆ قیبلەی دەمت سا بێنە قوربان | ٧٩ |
| لە دوگەی سینە دۆنی نۆژی شێوان | ٧٩ |
| ئەهلی تەعدادو موحاسیب نووسیان | ٨٠ |
| ڕەقیب‌و موددەعی فیتنەو عەلاقەی چاوی جادووتن | ٨١ |
| خەندەی دەمی مەحبووبە کەوا زۆر نەمەکینن | ٨٢ |
| ئەم سەرسەری بازانە کە وا هەمسەری بوومن | ٨٢ |
| دووری لە من خستەوە ، بێ سەبەبی یاری من | ٨٣ |
| ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسەی شاهن | ٨٤ |
| شکافێکی کلاَفەی زولفی موشکین | ٨٥ |
| خەتات فەرموو کە خۆشە چین‌و ماچین | ٨٦ |
| **ـ وو ـ** | |
| هەر چەندە کە عومری خدرو جامی جەمت بوو | ٨٧ |
| تا فەلەك دەورەی نەدا سەد کەوکەبی ئاوا نەبوو | ٨٨ |
| دڵ شیشەیی پڕ خۆنە فیراقی فەرەقی بوو | ٨٩ |
| **ـ ۆ ـ** | |
| زولفت کە لە سەر ڕوو بە خەم‌و تابشە ئەمڕۆ | ٨٩ |
| دەروونم پڕ کەباب‌و دەردە بێ تۆ | ٩٠ |
| ئەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ | ٩١ |
| **ـ ە ـ** | |
| ساقی بە مەیی کوهنە لە سەر عادەتی نەوبە | ٩٢ |
| خاڵی بەینی چاو و ئەبرۆت ئینتیخابی کاتیبە | ٩٢ |
| دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە | ٩٣ |
| لە دڵدا ئاتەشی عیشقت بلێسەی میسلی تەندوورە | ٩٤ |
| وەسفی ڕۆخساری لە فیکری بەنی ئادەم بە دەرە | ٩٥ |
| سارایای گوارە زەردی ترس‌و لەرزە | ٩٦ |
| حەلقە دەرگوشی کەفی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە | ٩٦ |

| نیوە دێڕی شیعر ( غەزەل ) | لاپـــەڕە |
|---|---|

| کەوا زەرتاری یەکتایی دەڵێی خورشیدی ئافاقە | ٩٧ |
| بە مـــەرگی تۆ قەسەم زاهیـــد هەموو عومرت عوبووریکە | ٩٨ |
| ســــەری هەر مووی بە دەنم تەرزە تەمەنناییکە | ٩٨ |
| شاهێنی دوو چاووت کە نیگاو مەیلی بە دانگـــە | ٩٩ |
| بنوارە ووشکە سۆفی و ڕەقسی بە هەلهەلە | ١٠٠ |
| شکەنجی عەرزو توولی پێچی زولفت بێ سەرەنجامە | ١٠٠ |
| سەوداسەرەکەی زولفت ، ئەزهاری لە کن پەشمە | ١٠١ |
| بایێ لە تەرەف قیبلەمەوە دێتو وەزانە | ١٠٢ |
| سرێشکی من کە لێلاوی غوباری کێو و هاموونە | ١٠٣ |
| دڵ سیەهـ سەنگ نەبێ مایلی خاکی وەتەنە | ١٠٣ |
| لـــەو وەختەوە بیستوومە ، دیتن بە قەدەر چاوە | ١٠٤ |
| زولفت بە قەددتدا کە پەرێشانو بڵاوە | ١٠٤ |
| ئەو سیسیلە وا موشکی خەتا ناوی براوە | ١٠٥ |
| تا لە مـــن ئەو زولفە ڕێی بۆسو کەناری گرتووە | ١٠٦ |
| گولبونی قەددت لە قوبەی سینە غونچەی کردووە | ١٠٨ |
| گەرمیو تەڕی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە | ١٠٨ |
| موشەخخەس لە شکری خەتتی لە سەر تەسخیری باڵایە | ١١٠ |
| سەرمایەیی سەودا کە دەڵێن زولفی دووتایە | ١١١ |
| بیستم لە هەموو لایە ، مەیلی شەڕو دەعوایە | ١١٢ |
| سەری زولفت کە ڕشتەی عومری خدری نیوە هەودایە | ١١٢ |
| ئەڵڵا ئەڵڵا کە چ عەقڵو چ کەماڵێکی هەیە | ١١٣ |
| عاشقی بێ دڵ دەناڵێ مەیلی گریانی هەیـــە | ١١٤ |
| بەرگی دونیا هێندە کورتو کۆتەهـ و بازاڕییە | ١١٥ |
| بیـــدی مەجنوونە ووجوودم لە هەموو بەر بەرییە | ١١٦ |
| لەو کەسەی دینی ئەتۆ نووری دڵو ئیمانییە | ١١٧ |
| ئاخ لە گەڵ ئێمە ( حەبیبە ) سەری پەیوەندی نییە | ١١٧ |


**ـ ی ـ**


| | |
|---|---|
| ئەی قەلعەیی ماهم کە دەڵێی ئەوجی بورووجی | ١١٨ |
| گەر بازی نەزەر بازی ، لەم ڕاو و شکارەت چی | ١١٩ |
| ئەی خەستەیی چاووت هەموو ئاهوویی تەتاری | ١٢٠ |
| ساقی وەرە مەیخانە کە تۆ کۆنە ڕفیقی | ١٢١ |
| بەریقەلبەسەڕ لە بـــەرقی تەلەئلوئی لەئالی | ١٢١ |

نیوه دێڕی شیعر ( غەزەل ـ قەسیدە ـ موستەزاد ) — لاپــەڕە


بنوارە ئەو بەهــارو فوتووحاتی گوڵشــەنی ١٢٢
موساوی وەك یەكو لوولن لە هەردوو لاوە زولفەینی ١٢٣
گوڵ كە باغیو دەم دڕاو بوو كەوتە لافی ڕەنگو بۆی ١٢٤
وەرە ساقی بەشینی مەزهەبی دەی ١٢٥
بیحەمدیللا دوو چاوی یارم ئۆخخەی ١٢٦
دەروونی لیداریلشارەزووری وە بەردیهی ١٢٧

ـ ێ ـ

حەریقی زیقی هیجرانم نەسیمی سوبحدەم با بێ ١٢٩
خوشا ڕەندێ لە دونیا بێ موبالاتو موجەررەد بێ ١٣٠
لە چاوی ڕوودبارم نووری دیتن وەقتە جاری بێ ١٣٠
بۆچۆێ بوونەوە بۆ زەخمو نیشانەی ئەسەرێ ١٣١
تەشریفی ئەو بەهارە كە عالەم دەكا نوێ ١٣٢
یــار دڵی خوێنینو چاوی پڕ لە گریانی دەوێ ١٣٣
خاڵی نییە ڕەشماری دوو زولفت لە بەڵایێ ١٣٤

( قەسیدە )

ماتم وەكو زولفەینی سیەهـ گرتی سەراپات ١٣٥
عیشقت كە مەجازی بێ خواهش مەكە ئیللا كچ ١٣٧
شەوی بەهاری جەوانی خەوێ بوو پڕ تەشویر ١٣٨
قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مورروور ١٤٠
وەك قەفەس ئەم حوجرە كون تێیە كە وا گرتوومیە نــاو ١٤٥
ئەی ساكینی ڕیازی مەدینەی مونەووەرە ١٤٧
ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتا كەی حیرسی وێرانە ١٥٣
قەدری من چەندە لە لای دەوڵەتی دونیایی دەنی ١٥٩
نەفەس بگرە لە هاتو چوونی خۆڕایی هەتا ماوی ١٦٠
مەستوورە كە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ ١٦٢

( موستەزاد )

ئەی تازە جەوان پیرم و ئوفتادە وو كەوتووم ١٦٨

# ناوەرۆکی دیوانی نالی

## بە پێی دێڕی یەکەمی شیعر


| نیوە دێڕی شیعر ( غەزەل ) | لاپەڕە |
|---|---|
| — ئ — | |
| ئاخ لەگەڵ ئێمە ( حەبیبە ) سەری پەیوەندی نی‌یە | ١١٧ |
| ابروان تـو طبیبان دل افکارانند | ٦١ |
| ئەحوەلی تەفریقە نەزەر تەقویەتی سەبەب دەکا | ٥٣ |
| ئەستێرە هەموو مەحوە لە نێو نووری قەمەردا | ٤٥ |
| ئەڵڵا ئەڵڵا کە چ‌عەقڵ‌و چ‌کەمالێکی هەیە | ١١٣ |
| ئەم تاقمە مومتازە کە وا خاسـەی شاهـن | ٨٤ |
| ئەم سەرسەری بازانە کە وا هەمسەری بوومن | ٨٢ |
| ئەو سیسیلە وا موشکی خەتا ناوی براوە | ١٠٥ |
| ئەهلی تەعدادو موحاسیب نووسیان | ٨٠ |
| ئەی جیلوە دەری حوسن‌و جلەوکێشی تەماشا | ٤٨ |
| ئەی خەستەیی چاووت هەموو ئاهوویی تەتاری | ١٢٠ |
| ئەی سەروی بڵند قەدد و برۆ تاق‌و مەمك جووت | ٦٠ |
| ئەی شۆخی بێ نیازو گران نازو غەمزە سووك | ٧٠ |
| ئەی قەلعەیی ماهم کە دەڵێی ئەوجی بورووجی | ١١٨ |
| ئیلتیقای پۆلادو ئاسن هەر نیزاعەو گیرودار | ٦٢ |
| — ب — | |
| بایێ لە تەرەف قیبلەمەوە دێت‌و وەزانە | ١٠٢ |
| بەریقەلبەسەرِ لە بەرقی تەلەئلوئی لەئالی | ١٢١ |
| بەرگی دونیا هێندە کورت کۆتەهو بازاڕی‌یە | ١١٥ |
| بە زستان دڵ شکستەی بەردو سەرمام | ٧١ |
| بەمەرگی تۆ قەسەم زاهید هەموو عومرت عوبووریکە | ٩٨ |
| بیدی مەجنوونە ووجوودم لە هەموو بەر بەری‌یە | ١١٦ |
| بیستم لە هەموو لایە ، مەیلی شەڕو دەعوایە | ١١٢ |
| بیحەمدیللا دووچاوی یارم ئۆخخەی | ١٢٦ |
| بۆجوێ بوونەوە بۆ زەخم و نیشانەی ئەسەرێ | ١٣١ |
| بلبلی تەبعم ئەوا دیسان سەنا خوانی دەکا | ٥٥ |
| بنواڕە نەو بەهارو فوتووحاتی گوڵشـەنی | ١٢٢ |
| بنواڕە ووشکە سۆفی‌و ڕەقسی بە هەلهەلە | ١٠٠ |

**- پ -**

| | |
| --- | --- |
| پێچەی پەچەمی‌یو پرچی ســـیا | ٥١ |
| پێم دەڵێن مەحبووبە خێڵو قیچە مەیلی شەڕ دەکا | ٥٤ |

**- ت -**

| | |
| --- | --- |
| تاتایی سەری توررەیی پڕ پێچشی بادا | ٤٤ |
| تا فەلەك دەورەی نەدا سەد كەوكەبی ئاوا نەبوو | ٨٨ |
| تا لە من ئەو زولفە ڕێی بۆسی‌و کەناری گرتووە | ١٠٦ |
| تەبەسسوم دەردەخا حوققەی دەمی جەوهەر لە نێو ئەودا | ٤٧ |
| تەبعی شەککەر باری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا | ٥٢ |
| تەشریفی ئەو بەهارە کە عالەم دەکا نوێ | ١٣٢ |

**- ج -**

| | |
| --- | --- |
| جەنانی وەك جینان‌کردم بە مەئوا | ٥١ |
| جۆششی تاوە لە نێو دیدەیی گریانم‌دا | ٤٦ |

**- چ -**

| | |
| --- | --- |
| چاوەکەت ئاگر لە سینەی عاشقی مسکین دەکا | ٥٤ |
| چاووت لە برۆ یەعنی لە ژێر تاقی نەزارەت | ٥٨ |
| چی‌یە گوارە گوناهی وا بە نەستەق | ٦٩ |

**- ح -**

| | |
| --- | --- |
| حەریقی زیقی هیجرانم نەسیمی سوبحدەم با بێ | ١٢٩ |
| حەلقە دەرگووشی کەفی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە | ٩٦ |
| حەنایی کردووە پەنجەی بە خۆناوی دڵێ زارم | ٧٥ |
| حیرەت زەدە وا دیدە وەکو حەلقەیی دەرما | ٥٠ |

**- خ -**

| | |
| --- | --- |
| خاڵی بەینی چاو و ئەبرۆت ئینتیخابی کاتیبە | ٩٢ |
| خاڵی نی‌یە ڕەشماری دوو زولفت لە بەڵایی | ١٣٤ |
| خاو و بێ خاوی دوو زوولفی خاووم ئەز | ٦٣ |
| خەتات فەرموو کە خۆشە چین‌و ماچینی | ٨٦ |

| نیوه دێڕی شیعر ( غەزەل ) | لاپەڕە |
| --- | --- |
| خەندەی دەمی مەحبووبە کە وا زۆر نەمەکین | ٨٢ |
| خوشا ڕەندێ لە دونیا بێ موبالاتو موجەررەدبێ | ١٣٠ |
| **— د —** | |
| دەروونی لیداریلشار‌ىزووری وە بەردیهی | ١٢٧ |
| دەروونم پڕ کەبابو دەردە بێ تۆ | ٩٠ |
| دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە ! | ٩٣ |
| دەورانی‌یە وەك هێلەکی سەودا سەری گێژم | ٧٦ |
| دووری لە من خستەوە بێ سەبەبی یاری مـن | ٨٣ |
| دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە جەوابی نادەم | ٧٢ |
| دڵ سیەهـ سەنگ نەبێ مایلی خاکی وەتەنە | ١٠٣ |
| دڵ شیشەیی پڕ خوێنە فیراقی فەرەقی بوو | ٨٩ |
| **— ڕ —** | |
| ڕەقیبو موددەعی فیتنەو عەلاقەی چاوی جادووتن | ٨١ |
| ڕیشەکەی پانودرێژە بووریا خزمەت دەکا | ٤٣ |
| **— ز —** | |
| زولفەینی بە خەم مار و بە حەلقەن وەکو عەقرەب | ٥٦ |
| زولفت بە قەدتدا کە پەیشانو بڵاوە | ١٠٤ |
| زولفت کە لە سەر ڕوو بەخەمو تابشە ئەمڕۆ | ٨٩ |
| **— س —** | |
| سابوونی کەفی پێتە کەفی زاری چاپلووس | ٦٧ |
| ساقی بە مەیی کوهنە لە سەر عادەتی نەوبە | ٩٢ |
| ساقی وەرە ڕەنگن کە بە پەنجە لەبی ئەقداح | ٦٠ |
| ساقی وەرە مەیخانە کە تۆ کۆنە ڕەفیقی | ١٢١ |
| سەراپای گوارە زەردی ترسو لەرزە | ٩٦ |
| سەری زولفت کە ڕشتەی عومری خدری نیوە هەودایە | ١١٢ |
| سەری هەر مووی بەدەنم تەرزە تەمەننایێکە | ٩٨ |
| سەرمایەیی سەودا کە دەڵێن زولفی دووتایە | ١١١ |
| سەودا سەرەکەی زولفت ، ئەزهاری لە کن پەشمە | ١٠١ |
| سریشکی من کە لێڵاوی غوباری کێو و هاموونە | ١٠٣ |

| نیوه دێڕی شیعر ( غەزەل ـ قەسیدە ) | لاپەڕە |
| --- | --- |
| له چاوی ڕوودبارم‌نووری دیتن وەقتە جاری‌بێ | ١٣٠ |
| له دوگمەی سینه دۆنێ نۆژی شێوان | ٧٩ |
| له دڵدا ئاتەشی عیشقت بڵێسەی میسلی تەندووره | ٩٤ |
| لەو کەسەی دینی ئەتۆ نووری دڵو ئیمانی‌یه | ١١٧ |
| له کن ئەو جەوهەره فەرده له هەیوولا نی‌یه باس | ٦٦ |
| لەو وەختەوە بیستوومه ، دیتن بە قەدەر چاوه | ١٠٤ |
| **ـ م ـ** | |
| مەکە ئیخلافی ئەو وەعدەی که فەرمووت | ٥٩ |
| موساوی وەك یەکو لوولن له هەر دوو لاوه زولفەینی | ١٢٣ |
| موشەخخەس لەشکری خەتتی لەسەر تەسخیری باڵایه | ١١٠ |
| مووی سپی کردم بە شوشتن ئاوی عەینی شۆرەشەت | ٥٧ |
| **ـ ن ـ** | |
| نەمردم من ئەگەر ئەمجاره بێ تۆ | ٩١ |
| **ـ و ـ** | |
| وەره ساقی بە شینی مەزهەبی دەی | ١٢٥ |
| وەسفی ڕوخساری له فیکری بەنی ئادەم بەدەره | ٩٥ |
| وەی که ڕوو زەردی مەدینەو ڕوو سیاهی مەککە خۆم | ٧٣ |
| **ـ هـ ـ** | |
| هەر چەندە که عومری خدرو جامی جەمت بوو | ٨٧ |
| هەی کەرێکم بوو چ پەیکەر تەی کەری هەورازو لێژ | ٦٤ |
| **ـ ی ـ** | |
| یابَدرُ ! علوًّا وضیاءً وکمالا | ٤٩ |
| یار دڵی خوێنین و چاوی پڕ له گریانی دەوێ | ١٣٣ |
| **( قەسیدە )** | |
| ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتا کەی حیرسی وێرانه | ١٥٣ |
| ئەی ساکینی ڕیازی مەدینەی مونەووەره | ١٤٧ |
| شەوی بەهاری جەوانی خەوێ بوو پڕ تەشویر | ١٣٨ |
| عیشقت که مەجازی بێ خواهش مەکە ئیللا کچ | ١٣٧ |

| نیوه دێڕی شیعر ( قه سیده ـ موسته زاد ) | لاپەڕە |
|---|---|
| قەدری من چەندە لەلای دەولەتی دونیایی دەنی | ١٥٩ |
| قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش موروور | ١٤٠ |
| ماتم وەکو زولفەینی سیەه گرتی سەراپات | ١٣٥ |
| مەستوورە کە حەسناو و ئەدیبە بە حیسابێ | ١٦٢ |
| نەفەس بگرە لە هاتو چوونی خۆڕایی هەتا ماوی | ١٦٠ |
| وەك قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کە وا گرتوومیە ناو | ١٤٥ |
| **( موستەزاد )** | |
| ئەی تازە جەوان پیرمو نوفتا دەو و کەوتووم | ١٦٨ |

# ناوەرۆك

لاپـــەرە


| | |
|---|---|
| نالی ۱۸۰۰ ــ ۱۸۵٦ . . . . . . . . . . . | ۳ |
| پێشـــەکی . . . . . . . . . . . | ٤ |
| مێژووی بڵاوکردنەوەی شیعری نالی . . . . . . . . . . . | ٥ |
| نالیو شیعری لە لای خۆمانو لە ڕۆژهەڵاتدا | ۹ |
| نالیو شـــیعری لە ڕۆژئاوادا . . . . . . . . . . | ۱٥ |
| دیوانی دەسنووسو بەیازو دەفتەری شـــیعری کۆن و دیوانی چاپ کراوی نالی بنچی ئەم چاپەن . . . . . . . . | ۱۹ |
| ئەو شیعرانەی هی نالی نین . . . . . . . . . . . | ۲۱ |
| شیعرێکی تورکی بە ناوی نالیەوە تۆمارکراوە . . . | ۲۲ |
| بەرنامە بۆ تێگەیشتنی نالی . . . . . . . . . . . | ۲٤ |
| فەرهەنگی دیوانی نالـــی . . . . . . . . . . . . . | ۲٥ |
| دووا ووشـــــە . . . . . . . . . . . . . . . . . | ۲۷ |
| دیوانی نالـــی . . . . . . . . . . . . . . . | ۲۹ |
| فەرهەنگی دیوانــی نـــالی . . . . . . . . . . . . . . | ۱۷۱ |
| ناوەرۆکی دیوانی نالی بەپێی قافیەی شیعر . . . . . . . . . | ٤۱۱ |
| ناوەرۆکی دیوانی نالی بە پێی دێڕی یەکەمی شیعر . . . . . | ٤۱٦ |



رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد
۱۰۰۹ لسـنة ۱۹۷۷

دار الحرية للطباعة بغداد ۱۳۹۷هـ ــ ۱۹۷۷م

